## شیعر



## گفتووگۆ





## چیرۆک



# پیانۆیەك لە دەنگی تۆ

ئارام کاکەی فەلاح
ئەپریلی ٢٠١٤

من یارەکەم وایە
پەپوولەکان لە دوورەوە دەیبینن و پێیان سەیرە
پەپوولە هەیە و نافڕێ.

مۆسیقا دەزانێ هەر کاتێك پێی نەما
دێت و نۆتەی تازە لە تۆ وەردەگرێت.

هەموو بەیانییەك هەتاو
پێش ئەوەی لە پەنجەرەکەوە بێتە ژوورەوە
سەیر دەکا
گەر تۆ لەوێ بی، دەزانێت
پێویست ناکا بێت.

دڵۆپە بارانەکان کە تۆ دەبینن
پێیان سەیرە
بارانی تر هەیە و لەوان ناچێت.



ئەستێرەکان لە دوورەوە دەتبینن و
لایان سەیرە وا بە ئاسانی
لەمەداری ئەوان چوویتە دەرەوە و
هیچ ئەستێرەناسێکیش پێی نازانێت.



وەرە ئەی یار!
من غەمێك لە تۆ دادەتاشم
تۆش نائومێدییەك لە ئێسكی من
من گڵۆپێك، مۆمێك، ئەستێرەیەك لە چاوانی تۆ دروست دەكەم
تۆش دارستانێك، بیابانێك، ئاسمانێك لە تەنیایی من
من كانییەك، لافاوێك، بارانێك لە فرمێسكی تۆ دەكەمەوە
تۆش ئاوێنەیەك، پایزێك، پشكۆیەك لە خەیاڵی من
من لە پێكەنینت، نازت، ماچەكانت، باخچەیەك دەكەمەوە
تۆش بیكەرەوە دەرگایەكی بەهەشت لە دۆزەخی من.
من پیانۆیەك لە دەنگی تۆ دروست دەكەم
تۆش تەپڵێك لە دڵی من.

بیبە بۆ ڕەنگی كراسەكەت لە شەوەكانم.. ڕەنگی ڕەش
بێنە بۆ ڕەنگی برینم لە لێوی ئاڵت.. ڕەنگی مۆر.



# دۆخەکان

سەباح ڕەنجدەر

## 1

تاووسێکی بەرچاوڕوون لەسەر دیواری بەندیخانەدا\ هێلانەی شکۆ و بەخشندەیی چێ کردووە\ لە پێخەفی چاوی بەندییەکانیش دەنوێ\ بەندییەکان پێیان خاو و نەرم\ دەماری دڵیان توند و گەرم و کاسەی سەریان پوورەهەنگ \نیازی دەموچاویشیان ئاشکرا و درەوشاوە و درێژە بەژیاندان\ ئەم تاووس و هێلانەیە بۆیان بووەتە\ ئاشنایی و ڕۆشنایی\ خامۆشی و فەرامۆشی\ واژە و ئاماژە\




زەوی و زەری\ چووم دەست بۆ گەنجینەی هێلکەکان ببەم\ دڕکم لە پێی ڕاچووا\ دڕکی زامی نازی ئەشق و خەمڵینی بێپەروایی\
ئەشق دژایەتیی ئاشق دەکات و ئەم دەخاتە جێگای ئەوا\ بە حەپەساویش بە چواردەوری مەرگ ڕادەوەستێت\ دڵ لە قەپێلکی هێلکەشدا دەڕسکێ و دەبێتە جەنگەی بەهار\ شێوەکارێکی ئاسۆ پڕ تانوپۆ و دەموچاوڕوون بە ئاشکرایی بەهەشت\ تابلۆی هێلکەکانی لە چرکەیترووکاندا کێشا\ بەندییەکان دوای  ئەوەی لەو چاڵە ڕەشە هاتنە دەرێ و مەستبوون بەا\ نەوا و ئەنوای بوون و نەبوون\ تابلۆکەیان کڕی\ بە نیازی کتێبی ڕێنوێنی لە نزیك دڵیان هەڵیانواسی\ پڕ نابێتەوە لە هەست و یادەوەرییەکانیان\
ئاوازی تاووس لە سەرەتای هێلکەترووکان\ دەستی کە بۆنی چیلکە و پووشی هێلانەی تێکەڵاون بە سەریاندا دەهێنێت\ تا ئەبەد ژیان لە ناو ئاوازدا بەسەر دەبەن\ دەشکرێت گوێ لە دەنگێك لە بوون و دەنگێك\ لە نەبوون ڕابگرن و بە ئاوازێك ڕازی بن\
ئاواز باس لە شوێنێکی پارێزراو دەکات\ تێیدا تەماشای هەناوی ئاو دەکەین\ئاویش لەبەر خاتری ئێمەیە نامرێت\
بە گەرمیی دڵی دەمانژیێنێت\ لە جۆشی ئێمەش پڕ ڕەنگە\ تاووس لە بۆشاییدا دەگری ڕەنگی ئەشق دادەڕێژێ\ تاووس لە بۆشاییدا دەگەڕێ ڕەنگی دڵ دادەڕێژێ\ لەسەر جەستەی ئەشق و دڵیش ڕەنگی بێداری دەڕوێ\ دڵخۆش بە من شکۆی تۆم لە ئەشق و دڵ هەڵگرتووەا

2

ئەی ئاواز لە ڕووی فرمێسکە سارد و گەرمەکانم دامەمێنە\ چاوی جیهان کە لە مندا دەبێتە دڵ\ سەرەتای هەفتە بە ئەستێرەی بچوێنە\ کۆتایی هەفتەش بە مانگ\ لە بەراورددا چاوەڕوانم شتە زیندووەکانم لێ نزیك بن\ ئەستێرە و مانگ و نان و ئومێد و مەی و نزا و بانگکردن\خاوەن هەموو ڕوخسارێکن\ دەفتەری مەشق لە باوەش دەگرن و خوێنگەرمیی دەدەنێ\ شەو و ڕۆژ لە ئەوینی مندا یەکتریان ناسی و کاتیان دابەش کردا وەك دوو خوشك و برای لە خوێنی پشت گەیشتوو و چاوەڕوانی بەردەوامیما

تاهەتایە دەسووڕێنەوە و فرمێسکە سارد و گەرمەکانم دەپارێزن\ منی زۆر بەسەر خۆدا زاڵ هەست دەکەم هیچ شتێك دوایی نەهاتووە\
دەموچاوی ساکاری عەرد و ئاسمان\ تاخودا دەڵێ بەس سپین\ پەڕەی وەفا و نمەکیان لە خۆ پێچاوە و لە نۆتەی ئاوازدا پشوو دەدەن\
هەوڵ دەدەم سەرنجی دەموچاوی ساکاریان بدەم و بیانناسم\ پاشان ئارام و هێمن لە هەتاودا مەلە بکەم و لەگەڵیاندا بژیم\

**3**

دێوەزمەی چرا کوژاوە\ خۆی لە ماڵی ئێسك و پرووسکدا دەشارێتەوە و زمانی هەموو ئێستاکان دەزانێت\ دەشیەوێت بە زیندوویی بمانخوات\ تاووسەوان پەڕی تاووسەکانی شووشت و ڕۆیشت تا ئەو شوێنە ڕۆیشت\ هێلکە تێیدا وەك زێڕ دەبریسکێتەوە و دەبێتە سرووشی فەرموودە\ دەچێتە سەر قەڵای هێلکەکانی و تەماشای ژیان دەکات\ پاش دەستبازی و چاوبازی لەگەڵ ژیان\ وەك ئەوەی خوناو بێت لە ناوچاوی ڕوونبووەوەی گوڵێك\ دەچێتە بەر خۆری گیانبازی\ دەڕوات تا ئەو شوێنە دەڕوات\ خودا گوێ لە ترپەی دڵی دەگرێت و شیر و هەنگوین دەڕژێتە شووشەی ماڵان\ ترپەی دڵ چەند بارسووکە\ بە خوناوی ڕوونبووەوەی چاوی گوڵ\ دەڕۆم تا ئەو شوێنە دەڕۆم\ دڵ بەر نائومێدی ناکەوێت\ مەستیی تاووس دەکەمە بەهرە و پەیام\ ئاوازێکی نەرم سەری گەرمم ئاوڕشێن دەکات\ تاووس هەر لە ئاسماندا دەڕوات\ لە سروشتی نەشێواویشدا دەنیشێتەوە\ من بە دەنگی خەیاڵ دەیدوێنم و باڵی سووك دەبێت\ بۆ هەستان و باوەشێنکردنی هێلکە و هێلانەی\ تاووس باری ئێمەی لەسەر باڵی هەڵگرتووە\ داوەمووی نارۆشنی نێوان ژیان و مردن ڕادەکێشێت\ سووڕی دەوران و ژیان خۆش دەکات\

**4**



ژیانی من چەند لە سادەیی شەو و ڕۆژ دەچێت\ وا بەپەلە و نەرمەغار بەرەو نەمان دەڕوات و درەنگیش لە خەو هەڵدەستێت\ هێشتان خۆری هۆگربوون و خەونێکم\ نەگەیشتووەتە نیوەڕۆ





گەرمم بکاتەوە\ ئەستێرەی شەوم دەڕژێتە\ نسرمێکەوە و سەرمام دەکاتەوە\ دیسان بەسەر چاوی داخراوی ژیاندا پەرت دەبمەوە\ دادا\ دادی دڵ لە گۆڕێکی ڕووناکدا کۆم بکەرەوە\ وەك ئەفسانەیەك بخەوم و لە شەڕ ناگەڕێم\ بەڵام کەمێك گەردەنی لاری گوڵی مەرگ بۆن دەکەم\ دەرکەون ڕووناکیی گۆڕ و دیداری خودا دەرکەون\

لەبەرچاوم شاراوەنین دەرگا و پەنجەرەی ماڵ و بەروپشتی دەستمن\ من لە ئێوەوە لە ژیان گەیشتم و دوانیگاشم لەسەر ئێوەیە\

هەر تەنیا هاوارێك دەبیستریێت و بەس\ هاوارێکی بەئارام\ هەر تەنیا دەرکەوتنێك دەبیندرێت و بەس\ دەرکەوتنێکی بە ئاکام\

حیکمەتی گوێڕایەڵیی دادی دڵ بۆ هاوار و دەرکەوتن\ پێش تۆفانی نووح\ لەژێر ئاسمانێکدا کە هەموو ڕەنگەکانە\ بەڵام شین زاڵە\

دادی دڵم بەخەبەر هاتووە و سەری نارەزامەندی ڕادەوەشێنێت\ نەخش و نیگاری ترسێکی درێژخایەنی ڕشتووە و دەشبینن بەردی دیوارەکان دەکەون\ ئای درەختی ئاسوودەیی سێبەرت لە پیاڵەم نەکردا\ پیاڵەی دڵبینی چەند لە سادەیی شەو و ڕۆژ دەچێت\ ئەوەندەش دڵهەڵگوشراو و بێپەنای\ ئەی مایەی ڕەنج و بەهرە و ستایش و برینی پیرم\

5

فرمێسکی تامەزرۆییم لەبەر چرای ڕێگای کۆچی یاران زۆر ڕشت\ فرمێسکی تامەزرۆیی\ لارەلار نەییێت و سەد دڵم نەکەیت\

ئاگات لە دەستم بێت\ مەی مانم بەدەستەوەیە\ پەیمان ڕاگرم و چاوی پڕگیانم\ ڕوونە بە دیاری و خەڵاتی بەخشندە\

چاوی پڕگیان بەخشندەیی زۆر و وێنەی پاکیزەیی پێیە\ دەیانگەڕێنێتەوە یەکەم ماندووبوون و یەکەم درەوشانەوە\

دێت\ گوڵێك دێت\ گوڵبەدەستەکە ون دەبێت\ دەچێت چرای ڕێگای کۆچی یاران گەش دەکاتەوە\

ماندوو دەبێت و لە ناو یەکەم درەوشانەوەدا پشوو دەدات\ دەیەوێ بزانێت دووری نێوان هەڵچوون و ڕۆچوون چییە و چەندە\ یان کامیان وشەیەکی دووچاو ڕاکشاوە\ بزەی ڕەزامەندی بەلێوەوەیە\ دەچێتە دەستی گوڵبەدەستە ونبووەکەوە\

**6**

دایکە حەوا ئاوێنە و زایەڵەی هەموو ناوەکانە\ جوانی خۆی لە ڕوخساری جوانەندا ئاشکرا کردووە\ باوکە ئادەمیش لە خۆڵی مەستیی یەکەمین ڕوان\ ئاوازی بۆ گۆرانی ژیان دانا و دەنگی زرینگایەوە\ ئەوەی گۆرانی نەبیسێت باران نابینێ\ باخ جوانیی میوەی خۆی دا بە هەمووان\ توانیی زەمین بکاتە بەهەشت\ ئەرێ ئەستێرە و مانگ چی دەڵێن\ بە یارمەتیی هێزی خودایی نیگا گەرمەکان بکێشنە هەناوتانەوە\

ئارام و هێمن بە شوێن نیگا گەرمەکانەوە دێم\ بەهرە و پەیامم بۆیە هاتنم لەرینەوەی هەیە\ هاتوو یەخسیری نیگا\ ئارام و هێمنیش لەبەر گەرمایی نیگا دیاری و خەڵات وەردەگرێت\ دەشزانم نیگا پیاو دەکاتە تیشك و پێڵووی هەڵدەداتەوە\ لە ماڵی ساکاری تەمەن لەگەڵ تۆ لە خەو هەستاوم و دێم دەست بە ڕوومەوە مەنێ\ ئاگر لەژێر پێدا بکوژێتەوە\

دیاری و خەڵاتی نیگایە و پێستی وشکی زەوی تەڕ دەکاتەوە\ شکۆی نیگا و سێوی تەڕ لە تەماشاتان پاراو بوویمە\ بەباشی کاتی دیاری و خەڵات دەناسم\

**7**

لە پیاڵە و مەیی سینەتدا باڵی مەلە بهاوێم\ پەلەکوتەی نقومبوون بمگرێت هێشووی سرووشی خۆگرتنەوەیە\ هێشوو ناو دەنێم خانە زیندووەکانی لەش و بۆنوبەرامەی دەستنوێژا\ بەردی بەجێماوی سەربەردەنوێژ هەڵدەگرمەوە و لە قوڵمی دەبەستم\

تا ئەوپەڕی خوان و گەشت داوەتی دەبم\ ئەمە نە ڕووگەیە نە ڕووگەنما نە دووربین نە دانەی داو\ ژیانە هەڵدەقوڵێت و دادەبەزێتە سەر ناوچەوانی ڕووناکی\ چۆلەکەی سڕبوو گەرم دەکاتەوە و جریووە و جووکە هێڵکاریی سیمامان دەکێشن\





چۆلەکە چاوی لەبەر پێی خۆی ناگێرسێتەوە و گفتوگۆی پیاسە ناگێڕێتەوە\
قوربانی و نزا و درورد و چلچرا بەسەر باڵییەوەن\
من قەت نەمزانی چۆلەکە لە چی ڕادەمێنت و جریووە و جووکەی لە چیدا دەبێیە نەوا\ دەچمە داوەتی خوان و گەشت و بینینی\ ئێوارانی بەرەو گوندبوونەوەی مازووچنان\

**8**

تەواوی شەو مەلەی کرد و لە ڕۆخ چەمێکدا هاتە دەرێ\ئەستێرە و مانگ تا بەرەبەیانی هەزار ڕەنگ\ بە دەرکەوتنی یەکەم ڕوخسار و ڕووخۆشیی پەری دەخرۆشان و زمانێکی تریان دەبووا\ منیش لە پێستی تەنك و ئاو لەسەر نیشتووی مەیخانەی دڵی\ کە دەرگای بە ڕەنگی ئاو ڕەنگ کراوە\ سەیری خرۆشانی ئەستێرە و مانگ دەکەم\ وەك کوێرێك لە چڵەپۆپەی خرۆشاندا بزر دەبم و هاواری چاوساغێکمە\ چاو دادەخەم و دڵ دەکەمەوە\ ئەفسوونێك دەبێتە سێبەر و وتووێژی ساکاری دیدارا\ لە کێڵگەی گەرم و مەستی ئاوتێگەڕاوت\ ئاڵای سپی هەڵدەدەم\ داخی داخان لەم جەنگەدا دەشکێم\ ئاڵای سپیم لێوەرگرە و لە لام بمێنەرەوە\ ئەسپ بە بۆنوبەرامەی سواران دەگەڕێنەوە\ پیری پیران لە تەنیشم گۆرانیی خەڵوەتی دڵ دەڵێت\ ئاشقانە لەگەڵ دەفدا تێك ئاڵاوە\ دەستی نزا و هەستگەرمیی بەرز کردووەتەوە\ خودایە دەستی مێشك و دڵم لە یاخەدا بکەرەوە و ڕزگارم کە\ منیش لە تەختی بەرزاییدا بووم زانیم چی بکەم\ گۆرانیی ئەمشەو لە ئاو و مەلەدا بمێنەرەوەم بەسەر گژوگیادا پژاندا\ تاووس بە کۆ کۆرسم بوون\ ئاخ لە خرۆشی دەنگیان و دەمودووی درەختەکانی دەوروبەرا\ بە تەنیا لە ڕۆخ چەمدا ماومەوە و لە بەردەمیدا لەسەر قاچێك وەستاوم\ دەست بە کەزیی نەرموشلی ئەستێرە و مانگدا دەهێنم\ پەرییش بە پێستی تەڕیەوە چەند سانا تێپەڕی\ مێوانی شەوی ڕازی نەکردم\ دەستی لەسەر شانم دانا و ڕۆیی پەین بخاتە ژێر درەختی ژوان\

نەرم نەرم تەپەی پێیم گوێ لێبووا گوێم وەك خوانی ڕایەخستراو بەتاڵ و زمانم لاڵ\ چاویش ئامۆژگاریی کردم یەکەم بینین بە یاد بهێنمەوە\ نیگای ئاشنایی تاهەتایەش لە دڵدا دەپارێزرێت\ دڵ

لەگەڵ ئەو درەختانە بدوێ ئێواران پڕ دەبن لە جریووە و جووکەی مەستی\ خودایە مێشك و دڵ هەراسان و ماندوویان کردووم\ بمخەرە ئەوەڵ دڵۆپەبارانی پەڵەی ساڵ و برینی زەویم پێ داپۆشە\
لە بەربەیانێك کە ئەستێرە و مانگ بە هەزار ڕەنگ خرۆشاون\ تیشکێکی خەملیووم پێشاندە\ ببێتە دیدارێکی سادە و گۆناکان دابگیرسێنێت\

**9**

بێدەنگی بانگی تۆ دەکەم\ تەزینێکم گەرم بکەرەوە و بەشداریی جەنگم بکە\ خۆر بکوژە و تەواوی ئەستێرەکان بانگی شوێنی خەڵوەت دەکات و دەیانکوژێت\ بە ڕێکەوت کاتێکی ڕووخۆش کە من تێیدا دەکوژرێم دەگەمە بەردەرگای سرەوتن\ لەپڕ دەنگم دەنووسێت و دەبێتە لاپەڕەی بەتاڵی ئەلبوومێك\ پاش چەند چرکەیەك بەفر دەماری زەوی دەگوشێت\ تاووس بۆنی کۆچی گیانێکیان کردووە\ دێنە بەر دارەتەرم و چرا و قورئان خوێندن و قەڵەباڵغیی تازیە\
پاشای گیانم پاشای بەخشندە پێویستە تۆ گوێت لە دەنگی من بێت\ لە ناز و خۆنواندنی بەفردا\ بە بۆن دەکەوم و لە خەودا قسە دەکەم\ خەو تا چێشتەنگاو درێژ دەبێتەوە و بەڵا بەڕێوەیە\ ڕووناکیی بەفر هێندە بەهێزە چاو بە شەوارە دەخات\ تۆ لەودیوی دەرگاوە وەك ئاوێنە و مۆمت لێدێت\ چاوەڕێی ڕوودانی و تەنیا دەنگی منیش نابیستیت\ بەفر خوێنی منی دەوێ\ دەتوانن لە میوەدا بیناسنەوە\ چاوەڕوانی گەیشتنە\
کات میوەی پێگەیاندووە\ منیش ڕەنگی خوێنی خۆمم بیر دەکەوێتەوە و ڕەنگی دڵیشم دەبینم\ لە ناوچەوانی ڕوون ڕوونی خوداوەنددا شانم دایە شانی برینێکی کراوە\ لە کوڵمی داگیرساوی فریشتەشدا ڕاکردنی دڵی خۆمم پێشاندەن و بمنێژن\ ناشتن سرەوتی خۆشەویستی و گۆرانییە لە ستایشی ئەزەل\تاووسی بۆنکردووی کۆچ دەپرسن کوا\ مانگیش کەزیی لەسەر زەوییە و کیژە خەواڵووەکانی داپۆشیوە\ لیمۆی بۆنخۆش ڕێگام بدە ڕووبەنازی و خۆنواندنی بەفرا\ خەڵوەتی گریان بگرم و سەری خۆم بە کۆشی کتێبی شکۆی خوداوەندان بکەم\ مەرگ ناوی هەموومان دەزانێت\ شەرمی شکاوە و بە ناوی خۆمانەوە بانگمان دەکات\ نەشمزانی





چۆن وا بە ئاسانی ناوی کەسی لێ تێك ناچێت\

**10**

بە هەموو چەشنێك بەسەر پێستت دەخولێمەوە و ڕادەگەیەنم\ بەهرە و پەیام و ماتی دڵم وەربگرە\ ئەگەر مەرگ هات لە دیوانەکەم بمنێژن\ شیعری زۆرم بۆ ئازیزان و کۆستی ناکامی خۆم نووسیوە\ ئێ خودایە بەڵکو  لەگەڵم بێنە پیاسە\ مۆمی سەردەستیان دابگیرسێنن و دەستی سڵاو بەرز بکەنەوە\ بە ژێر درەختی بەرداردا تێبپەڕین\ نەزانین کات دەمەوعەسرە یان تەنکایی بەرەبەیان\ پێبکەنین و فرمێسك بە چاوماندا بێتە خوارێ\ لە دڵەوە چەند دەخوازم کوڕێکی سووکەڵە بووومایە\بە پایسکیل بچووبوومایە فڕن و نانی گەرم و ماستم\ بۆ بەرچایی دایك و باوکم بهێنابووایە\ کاتێك ئێسکبەندی جیهان بەیەکەوە گرێ درا\ پێش خۆر بزەی من ڕوخساری داپۆشی\ ئەو کات تەنیا ژیان هەبووا نەشمدەزانی ژیان چ ئازارێك دەکێشێت\ ئەسپی ڕاو بیری لەوە دەکردەوە\ مێژووی خوێن لە دەماری کەروێشك یان تاژی کۆنترە\ ئەی دڵ کێ درەختی بەرد-**-اری لێرەدا ناشتووە\ من لامپام هەڵکردووە\ لامپاش هیچ نهێنییەکی نییە و یارییەکانی خۆی پێشان دەدات\ لە پشت خۆلێککێشانەوەی مامز و پەڕکردنەوەی قورینگ بەسەر لکی شلکەوە\ تەماشای دەکەم و هەناسە هەڵدەکێشم\کرمی ئاوریشم لە هەناسەوە قۆزاخە پڕ دەکات\

ئابی **2014** هەولێر



# پاسە خۆڵەمێشییەکە

## هیوا قادر

پاسە خۆڵەمێشییەکە وا هات:

خەونم بینیووە پیاوێکی ڕیشن

خوێنم لە پاسێکی خۆڵەمێشیدا ئەڕژێنێت و فریا ناکەوم کۆی کەمەوە

تا ئەو نەهاتووە با ژیان لەگەڵ خۆمان بەرین بۆ گەڕان،

تا ئەو نەهاتووە با کچە مێردمنداڵەکانی قوتابخانە

بێ هیچ مەبەستێك بکەونە قریووەقریوو،



تا ئەو نەهاتووە با بە شوفێرەکە بڵێین:
چەند جارێك بۆ خۆشی بە دەوری فولکەی فیردەوسا بسووڕێرەوە،
گرەو بکەین کە ئەگەینە ئاستی گوڵەمیناکان بتوانین هەموویان بە یەك جار بژمێرین،
با نزیك قوتابخانەی سەرەتایی کچانی پیپی گۆرەویدرێژ
پاسەکە خۆی پڕکات لەو کچە پرچ تەڕانەی پێش تۆزێك لەووبەر لەژێر بارانەکەدا یارییان
ئەکرد،
تکایە لە ویستگەکان چاو بگێڕن بۆ پیاوی ڕیشن،
بۆ گەنجی مۆن، بۆ پیاوی بێسیما بێبریقەی
چاو...
خەونم دیووە ئەمڕۆ خوێنم لەم پاسەدا
ئەڕژێت و فریا ناکەوم کۆی کەمەوە.
کە ئەو پیاوە هات پەپوولەی سەر جانتای
منداڵەکان لە ترساندا ئەفڕن،
خاڵی سەر باڵی خاڵخاڵۆکەی سەر ملوانکەکان
ئەکەونە خوارەوە و زرنگەیان دیت.
نقێمی سوور و زەرد و شینی گوڵە
وردەکانی گوارەکان ئەوەرێن؛
تۆ هێشتا دەستت لە ناو دەستمایە،
هێندە توند دەستم ئەگوشیت
ئەڵێیت گوێم لە ترپەی دڵتە؛

تۆ هەڵمی هەناسەکەم هەڵئەمژیت و ئەڵێیت چەند گەرمیت ئەزیزم.
منداڵەکان باسی وانەکانیان و مامۆستاکان ئەکەن، کچە مێردمنداڵەکان ئەچرپێنن بە گوێی یەکتردا و ئەقریووێنن، پیرێژنەکان لە ئاوێنە بچووکەکاندا سەیری سوراوەکانیان و ئاڵیی سەر گۆنا چرچەکانیان ئەکەن، دەست بە جلە ئوتوکراوەکانیاندا ئەهێنن، سەیری جانتا دەستییەکانیان ئەکەن و ئەو نقوڵانە ئەژمێرن، کە بۆ کوڕەزا و کچەزاکانیان کڕیووە.
تەنها من بێدەنگم، تەنها من لەگەڵ وەستانی پاسەکەدا لە ویستگەکان بە دوای سیمای ئەو پیاوەدا ئەگەڕێم کە ئەمڕۆ ئەمکوژێت.
تۆ ئەپرسیت بۆ درەختی چوالە پێش درەختەکانی تر گوڵ ئەگرێت؟
من ئەڵێم چونکە من ئەمڕۆ ئەکوژرێم؛
توند دەمم ئەگریت و ماچێکم ئەکەیت و ئەڵێیت بەسە، ترسنۆك.
بۆنی باران لەگەڵ وەستانی هەر ویستگەیەکدا دێتە ناو پاسەکەوە، پیاوە ڕیشنەکە نەبێت، ژیان سوار ئەبێت، دائەبەزێت، لە پەنجەرەی پاسەکەوە ئەڕوانێت.
من ئەڵێم بە سواری پاسە سوورەکە بە شەقامی کوکوختیدا ڕۆیشتووم،
بە پاسە شینەکەش تا دوورگەی قریووە چووم،
بە پاسێکی سپیی باڵداریش ئەمشارەو شارم کردووە،
بەڵام من لەم پاسە خۆڵەمێشیەی ئەمڕۆ دانابەزم، پیاوە ڕێشنەکە...
بەسە دەمم ئەگریت؛
باسی گوڵنارەکانم بۆ بکە، شەمامە بۆنخۆشەکان، ماسییە وردەکانی ناو حەوزە سەوزەکە، باسی تامی دارچینی ناو چا ڕەشەکانی سیلان،
وەك هەمیشە بەرسیلەکان و دەنکەهەنارەکان لە دەمما بتەقێنە و تێر



پێبکەنە. بە نوکی زمان ختوکەی سکم بە، با بەیانیان پێش گەیشتنی لێوەکانت بە بۆی هەناسەت بێدار ببمەوە.

پاسەکە لە پڕ لە ویستگەیەك ئەوەستێت کە پیشتر نەبووە، پیاوێك سەر ئەکەوێت، بێسیما بێڕەنگ بێبریقەی چاو، وەك ئەوەی چاکەت و پانتۆڵێك بێ جەستە لە کەنتۆری ماڵێك رای کردبێت، سواری پاسەکە ئەبێت، لە ڕیزی دوای من و تۆوە دائەنیشێت، کەس وەك من و تۆ سەیری ناکات، ئەویش تەنها سەیری من و تۆ ئەکات و بەس.

پۆلێ لە منداڵە پرچ تەڕەکان دائەبەزن، ژنە عەبا بەسەرەکان بە خۆیان و کیسەی پڕ لە سەوزەوە سەر ئەکەون، کیژە مێردمنداڵەکان بە قریووەقریووەوە خواحافیزی لە یەکتری ئەکەن، پیرێژنەکان دائەبەزن و هێشتا چاویان پڕە لە ئومێدی ژیان، شێتێك لەژێر چەتری ویستگەیەکی سوورا بە تەنیا و بە ڕووتی وەستاوە، خێرا شوفێرەکە دەرگای پاسەکە دائەخات و نایەڵێت سەرکەوێت، دوای پاسەکە ئەکەوێت و چەند جنێوێکی وەك خۆی ڕووت بە شۆفیرەکە ئەدات، سەری هەموو موسافیرەکان بۆ لای



خۆی ڕائەکێشێت، من لەو ئاوڕدانەوەیەدا پیاوەکەی پشت کورسییەکەی خۆم ئەبینم، هەمان ئەو پیاوە بوو کە ئەمشەو لە خەونمدا کوشتبوومی.
من بە چرپە پێت ئەڵێم: خۆیەتی، تۆ بڕۆ با هیچت لێنەیەت، تۆ بڕۆ.
من کوشتنی خۆم پێش کوشتنی خۆم ئەبینم.
لە دواوە کسپەی پشکۆیەك لە سەرما ئەکوژێتەوە،
یان چەقۆیەك گەردنم ئەبڕێت،
خوێنەکەم فیچقە ئەکات و کراسە زەردەکەت پڕ ئەبێت لە گوڵی خوێنین،
موسافیرەکان هاوار ئەکەن، شوفێرەکە ئیستۆپێکی لەپڕ ئەگرێت و لە کورسییەکەم ئەکەومە خوارەوە، چاوم ئەچێتە سەر جووتێك پێڵاوی سووری کچێکی منداڵ، کە سەرم لەژێر پێیدا کەوتووە و بێدەنگ سەیرم ئەکات، دەنگە دەنگەکە کپ و کپتر ئەبێت و وەك چۆن چرایەك کز بکەیت ئاوا چاوم کز کز ئەبێت، ڕستێك وێنە لەگەڵ ساردبوونەوەی مێشکمدا خێرا تێئەپەڕێت، تۆ فریای هیچ ناکەویت بیکەیت، وەك مریشکی سەربڕاو بە دەورما هەڵبەزودابەزتە، خەونەکەم هاتە دی، نە خۆم نە تۆ نە خودا و نە هیچ کەس فریای کۆکردنەوەی خوێنەکەم ناکەوێت، سەرتاپای ژیانم وەك چنگێ مووروویی ڕەنگاوڕەنگ لێ ئەڕژێتە ناو پاسە خۆڵەمێشییەکەوە، تەنها تۆ و پیاوە ڕیشنەکە و جەستەی من لە پاسەکەدان، شوفێرەکە بە ڕەنگی زەرد و دەنگی شپرزە و زمانی تورتییەوە تەلەفون ئەکات، منیش هەڵئەستمەوە و ئەچمە سەر کورسییەکی بەتاڵ و سەیری خۆم و تۆ و پیاوەکە ئەکەم، جارجارێکیش بە خەمبارییەوە سەیری شوفێرەکە و خەڵکە مۆڵبووەکەی دەوری پاسەکە و ئەو جانتا بەجێماو و پێڵاوە





بەجێماو و کیسە پڕ سەوزانەی ژێر کورسیی پاسە خۆڵەمێشییەکە ئەکەم؛ پێت ئەڵێم لەچکەکەت داکەنە، خودا پیویستی بە لەچکی تۆ نییە چیتر، لەچکەکەت داکەنە و ئەو سەرە خوێناوییەی منی پێ ببەستە کە زۆر دێشێت، لەچکەکەت فڕێدە ئەزیزم، لەچکەکەت بدە بە من، لەچکەکەت نوقمکە لە خوێنی ڕژاوی مندا، ئێستا زانیت بۆ درەختە چوالەکان پێش درەختەکانی تر گوڵی ئاڵ و سپی ئەگرن، چونکە من ئەمرۆ ئەکوژرێم.

پاسە خۆڵەمێشییەکە منی گەیاندە دوا ویتسگە، تۆش بێ لەچك لە پاسەکە دابەزە و با پۆلیسیش بە دەمی داپچڕاو و سیمای حەپەساوەوە پیاوە ڕیشنەکە لەگەڵ خۆیان لوورەلوور بەرن، پاسە خۆڵەمێشییەکە بە بەتاڵی ئەچێتەوە ویستگەی شەوانەی، خوێنەکەی من بە ئاوێك ئەشۆردرێت کە پێشتر لە جەستەی هەزارانی وەك مندا بووە، لە تەڕیی ناو گوڵ و ژێر پێستی ئاژەڵ و درەختەکاندا بووە، کە پێشتر ڕووبار و دەریا و ئۆقیانووسی بینیووە و ئێستا بە بێزارییەوە لە سۆندەیەکەوە دیتە دەرەوە و تێکەڵ بە خوێنەکەی من ئەبێت و پێکەوە ئەڕۆینەوە بۆ



هەموو جێ.

تۆ سواری پاسێکی تر ئەبیت، تا بتگەیەنێتەوە بۆماڵەوە؛

بەڕاست ئەچیتەوە بۆ ماڵەوە؟

پاسەکە چ ڕەنگە؟!.





ئەنتۆن چیخۆڤ

# دوورگەی سەخالین

یاداشت

لەڕووسییەوە
هێمن تاهیر

بەم زووانە

# ئورهان پاموك

## ڕەنگەکانی تر

لە سویدییەوە: هیوا قادر






# بـا



**بلّند باجەلان**

پێشکەشە بە نونا

کەس بەرامبەرم نییە
تەنها چاوێك لە نێو ڕووناکیدا باڵ دەگرێت
لە کاتدا جگە لە چەند تەرمێکی جێماو و
تابووتی تاقانە هیچی تر نییە

بەو شەوگارە ڕووناکیی پێڵووی چاوی سێو دادەخا
لە بەردەم ئاوێنەکەدا چۆلەکە ڕووت بوویەوە.
نەکەی یارییەکە بشێوێنی
باوکم هەرگیز لەسەر دیواری قەدەغە وێنەی بڵاوبوونەوەی باڵندەکانی نەکێشا
باوکم دەیگێڕایەوە:
- هەرگیز یار نەهات!
تا خەتە سپییەکانی سێبەرە خێراکەم
دانیشە و
سەوڵ لێدە
تا تاڵە بە خەنە سوورەکانی نەنکم
دانیشە و
دووکەڵ
دووکەڵ
جگەرە بتکێشێ .
تا ددانە زەردەکانی فریشتەی دۆزەخ
بمرە و
سەبر
سەبر
حیکایەتی لەدەستچوونی پیاوێکی فڕیوو لە درەختەوە
بەرەو چاوێك کە لە ڕووناکیدا باڵەکانی لەدەست دەدا






بگێڕەوە بۆ باوکم کە سێو پێڵووی چاوی دادەخا و دەڵێ:

- هەرگیز نەمگوتووە: یار هەرگیز نەهات!

خۆشەویستم

دەزانی من و تۆ هەرگیز ئاسمانمان نەبوو؟!

باران بە تەنافی ماڵەکەتان هەڵواسراوە و با دەیلەرێنێتەوە

ڕۆژێ ئاسمانەکان پڕ دەبن لە دارزەیتوون و

(پیاوێك لە شەقامەکەدا هاوار دەکا: لەبەر باران چەتری چی؟!)

پازدە کەس لە بەرامبەرم وەستاون

هێشتا

کەس بەرامبەرم نییە

تەنها چاوێك لە نێو ڕووناکیدا باڵ دەگرێت

دەڵێت:

با دەیلەرێنێتەوە.

دەستەکانم بە با ببەستەوە

نیگەران مەبە

سەتڵێك ئاو بڕێژە لە بەردەمی ئەو دەرگایەی مەرگ بە پەرداخێك ئاوەوە

دەیکاتەوە

هەزاران کۆتری سوور لەگەڵ با دەگەڕێنەوە و

ژنەکەم لە سەر بانەکەوە هاوار دەکا:

- خۆتم نیشان بدە ، دەنا شیری مەمکەکانم دەدەمە ئەو پەرییانەی لە نێو کاسەی زێڕیندا شیر دەخۆنەوە.

وێنەکەتم لە نێو گیرفانمدا هەڵگرتووە

نیگەران مەبە

من

یەکێکم لەو هەزاران کۆترەی لەگەڵ با دەگەڕێنەوە

تۆ

لە دوکانەکەدا سێوی لاسوور دەکڕی

چۆلەکەیەك

لەسەر کاغەزێکی تەڕ دەنیشێتەوە

بەیانی لە پرسەی باراندا لەسەر سینییەکی کۆن ئەستێرە دابەش دەکا

هێشتا

هیچ خەبەرێکی تۆ نییە

چۆلەکەیەك هێلانەکەی دەسووتێنێ

بەیانی بە کلیلی ساردی ژوورەکەم دەرگای دۆزەخ دەکاتەوە

بەر لە هەزاران کۆتری سوور لێیەوە دەچێتە ژوورەوە

هەرگیز

نیگەران مەبە





هەمیشە

دەنگی دەفێك هەیە

با  دەفڕەنەکانیش  مردبن .



سەرێك کە جیا بۆتەوە لە جەستە بۆتە کۆلارە
زەوی لە زیندانەکەدا گۆرانی دەڵێ بۆ ئەو ماسییانەی دونیا ڕەنگ
دەکەن بە بێڕەنگی
پیاوێك لە نێو جێگای مردنەکەیدا بیر لە تەنیا ڕێبوارێك
دەکاتەوە
تێدەپەڕێ
کاتژمێرەکە جانتای سەفەری هەڵدەگرێ بەرەو وەستان دەڕوا
لاریی کەوانەیەك تۆم بیردەهێنێتەوە
بە نازەوە سەیرت کردم و گوتت: کۆلارەیەك و
زەوی و
چەند پیاوێك و
کاتژمێرێکی نێو زەلکاو
لەگەڵ
منی خنکاوی نێوان دوو کەوانە .

سەرێك لە شەقامەکەدا پیاسە دەکا کە جیا بۆتەوە لە سێدارە
سێدارەیەکی ڕەش بۆ کۆلارە و پیاوەکان
پیاوێکی تەمبەڵ بۆ چەند ژنێکی نەوسن

منێك بۆ تۆ لەگەڵ دڵێك و چەند کەوانەیەك
کاتژمێرەکەی نێو زەلکاو دوازدە نیشان دەدا .

شمشاڵەکان بۆ تۆ
من لە نێو درزی شمشاڵەکانەوە سەیرت دەکەم
تۆ لە درزی دڵمەوە لە بیرم بکە تا بۆ ئەبەد لە خەیاڵت بم
بزەیەکی ترسناك لێوت دادەپۆشێ
سێدارەکە گۆرانی دەڵێ و سەیری زیندانییەکان دەکا
کە
ئەمڕۆ
یان
سبەی
بە بۆنی گوڵ دەمرن
من
ئەمڕۆ
یان
ساڵێکی تر وەکو ئەمڕۆ
پێت دەڵێم: تۆم خۆشدەوێ.

ئاو لە نێو گۆزەی بەر باراندا ئاو دەخواتەوە





مردووەکان باوەش بە گۆڕەکانیاندا دەکەن و بە ئاو وێنەی خۆیان
دەکێشن لەسەر کێلەکانیان
هەمیشە بایەك هەیە لەبەر دەرگای گۆڕستانەکە چاوەڕێیان بکا
دونیا تاریکە و کۆترەکان لە شەوی تاریکدا سێکس لەگەڵ
پەنجەرەکان دەکەن
لەودیو پەنجەرەکەوە دەبینم
خۆشەویستم لەسەر سیسەمەکەی هەڵدەستێتەوە
دەست دەهێنێ بەسەر سەری کۆترە تینووەکاندا
سەما دەکا
بەڵکو بیری بچێتەوە پەنجەرەیەك هەیە
سەما دەکا
بەڵکو بیری بچێتەوە بایەك هەیە لەبەر دەرگای گۆڕستان خۆی دەکوژێ
سەما دەکا
بەڵکو بیری بچێتەوە کۆترەکان هاتوون سێکس لەگەڵ پەنجەرەکان
بکەن
سەما دەکا
بەڵکو بیری بچێتەوە دونیا تاریکە
سەما دەکا
بیری لای پەنجەرەکەیە
بایەك لەبەر دەرگای گۆڕستان خۆی دەکوژێ

پەنجەرەکان دەشکێن و کۆترەکان نەزیف دەبن
دونیا تاریکە.

شەو خۆر دەخاتە نێو سەبەتەیەکی پڕ لە مانگ
باڵندە دەمێنێتەوە
تاڵە قژێکی بۆیەکراوی هێنا
با
بارانیش خەریکی چاندنی ئەسپەکانە لە بیابانی تینوودا
ئاسمان چاوەکانی دادەخا
من تۆم دۆزییەوە لە نێو سەبەتەیەکی پڕ لە مردن
باڵندە دەمێنێتەوە
لەگەڵ
تاڵەقژێکی بۆیەکراو
کە
دەیبا
با.




خۆشەویستم،
چیتر پرتەقاڵی سەر شەقامەکان کۆ مەکەرەوە
باغەوانێك لە باغەکەی خۆیدا بە دزیی ژنەکەیەوە



ئەو هەنارانە دەخوا، باران خستوونی
دارتاشێکی شەکەت  پارچەتەختە  دەگرێتە دەریا
باڵندەیەك
وەك شکستی ئاوێنەکە
شکستی ژنێك بوو  دەمی بۆنی شەرابێکی دەدا
پیرەژنێك لە نێو پەرداخێکی شکاودا دەیخواتەوە بەر لە ئێوارە
تۆ وێنەکەت هەڵدەگریتەوە لە نێو دەریاچەکە
باڵندەیەك
لە نێو سەبەتەیەکی پڕ لە پرتەقاڵ و باراندا خەوتووە
تۆ گریای
جێت هێشتم
مانگ لە پەنجەرەکەوە پەرداخی شکاوی تێدەگرتی
وەك شکستی پەنجەرەکە
شکستی ورچێك بوویت شیر دەداتە ئاسمان
تۆ وێنەکەت دەخەیتە نێو دەریاوە
چەترەکەت پڕ دەکەی لە هەناری گەنیو و کۆترەکان لەسەر سەرت
دەنیشنەوە
باڵندەیەك
تەنیاترین
باڵندە

له نێو سەبەتەیەکی پڕ لە پرتەقاڵ و باراندا خەوتووە
تۆ گریای
جێت هێشتم
مانگ لەو دیو پەنجەرەکە لە نێو پەرداخێکی شکاودا تەنیایی باڵندەیەکی دەخواردەوە
تەنیاترین
باڵندە.

دایکم  لە نێو جێگای مردنەکەیدا
سەیری پشیلەکانی ئاسمان دەکا و
فرمێسك دەڕێژێ بۆ ئەو فرمێسکانەی باران نەیباراندن
هەموو ئێوارەیەك دوای ئەوەی لەگەڵ کۆترەکان سێکس دەکا
بە خوێنی من خۆی بسمیل دەکا
باوکم بە گۆچانێکی شکاوەوە
بەرەکە وەستاوە
اکە مونتەزیرە
یلەکانی ئاسمان گۆرانی دەڵێن بۆ ژنێکی مردوو
گۆچانێکی شکاو مونتەزیرە
تابووتەکە پڕ لە کۆترە، ڕەتبوو
هێشتا
دەرگاکە مونتەزیرە



هێشتا

ژنێکی مردوو کە مونتەزیرە

لە نێو جێگای مردنەکەیدا گۆرانی دەڵێ

دەشزانێ

هێشتا دەرگاکە لەودیو پەنجەرەکە مونتەزیرە

تۆ وێنەکەت دەخەیتە نێو دەریاوە

بایەکی شکاو کە منم

مونتەزیرە.



Interview



ژولیا کریستیڤا

عەباس مەعرووف

موڕادی ئەعزەمی

مەنسوری گۆشان

ئاریس سلۆت

# گفتوگۆی ئەدەبی سەردەم



# ژولیا کریستیڤا

**سازدان و ئامادەکردنی بە فەڕەنسی و وەرگێڕانی بۆ کوردی: بەیان سەلمان**

چاوپێکەوتنەکە لە ماڵی خاتوو کریستیڤا ئەنجام درا لە مانگی ئازاری ٢٠١٤. بەدەم ئامادەکردنی چاوە دەستی بە سەرەتای قسەکانی کرد. منیش پێم چاکتر بوو لێی گەڕێم بەزۆری ئەو بدوێ و کەم پرسیار بکەم.

**بەیان سەلمان:** سەرەتا، زۆر سوپاس کە لە کاتت ئەگرین و ئەم چاوپێکەوتنەمان لەگەڵ سازدەکەی.

**ژولیا کریستیڤا:** لە ڕاستیا ڕەنگە نەتوانم بە قووڵی وەڵام بدەمەوە، چونکو ئەو ناوچەیەیەی کوردستان بە باشی ناناسم، بەڵام ئەزموونی خۆت وەك ژنێکی بێگانە لەم وڵاتە بەلامەوە گرنگە.

**بەیان سەلمان:** جەنابت وەك فەیلەسوف، دەروونناس، ڕۆماننووس، فیمینیستێکی بەهەڵوێست و وەك کەسێکیش کە هەمیشە بە لایەنگری خەڵکی بێپشتوپەنا ناسراوی؛ فەڕەنسا بۆ تۆ جێی حەوانەوەیە؟ یان شوێنی دەستپێکردنەوەیە؟ یاخود جێی نووسینە؟ هەموو ئەمانە ڕوانگەیەکی تایبەتی لەلات بەرامبەر بە جیهان دروست کردووە؟

**ژولیا کریستیڤا:** گشت ئەمانە پێکەوە. من لە بولغاریا لەدایك بووم. لە وڵاتێك کە ڕژێمی کۆمۆنیستی بوو و کاریگەریی زۆر بوو. لە ساڵی ١٩٤١ لەدایك بووم، هەمان ئەو ساڵەشە کە ئەڵمانیا ڕووسیای داگیر کرد. کە منداڵین، ئەم جۆرە ڕێکەوتە تێبینی ناکەین، زۆر دواتر لێکی دەدەینەوە. دایك و باوکم بیرۆکەی ئەوەیان لەلا بووە، کە لە خوێندنگەیەکی فەڕەنسی دامنێن، هەر زوو فێری فەڕەنسی بووم. ئەوە مەکتەبێکی ئاینیی کاتۆلیکی بوو، کە ژن بەڕێوەی دەبرد. دواتریش، پاش کۆتایی شەڕ، لە ساڵی ١٩٥٠ ئەو ژنانە بە تاوانی سیخوڕی لەو وڵات دەرکران. دوای ئەوانیش ڕێکخراوی "ئەلیانس فرانسێز" خوێندنگەکەیان گرتە دەست. بەو جۆرە هەر زوو فێری فەڕەنسی بووم و هەمیشە جۆرە کرانەوەیەکم بەرەو کلتووری ڕۆژئاوایی هەبوو. بولغاریا وڵاتێکی سلاڤییە، کە کەم خەڵك دەیناسن. ئەمڕۆ تۆزێك زۆرتر باسی دەکرێ، ئەمەش بە هۆی ژیتانەکان و ڕۆمەکانە، کە لە هەردوو وڵاتی ڕۆمانیا و بولغاریاوە دێن. بەدەر لەم خەڵکانە، بولغاریا وڵاتێکە لەسەر بەلقان، کە بۆ پێنج سەدە لەژێر دەسەڵاتی تورك و داگیرکردنی موسڵمان بوو، لەگەڵ ئەوەشدا توانیی تەواوی کلتووری سلاڤیی خۆی بپارێزێ، کە لەسەر ئەلف و بێی سیریلیك بونیاد نراوە. ئەم ئەلف و بێیە لە لایەن دوو پیاوی ئاینی سلاڤەوە داهێنراوە، کە ناویان (سیریل و میتۆد)ە و بنچینەیەکی مەسیحیی لە پشتەوەیە. لەو سەرەتایەوە خولیایەکی گەورە لە لای بوڵغارییەکان بۆ کتێب، بۆ خۆڕاهێنان و بۆ پەروەردە تێبینی دەکرێ. ئەمەش وای کرد بە ئازادبوونیان لە داگیرکەری تورکی لە سەدەی نۆزدە بۆنەیەك داهێنن ناویان نا جەژنی ئەلف و بێ و جەژنی کلتوور. بەو جۆرە من مناڵییەکی زۆر باشم هەبوو (لە کتێبە نوێیەکەمدا "غەریزەی کات" باسم کردووە). لەو جەژنە، مناڵ، دایکوباوك، پیشەبەدەستەکان (ڕۆژنامەوان، مامۆستا، گۆرانیبێژ، خاوەن کتێبخانەکان...) هەر هەموو ئەو ڕۆژە دێن و هەریەکە پیتێکی لەسەر کراسێکی چنیووە و لە تەنیشت یەکەوە دەوستن تا ڕستەیەك یان شیعرێکی پێ دروست بکەن. بەو کردارە هەر هەموو نیشانیان دەدا، کە کلتوور چەندە گرنگە. ئەمە جۆرە بەرگرییەکیش بوو دژ بە دیکتاتۆریەتی کۆمۆنیست. بەو شێوەیە، هەر یەکەش دەبووە داهێنەرێك، نووسەرێك و بەلایەنی کەمەوە دەبووە خاوەنی کلتوورێك. لەپاڵ هەموو ئەمانەش دایکوباوکم کەسانێکی زۆر کراوە بوون بەرەو دونیای دەرەوە. باوکم بە زمانی گرێك و ڕووسی قسەی دەکرد، زۆر

بایەخی بە فەڕەنسا دەدا، هەر بۆیە وەك وتم، لەو مەکتەبە فەڕەنسییە دایانم. کە خوێندنم تەواو کرد (باسی وەردەکارییەکان لێدەگەڕێم، کە چەندە حەزم لێبوو بچمە بواری ئەستێرەناسی...)، لەبەر ئەوەی باوکودایکم کۆمۆنیست نەبوون، وەلاوە خرابووم. بەوەشەوە کە باشترین خوێندکار بووم، ڕێیان نەدام بچمە ڕووسیا، دەیانهێشت تەنها منداڵانی کۆمۆنیستەکان بۆ ئەوێ بچن. لەبەر ئەوە ناچار خۆم لە زانستی مرۆیی نووسی. لە کۆتایی خوێندنی زانکۆ، لە دوای تێزەکەم کە لەسەر "شەپۆلی ڕۆمانی نوێ" بوو، زەمالەیەکیان پێدام بۆ ئەوەی بچمە فەڕەنسا و تایبەتمەندیی لەو بوارە بهێنم. ئەو کاتە رژێمی کۆمۆنیست تەنها ڕێی بەو کەسانە دەدا سەفەر بکەن، کە تەمەنیان گەورەبوو. بە تایبەتی ئەو پیرانەی کە ئەسڵەن فەڕەنسیان نەدەزانی، لە دەرئەنجاما کەس سەفەری نەدەکرد. ئەوەبوو هەر پێش جەژنی کرسمس لە ساڵی ١٩٦٥ بەڕێوبەری تێزەکەم بە هەلی زانی کە سەرۆکی ئینستوتەکە، (ئەمیش کۆمۆنیستێکی سەخت و کەلەڕەق بوو) لە گەشتێکدا لە مۆسکۆ بردمی بۆ سەفارەتی فەڕەنسی تا خۆم پێشنیازکەم. کە لەوێ منیان بینی، یەکسەر پێیان وتم "مادەم فەڕنسی ئەزانی، زۆر چاکە، تۆ ئەو کەسەی کە بە دوایا ئەگەڕێین، تۆ ئەتوانی بڕۆی بۆ فەڕەنسا." بەم شێوەیە زەمالەیەکیان پێمدا بە ناوی شارڵ دو گول، کە بەو گەنجانە دەدرا فەڕەنسییان دەزانی و مەیلی قوڵکردنەوەی کلتووری فەڕەنسیان هەبوو. ئەوە بوو من گەیشتمە فەڕەنسا. جەنەڕاڵ دو گول خەونی بە ئەوروپایەکەوە دەبینی، کە لە ئەتلەنتێکەوە دەست پێکات بۆ ئۆڕاڵ و ڕووسیاش بگرێتەوە. دو گول ڕوانگەیەکی تایبەتی هەبوو، ئەگەرچی ئەوروپییەکی گومانگەر بوو.

بە گەیشتنم بە فەڕەنسا، لە فڕۆکەخانە تەنها پێنج دۆلارم پێبوو، باوکم هەر ئەوەندەی لە دەرامەتا هەبوو. پارەی زەمالەکە لە کۆتایی مانگی ژانڤێیە دەدرا، ناسیاوێکیش دەبوو بە شوێنما بێتە فڕۆکەخانە، بەڵام نەهات، زۆر چاوەروانم کرد... هەرگیز نەهات. ئەمە بۆ خۆی کارەساتێك بوو... درێژەی ئەم باسە لێئەگەڕێم. بەهەرحاڵ،

ژنێکی سەفارەت پێشوازیی لێکردم. فەڕەنسا بۆ من سەرەتا ئەم شۆکە گەورەیە بوو، کە بە تەنها پێنج دۆلار لە گیرفانم تا خەڵکی باش بە هانامەوە هاتن. دۆخەکە زۆر سەخت بوو، بەفریش ئەباری، فەڕەنسییەکان نەیانەزانی بەفر ڕامالْن، منیش بوتێکی باشم لەپێیا نەبوو، قاچم لە ناو بەفرەکەیا بوو، هەتا بڵێی لە دۆخێکی سەختا بووم و بێئومێد بووم. دەبێ ئەوەش بڵێم کە ئەو کاتە فەڕەنسا تازە لە شەڕی جەزایر دەرچووبوو، خەڵکی وا هەستیان دەکرد کە سەرلێشێواون، بزووتنەوەی ڕاستڕەوەکان لەئارادا بوو، بێهیوا بوون لەوەی چیتر وێنەی فەڕەنسای کۆڵونیال نەما. کەشوبای ئەو کاتە بۆ سەرجەمی خەڵك باش نەبوو، بەڵام لە گەڕەکی سان-ژیرمان دێ پرێ، گروپێکی ڕۆشنبیر هەبوون، کە دەتوانین بڵێین پێش وەختی خۆیان کەوتبوون. ئەمانە زۆر بایەخیان بە خەڵکی بێگانە و کەمایەتییەکان دەدا، من شانسم هەبوو کە تووشی ئەوان بووم. ئەمە لە خوێندنگەی باڵا بوو، من لەوێ ئەچووومە کۆرسی ڕۆلان بارت و لوسیان گۆلدمان، ئەمیان کۆمونیست بوو، بە وردتریش بیڵێم مارکسییەکی پێداچۆرەوە بوو، مەبەستم لەوەیە کە هەوڵی دا ستالینزم بگۆڕێ بۆ شتێکی کراوە. کۆرسی لەسەر هیگڵ و بونیادگەرایی دەوتەوە، ئەمە زۆر جێی خۆی هەبوو. خەڵکانی ئینگلیز و ئەڵمانم لەگەڵا بوون، کە بووینە هاوڕێ. هەر ئەمە زوو وای لێکردم بکەومە ناو تێکەڵەیەکی کۆزمۆپۆلیت، سنووردار بوو، بەڵام هەبوو، بڕواشم وایە کە لەو کاتەدا تەنها لە پاریس ئەو جۆرە گروپ و تێکەڵبوونە هەبوو. ئەمە زۆر پێش وەختی خۆمان کەوتبوو، لەوەی کە ئێستا پێی دەڵێن "جیهانگەرایی"، هەموو ئەو لایەنەمان تێدا کۆ ببۆوە، کە بێگانەین و لە کلتووری جیاوازەوە هاتووین. پاشان تێزەکەم تەواو کرد، بە باشی پێشوازی کرام، من لە نێوان ژنیانێکی کەما بووم لەو بوارە. کۆمەڵێ ڕۆشنبیر هەبوون گۆڤارێکیشیان بەڕێوە دەبرد بە ناوی "تێل کێل" بە گۆڤارێکی ئەدەبی ناسراوە، بەڵام بایەخیشی دەدا بە زانستی مرۆیی و فەلسەفە و سیاسەت. هەندێك خۆیان دەدایە پاڵ کۆمۆنیستی فەڕەنسی، هەوڵیان دەدا خۆیان بکەنەوە بەسەر ئەدەبی فەڕەنسی، ئەمانە جۆرە هیومانیزمێکی کۆمۆنسیتییان تێدا بوو، کە زۆر گەشەی کردبوو. لە سایەی ئەوان چاوم کەوت بە بەڕێوبەری ئەو گۆڤارە، فیلیپ سۆلێرز، کە پاشان بووە هاوسەرم. ئیتر بەو شێوەیە من لە فەڕەنسا مامەوە.

هەموو ئەمانەم بۆیە باس کرد، تا پێت بڵێم چەندە زەحمەت بوو ئەو کاتە، ڕەنگە ئەمە زۆر بە ڕاست دانەنێیت، چونکو دەبینی من لە کوێ دەژیم و چۆن دەژیم و کەسێکی پەراوێزکراو نیم، بگرە نیشانەی ڕێزلێنانم وەرگرتووە، بەڵام بۆ فەڕەنسییەکان هەمیشە بێگانەم. ئێرە وڵاتێکە کە زۆر بە خۆیەوە دەنازێ، بەوەی کلتووریکی زۆر گەورەی لە پشتە و خەڵکی تر لەو ئاستەی ئەوان نین. ڕەتکردنەوەیەکی بێگانەیان لەلا هەیە تەنانەت کە زۆر چاك فەڕەنسی بزانین و بگرە چیتر کلتووری خۆشمان بە باشی نەزانین، هەمیشە ئەو حوکمە بەسەرتا دابڕاوەن کە غەریبەی.

من ئەمە لە نێو خوێندکارەکانی خۆما دەبینم، کەسیان بانگ ناکرێن بۆ ناو خێزانێك، هاوڕێکانیان لەسەر قاوەخانەیەك دەبینن. لە کاتێکدا ئەمە لە ئینگلتەرا و لە ئەڵمانیا و ئیتاڵیا... وەها نییە. لەگەڵ هەموو ئەوەشدا شتێك هەیە، کە زۆرم خۆشەوێ لە فەڕەنسا، ئەوەش ئەقڵییەتی یاخیبوون و ڕەتکردنەوەیە. کە شتێك بە باشی نەڕوا، یەکسەر دەبێتە مایەی ئاخافتن، ئەمەش ئەقڵییەتی ڕۆشنگەرییە. هەربۆیە ئەڵێم کە شانسم هەیە وێرای ئەم دۆخی پەراوێزە وەك کەسێکی بێگانە هەمیشە لایەنی باشە هەیە کە پەسەندی کەین.
دوای ئەوە، لە لایەن ئەمریکییەکان و کەنەدییەکان و ئەنگلترا و نەرویج... بانگهێشە کرام و لە ئەمریکا دەرس ئەڵێمەوە، کتێبەکانم وەرگێڕانە سەر ئینگلیزی و هەر لەو وەرگێڕانەوە فەڕەنسیەکان دانیان پێدانام. ئەگەر بشکرێ، ئەڵێم کە ئێستا ناوبانگێکی جیهانیم هەیە و وەك نوێنەری فەڕەنسا تەماشام ئەکەن. ئەمە لە ئەمریکا زۆر ئاشکرایە. ئێستا لە زانکۆیەکی گرنگ کە کەم ناودارە بە ناوی ڤاندربیلت لە ناشڤیل، بازنەیەکیان پێك هێناوە بە ناوی "کریستیڤا سۆلکۆ"، لێرە هەشتا کەس بۆ دووهەم جارە کە کۆ دەبنەوە و قسە لەسەر کارەکانم دەکەن و بە ڕۆحییەتێکی زیندوو چالاکیی زۆر جوان دادەهێنن.

**بەیان سەلمان:** ئەوە جۆرە ورشەیەکە؟
**ژولیا کریستیڤا:** بەڵێ، ئەتوانین بڵێین وەرشەیە، بەلام جۆری بابەتەکانی کە بۆمی دەنێرن، لایەنێکی داهێنانی وەهای تیایە، کە زۆر سەرەنجم ڕادەکێشێ. بۆ چینیش بانگهێشە کراوم، لەوێش هەر بە ئیگلیزی کتێبەکانی منی خوێندەوە. لە زانکۆی فودان لە شەنگهای پێنج کتێبمیان وەرگێڕاوە. ئەمانەش بۆیە باس ئەکەم، تا بڵێم کە لە فەڕەنسا پەراوێز کراوم، ڕاستیشە کە وێڕای هەموو شتێك قبوڵ کراوم و ئەو لێبوردەییە لەئارادایە، لەگەڵ ئەو لایەنەم کە بێگانەم، کەچی لە دەرەوەی فەڕەنسا بە باشی قبوڵ کراوم. ئا ئەمەش هانی دام ئەو کتێبەم

بنووسم کە ناوی " لە خودی خۆمان بێگانەین". لەوانەیە ئەم کتێبە بناسی؟

**بەیان سەلمان:** بەڵێ، ئەو کتێبێکە کە زۆرم بەدڵە، وەك کۆمەڵێ کتێبی تریشت کە هەر ئاگاداریانم.
**ژولیا کریستیڤا:** بۆ ئەوەی بە کورت بێمە سەر ئەوە، بێگانەبوون تراژێدیایەکە، چونکو تاراوگە هەرچەندە بیری لێناکەینەوە، بەڵام لە ئەستا بۆ خۆی "دایککوژە" (کرستیڤا لێرە وشەی ماتریسید matricide بەکار دەبات، کە دەکرێ بە وشەی ڕیشەبڕ دابنرێ). کاریگەرییەکەی توندوتیژیی بەسەر زۆری نەخۆشەکانمەوە هەیە، چونکو وا هەست دەکەن کە خیانەت لە خەڵکی لای خۆیان دەکەن، لەبەر ئەوە خۆیان بە شەرمەزار دەبینن. ئەمە کردارێکە کەسەکە لە بنچینەی هەڵدەکێشێ، لەوەش زیاتر، وەك دۆخی من تەنانەت لە زمانی بولغاری هەڵیکێشام. ئێستا من نەك زمانم، بگرە هەر هەموو ژیانی ڕۆشنبیریم بە فەڕەنسییە. بە فەڕەنسی بیر ئەکەمەوە، بە فەڕەنسی ئەنووسم. ئێستا نزیکەی چل ساڵە کە بە بولغاری نانووسم، لەبەر ئەوە ڕیشەبڕین لەئارادایە، تراژێدییەك بەرابەر بە ڕابردوومان هەیە. لە هەمان کاتدا ئەمە شانسێکە، چونکو ئەمە لە پێش هەموو شتێکدا بوارمان بۆ دەڕەخسێنێ لەو شتانە بگەڕێین، کە لە ناخی خۆماندایە. ئەو شتانەی پەنگیان خواردۆتەوە و نامانەوێ دانیان پێدا بنێین، ئەو شتانەی ناسکن و بریندارمان ئەکەن. ئەو شتانەی کە خەڵکی قبوڵیان ناکەن و ئێمە هەموو توانامان دەخەینە گەڕ تا خۆمانی لەگەڵدا ڕاهێنین، ئەمە ناو دەنێم " گەڕان بە دوای ئەو بێگانەییەی لە ناخی خۆماندایە". لایەنی پەلاماردانمان بۆ کەسانی دی، نەخۆشییە دەروونییەکانمان، توندوتیژییمان، گەمژەییەکانمان و هەموو ئەو شتانەی وامان لێئەکەن بترسێین. لەم ساتەوە کە دەستت کرد بە ناسینی ئەو بێگانەییەی لە ناختە، هەر ئەم ساتەشە کە دەکرێیتەوە بەرەو دەرەوە، ئیتر هیچ شتێك لەلات نابێتە مایەی شۆك و نە ژیانیشت تێك دەدات. ئەو شتانە قبوڵ ئەکەی، کە وایان لێکردبووی ڕووبەڕووی ئەوانی تر داخرێی. ناسینەوەی ئەو بێگانەیەی لە ناخماندایە، بوارمان دەدات لە بێگانەیی ئەوی تر تێبگەین، ڕەنگە بە شێوەیەکی برایەتی و خۆشکایەتی نەبێ، بەڵام بە پێشوازیکردن، بە تێگەیشتن و بە دروستکردنی پرد لەگەڵ شارستانییەتی ترا.

**بەیان سەلمان:** ڕاستە، لێرە مەسەلەی لێبورد و کارکردن هەیە لەسەر خود.
**ژولیا کریستیڤا:** بەڵێ، مەبەستم لە ئەو کارکردنەیە لەسەر خود، کە یارمەتیمان ئەدات. ئا لێرەشا دەروونناسیی یارمەتیی دام لەوە تێبگەم. ئەمە لە بولغاریا فێری نەبووم. باوکم لە کتێبخانەکەیدا تاقە کتێبێکی فرۆیدی هەبوو

" لێکدانەوەی خەون"؛ ئەم کتێبە هەر لە پێش هاتنی کۆمۆنیستەکان وەرگێڕابووە سەر بولغاری. باوکم ئەم کتێبەی شاردبۆوە بۆ ئەوەی نەیخوێنمەوە، نەوەکا لە قوتابخانە تووشی گێچەڵێك بم. لەبەر ئەوە من قەت فرۆیدم ناناسی پێش ئەوەی بێمە فەرەنسا. ئەتوانم بڵێم کە بونیادگەریم لەگەڵ خۆما هێنا بۆ فەرەنسا، بەڵام فرۆیدیزم نەخێر. لێرە (فەرەنسا) لە سایەی دەروونناسی، هەوڵ ئەدەم پەیوەندی دروست بکەم بەو هەموو بێگانەبوونەی لە ناواخنی خەڵکە. نەك تەنها تەنها بێگانەبوون لە زمان، بەڵکو لە ئەقڵێیەت، بۆ نموونە لایەنی بەدکارییەکانی، توندوتیژی، سێکس و هەموو جۆرە شتێك کە مایەی تێکدانە، ئەمەش بوار دەدات فیکرێکی بونیادگەر و پڕ گونجان و کراوەتر دروست بکەی.

**بەیان سەلمان:** تیوریناسی ئەدەبی ژێرار ژونێت ئاماژەی بە زاراوەی "ناوهەڵکێش" intertextualité کردوە کە تۆ داتهێناوە. خۆت بە هەڵگری زاراوەی نوێ دەزانیت؟

**ژولیا کریستیڤا:** بەڵێ. من کە گەیشتمە فەرەنسا، ئەو کاتە کۆمۆنیزم دەستی کردبوو بە جۆرە کرانەوەیەك، بەتایبەتی بە بەراورد بە کلتووری ساڵانی سییەکان کە فۆرمالیستە ڕووسەکان، وەك باوەگەورەی بونیادگەرەکان، بەشێك بوون لێی. ئەوەبوو تێپەڕاندنی بونیادگەراکان بە کارەکانی پۆست بونیادگەری ڕووسی میخاییل باختین زۆر لەبەرچاو بوو، کە بە کورتی دەیوت: بونیادێك نییە بۆ زمان، بەڵکو ڕاستییەك هەیە، کە پابەندە بەوەی هەموو کارێك دیالۆگ لەگەڵ کارێکی ترا دەکات، دیالۆگ لەگەڵ مێژوو دەکات. لەو ساتەوەی دەستت بە خوێندنەوەی ڕۆژنامە و فلان و فلان کتێب کرد، هەرچی ناوەڕۆکە، تێکەڵ بە دەقەکەی تۆ دەبن. دەبێ بونیادگەرەکان ئاخافتن لەگەڵ ئەوی تردا بکەن، ئاخافتن لەگەڵ هەموو ناوەڕۆکە مێژووییەکان بکەن، بە شێوەیەك لە شێوەکان من بوومە دایەگەورەی پۆست بونیادگەرەکان. لە لایەنی دەروونناسییشەوە زۆر بایەخم بە ڕەشبینی و ئەزموونی خۆشەویستی و پەیوەندیی

پێشوەختی نێوان دایك و منداڵ و توندوتیژیی لە نێوان دایك و منداڵ دا، چۆن ئەو توندوتیژیانە وێرانکەرن، ئەوهاش لە ناواخنیانا هەڵگری لایەنێکی داهێنەرن.

**بەیان سەلمان:** تۆ گرنگیت بە لایەنی سوفیەتیش داوە؟ لە سەرەتای ئەم چاوپێکەوتنە باسی ئەوەت کرد کە ئارەزووت لەوە بوو ببیتە ئەستێرەناس. ئەمە پاشخانێك نەبووە بۆت بۆ داهاتوو، کە ئێستا بایەخ بە سۆفییەت دەدەی؟

**ژولیا کریستیڤا:** بەڵێ. ڕاستە. بڕوام ناکرد گرنگی بە مێژووی سۆفیەت بدەم، چونکو خۆم بە کەسێکی بڕوادار دانانێم، بەڵام لە سۆفییەتدا بایەخم بە لایەنی هیومانیزمی ڕۆشنگەرایی داوە، کە چۆن خۆی لێ جودا کردۆتەوە. مەبەستم لەو هەموو نەریتە ئایینییەیە، کە بۆ ئێمەی ئەوروپی، بە گرێك و مەسیحییەت و یەهودیەت و تەنانەت ئەو بەشەی کە کلتووری موسڵمانیشی لە خۆی گرتووە، دەگرێتەوە. جگە لەو هەموو کەسە گرنگانەی لە فەڕەنسا ئاشنایەتیم لەگەڵیانا پەیدا کرد. زۆرکات باسی ڕۆلان بارت و ژاك لاکان و لوسیان گۆڵدمان ئەکەم، تەنانەت باسی مارکسییەکانیش ئەکەم، بەڵام بە پێی پێویست باسی ئیمیل بینڤینیست ناکەم، کە دەقێکم بۆ وانەکانی تەرخان کردووە و لە چاپخانەی سوێی نزیکەی دوو ساڵە بە چاپ گەیشتووە. بینڤینیست زۆری بەسەرمەوە هەیە، ئەو شارەزاییەکی باشی هەیە سەبارەت ئێران و کلتووری ئێرانی و هیندوئۆرووپی. زۆر شت لەوەوە فێربووم و زۆر جێی تایبەتی لەلام هەیە. بە نێوەندی دەقەکانی ئەوەوە زۆر زاراوەی دەقە ڤیدیکی و ئاشوورییەکان لە ڕۆما و دەقی مازداییەکان و هەموو ئەو ئایینانەی کە ئەو کاری لەسەر کردبوون. من تایبەتمەندیم لەوا نییە، بەڵام زۆر کاریگەریی بەسەرمەوە هەبوو. ئەو بە پشتبەستن بەو هەموو لێکۆڵینەوە زمانەوانییە لەو ئایینە دێرینانە توانیی تیۆرییەکی زمانەوانیی گشتیی داهێنێ، کە هەموو زمانێك بگرێتەوە.

**بەیان سەلمان:** مادەم هێشتا لە بابەتی ڕۆژهەڵاتین، چۆن تەماشای هەلومەرجی ژن ئەکەی لە ڕۆژهەڵاتی ئەمڕۆ پاش ئەو هەموو ناکۆکی و وەیەکدادان و ڕاپەڕینە، کە تا ڕادەیەك بە خراپ کەوتەوە؟

**ژولیا کریستیڤا:** پێش ئەو چەند ساڵەی پێشوو، ئەوە هیوایەکی گەورە بوو. ئێستا دەبینین کە هەڕەشە لەسەر هەرچی هیوایە، لەئارادایە. جاری وا هەیە گەڕانەوەیەك بەرەو دواوە هەیە، کە زۆر سامناکە. لە لای خۆمەوە بە ڕاستی هیچ وەڵامێکم پێنییە، من تایبەتمەنیم لە جیهانی عەرەبیدا نییە. زۆر بایەخ بە هەلومەرجی ژن دەدەم، دەبێ ئەوەش بڵێین کە ئەم دۆخە زۆر ناسکە، ئەو وێنەیەی لەسەر ئیسلام هەمانە، شوێنێکی لاوەکی بە ژن دەدات.

هەندێ جار پێمان دەڵێن کە ئەمە لە تەفسیرکردنێکی ئیسلام تێناپەڕێ و تەفسیری تر هەیە، کە ئیسلامێکی نەرمترمان پێ نیشان دەدات کە لە ڕوانگەیەکی ترەوە تەماشای ژن دەکرێ و بگرە ئیسلامێکی سەر بە ڕۆشنگەرایش هەیە.

بەش بە حاڵی خۆم هەست دەکەم بیرۆکەی ئازادی لە ئەوروپا، کە فۆرمێکی هیومانیزم و عەلمانییە، بزووتنەوەیەکە ئەگەر لە ناواخنی جوودایزم و مەسیحییەتدا نەبووایە، شوێنی نەدەبۆوە. سەدەکانی ڕۆشنگەرایی لە ناو مەسیحییەتدا سەریهەڵدا (بە هەردوو باڵی کاتۆلیکیزم و پرۆتیستانیزم)، جوولەکەکان ئەوەیان هەیە، کە پێی دەڵێن هەسقەلە **Haskala**، بزووتنەوەیەکی ڕۆشنگەرایی جوولەکەیە، بەڵام ئیسلام ئەو بزووتنەوی ئازادییەی بەرهەم نەهێنا. بوارژوازییەت لەگەڵ ئەو بیرۆکەییەی رەخنە لە خوا، ئازادکردنی ژن و هەژاران لە پەراوێزی و کاتێکیش کرێکارین دەسەڵات بگرینە دەست... هەموو ئەمانە لە دونیای ئیسلامدا بەرهەم نەهاتوون. ئەمە دواکەوتنێکی زۆر گەورەیە لە بواری گەشەکردن و بەتایبەتی ڕێگرە بەرامبەر بە ژنان. هەربۆیە بە بۆنەی سەد ساڵ لەدایکبوونی سیمۆن دو بۆڤوار خەڵاتی "سیمۆن دو بۆڤوار"م داهێنا بۆ ئازادیی ژنان. هەر لە سەرەتاشەوە پێشکەشمان بەو ژنە موسڵمانانە کرد، کە بەپێی شەریعە (ئەم یاسا پیرۆزە) حوکمی مردن درابوون. کە ژنان دەیانەوێ فێر بن، کە دەیانەوێ بخوێنن، بە دڵی خۆیان شوو بکەن، بە ناپاك لە خشتەی دەدەن و دەیانکوژن. یەکەم ژن کە ئەم خەڵاتەی بەرکەوت، تەسلیمە نەسرین بوو، ئەوجا ئایان هاریس عەلی، پاشان دامان بە ژنێکی چینی و ژنێکی ڕووسی، هەروەها بە ژنە شاعیرێکی ئێرانی کە ناوی سیمین بەهبەهانی و پێش دوو ساڵێش دامان بە کۆمەڵێ ژنی تونسی، کە لەوەپێش دادوەر بوون، بەڵام ئێستا خراونەتە پەراوێزەوە و بە هۆی ئەوەوە زۆر ئازار دەچێژن و کەس باسیان ناکات. ئەیانەوێ ژن لەچك بکاتە سەری، نەهێڵن بڕوات بۆ خوێندنگە... ساڵی پاریش خەڵاتەکەمان بە ژنێکی فەرەنسی دا و پێش ئەویش خەڵاتەکەمان دا بەو کچە پاکستانیە

بچووکە، مەلالا یوسفزێ. مەلالا هەر ئەوەندەی ویستووە بچێتە مەکتەب، کە هەوڵی کوشتنیان دا، بەڵام باوکی و هەمووی خێزانەکەی پشتگیرییان کردوە. لەبەر ئەوە بە ڕاستی دۆخەکە وا دەبینم کە زۆر سامناکە. هێزی زۆر هەبوون، کە سوودیان لەم ڕاپەڕینانە بینیووە بۆ ئەوەی دەسەڵات بگرنە دەست. برایانی موسڵمان لەوان زیاتر خۆیان ڕێك خستبوو بۆیە زووتر دەسەڵاتی دەوڵەتیان گرتە دەست. ئێستاش هی تر هاتوون و ئەوانیان جێلەق کرد. لەم هەموو بەربەرەکانێیە ئازادیی لە مەترسیدایە و ژنان لە هەمووان زیاتر نرخی ئەو کاسە شکاوانە دەدەنەوە. ئەمان لە پێش هەمووان سەرکوت دەکرێن. کەوابێ چی بکرێ باشە؟

من چارەسەری سیاسیم پێنییە، تێکۆشانی مرۆڤدۆستانەی خۆمم هەیە و دەبێ ئەمە لە ڕۆژئاوادا بەردەوام بێت. لە پێش دوو ساڵ بانگهێشت کرابووم بۆ ئەوەی لەگەڵ پیاوانی ئایینیی چاومان بە یەك بکەوێ، ئەمە ڤاتیکان ڕێکی خستبوو. کەسانێکیان بانگهێشت کردبوو، کە بێبڕوا بوون، من تاقە ژنێك بووم لە نێوان ئەو هەموو پیاوە کڵاوبەسەرانە: موسڵمان و کاتۆلیك و جوولەکە... وەك نوێنەری شاندی ئەو کەسە بێبڕوایانە قسەم لەسەر هیومانیزمی سەدەی بیستویەك کرد. کە گەڕاشمەوە فەڕەنسا، پێشنیازی کاتۆلیکەکان و جوولەکەکانم کرد کە بازنەیەك پێك بهێنین بە ناوی بازنەی مۆنتسکیو (**Montesquieu**)کە پیاوانی ئایینی، ئیمام، ڕەبەن، هیومانیستەکان، ژنان تێیدا بەشدار بن. لەم بازنەیەدا قسە لەسەر چی بکەین؟

لە پێشاندا لەسەر تێگەیشتنمان لە پەیوەندیی نێوان ئەو هەموو کلتوورانە، چونکو وا بیر ئەکەمەوە کە ئەو فەلسەفەیەی کە من خۆم سەر بەو دەزام، فەلسەفەی ڕۆشنگەرایی و عەلمانیەت، دابڕانی لەگەڵ ئاییندا هەیە، لەبەر ئەوەی هەمیشە وا بیرمان کردۆتەوە کە ئەو ئایینانە ئازادیکوژن، خراپەکاریی بەرامبەر بە خەڵك و بەتایبەتی ژنان دەکەن، بەڵام بە دامەزراندنی ئەو بازنەیە جۆری تێکۆشانەکەمان بەردەوام دەبێت. من ئەمەم وت سەبارەت بە ژن لە ئیسلامدا، لە بیرمان دەچێ کە لە ئاییندا ئەو بابەتانەش هەن، کە یارمەتی لایەنی لاوازی و ئازار و جۆری بەسەربردنی ژیانی کەسێك دەدەن بەسەریا زاڵ بێت. بە لەبیرکردنی ئەمەش ژمارەیەکی خەڵکی زۆر زۆر وەلاوە دەنێین بۆ قەشە و پیاوانی ئایینی. لەبەر ئەوەی بەو خەڵکانە ناڵێین مانای چییە کە دەبیتە دایك، دەبیتە باوك، کە منداڵێك لەدایك دەبێ چی بکەی، بەرامبەر بە مردن چی بکەی، بەرامبەر بە هەموو چرکەی لاوازیی و هەرچی پابەندە بە ژیانەوە چی بکەی. ئێمە لەو بڕوایەوە وازمان لە ژیانی خێزان هێناوە، کە هەموو شتێك بەپێی یاسا و بازرگانی چارەسەر دەکرێ. ئەگەر پارەت هەیە، ئەتوانی شت بکڕی و هەموو شتێك دەچێتە جێی خۆی. هەرچی ژیانی رۆحییە، وازمان لێهێناوە. لەبەر ئەو هۆیانە  پێشنیازی ئەوەم کرد کە ئەو بابەتانە لێك بدەینەوە، کە ئایینەکان

هەوڵدەن لە ناو یەکدا لە یەك تێبگەن و لەوانەشە بگەنە ئەوەی هەندێ دۆگمای ئایینی هەڵسەنگێنن. بۆ نموونە، بۆ ئەوەی لە ناو ئیسلامیدا کەمێکی تر دان بنێن بە مافی ژناندا، دەبێ بزووتنەوەیەکی گۆڕانکاریی گەورە لە ناو خودی ئیسلامدا بێتە ئاراوە. ئەمە بە فشاریی ئابووری ناکرێ، ئەمە بە ئاخافتن و لێدوان و گفتوگۆ دەکرێ و کاتیشی دەوێ.

**بەیان سەلمان:** ئەمە بەرەو پرسیاری عەلمانیەت دەمانبات؟ چۆن لە ئاست گەشەکردنی ئوسوڵییەکان تەماشای عەلمانیەت دەکەی؟
**ژولیا کریستیڤا:** ئا ئەمەیە پرسیاری عەلمانیەت. دەبێ بگەینە ئەوەی پرسیاری عەلمانییەت قبوڵ بکەین. لە ئێستادا دۆزەکە زۆر زەحمەتە.

**بەیان سەلمان:** چۆن وا لە خەڵك بکەی کە بە لای عەلمانییەتدا بێن؟ چۆن قەناعەت بە ئایینییەکان بکەی کە ئاین و دەوڵەت لەیەك جیا بکەنەوە؟ لەم ڕووەوە دواکەوتنێك لە ڕۆژهەڵاتدا نابینی؟
**ژولیا کریستیڤا:** بەڵێ، بە لایەنی کەمەوە بۆ نیواونیوی هاووڵاتیان کە ژنانن. نزیکەی چەند ساڵێکە کە فەرەنسا دۆخی ئاوای بە خۆیەوە نەبینیووە، کە ئوسوڵییەکان بە جۆرێکی تێبینیکراو ڕەق بوونە. لە مزگەوتەکان و بگرە لە ڕووبەری گشتیشدا و لە ناو شەقام و تەکسیش ئەمە بەدی دەکرێ. شوفێری تاکسییەك پێی وتم: "خانم، ئەو کەسانەی بڕوایان نییە، هیچ نین، ئەو کافرانە دەبێ بکوژرێن...". لە راستیا نەموێرا باسی ئەوە بکەم کە من لەو دۆخەدام... تۆ باسی لێبوردنت کرد، بەڵام کێشە لەوەیە ئەو جۆرە کەسە ئوسوڵییانە نازانن لێبوردن چییە!

**بەیان سەلمان:** بەڵێ، هەموو کێشەکەش لێرەدایە.

**ژولیا کریستیڤا:** ئەمە بۆتە هەڕەشەیەکی ڕاستەقینە. بۆیە وای بۆ دەچم کە سەرەتا دەبێ یاسا بەرقەرار بێ بۆ ئەوەی ڕێ بگیرێ لەم جۆرە بیرکردنەوەیە، بۆ ئەوەی بەرگری لەو کەسانەش بکرێ کە بڕوایان نییە، بەرگری لە ژنان بکرێ و لە هەموو جۆرە ئازادییەکی بیر و هۆش، لە هەمان کاتدا نەك تەنها یاسا دابنرێ، بەڵکو شوێنیش دابمەزرێ بۆ ئاخافتن لە نێوان خەڵك کە تێیدا هەر لە قوتابخانەوە دەست پێبکرێ قسە لەگەڵ گەنجان بکەین و وا بکەین ئەقڵییەتەکان هەڵسەنگێندرێن. گروپی بازنەی مۆنتسکیۆ پێشنیازی ئەوە دەکات کە خوێندنەوەی لاییك بۆ ئایینەکان لە خوێندنگەکاندا بەرپا بێ، چونکو ئێمە دەستمان لەوە هەڵگرتووە، وتمان کە ئایین شتێکی گەمژانەیە و باش نییە...ئێمەمانان ئەمە دەڵێین و لەولاوە ئیمامەکان دێن بە هەموو بیرێکی توندوتیژەوە ئەوە دەخەنە مێشکی ئەو گەنجانە، ئەمانیش بەرامبەر بەوە بێبەرگرین. ئەی بۆ نەچین و پێیان بڵێین کە قورئان هەیە و باسی ئائەمە و ئائەوە دەکات و کە بابەتی تێدایە زۆر گرنگن، بەڵام هی واشی تێدایە ناکرێ وەرگیرێن، چونکو هەڕەشەیە بۆ سەر ئازادی ژن و منداڵ و هتد... بەو شێوەیە ئێمە دەتوانین جۆرە خۆئامادەکردنێك بەرەو ڕۆشنگەریی خۆمان ئامادە بکەین و پاشان بەرەو سیکولاریزم بچین.

**بەیان سەلمان:** ئێمە کێشەیەکی خوێندنەوەمان هەیە، یاری بەو خوێندنەوانە دەکەین بەرامبەر بە ژمارەیەکی زۆری نەخوێنەوار...

**ژولیا کریستیڤا:** بەڵێ، ئەوان گوێ لەوە دەگرن، کە ئیمام چییان پێدەڵێ! لەو جۆرە وڵاتانە لە ئێستادا هیچ ناکرێ، بەڵام لە فەڕەنسا خەریکین لەگەڵ ئەو گەنجە موسڵمانانەی لە خێزانی کۆچبەرەوە هاتوون لە ڕێگای قوتابخانەوە فێریان دەکەین، لە سەر دەستی کەسانی سیکولار و پسپۆڕی بواری مێژوو و ئاین و زانستی مرۆیی، نەك لە ڕێی ئیمامەوە. بەو شێوەیە خوێندنەوەی تریان دەبێ. نوخبەیەکیش پێك دەهێنین کە خەڵکی وەك من بچێت و لە وڵاتێکی وەك تورکیا و تونس و ئەفغانستان بە ئاسانی قسە بکات.

**بەیان سەلمان:** ڕۆشنبیری کورد زۆر هەستیارن بەرامبەر بە تێڕامانەکانت سەبارەت بە پرسیاری ئەوی تر و ئەو میللەتانەی ژێردەسەن. دۆخی کورد چیت لەلا دروست دەکات وەك نەتەوەیەکی پارچەپارچەکراو و دابەشکراو، قوربانیی ڕەشەکوژی و ژینۆساید و بەردەوام لەژێر هەڕەشەی شەڕان؟ بۆ نموونە کە کەسێك لێم دەپرسن لە کوێوە هاتووم؟ وەڵامی من وەك کوردێك، جێی پەسەندکردن نییە، ناچارم بڵێم کوردی عێراق!

**ژولیا کریستیڤا:** بەڵێ، تێدەگەین کە هەستێکی گەورەتان هەیە بە شوناسی خۆتان، بەڵام هیچ هیوایەك هەیە کە ئەو بەشانەی کوردستان یەك بگرنەوە؟ خەڵکی بایی ئەوەندە لێبوردەن کە بتوانن یەك نەتەوە پێکەوە بنێن و بچنە بەردەم نەتەوە یەکگرتووەکان و داوای یارمەتیی پێویست بکەن بۆ دورستکردنی دەوڵەت؟ بەرنامەیەکی دیاریکراو لە ئارادایە؟ کورد خۆیان لە کام بەشانەن؟

**بەیان سەلمان:** بۆ ئەوەی بە کورتی بچمە سەری، تەنها دەڵێم کە لە نێوان عیراق و ئێران و تورکیا و سوریا و بەشێکی کەمیش لە ئەرمینیان...

**ژولیا کریستیڤا:** بە هەمووی چەند دەبن؟

**بەیان سەلمان:** لە نێوان ٣٧ بۆ ٤٠ ملیۆن.

**ژولیا کریستیڤا:** ئەمە زۆرە! بەڵام هیچ خواستی یەکگرتنیان هەیە؟ یان ئەوەندە جیاوازن کە ناتوانن پێکەوە بژین؟

**بەیان سەلمان:** پێش ١٩٩١ پاشان لە دوای رژێمی سەدام حوسێن ئەو خواستە هەبوو، بەڵام لەوەتی ئەو نیمچەسەربەخۆییە لەئارادایە، کوردستانی عێراق خۆی لە گەشەکردنێکی ئابووری دەبینێتەوە (کونتراکت لەگەڵ کۆمپانیاکانی نەوت، و داهاتی زۆر) کە ئەقڵییەتی یەکگرتنەوەی گۆڕی.

**ژولیا کریستیڤا:** بە شێوەیەك لە شێوەکان کوردستانی عێراق بۆتە مەڵبەندی؟

**بەیان سەلمان:** بەڵێ.

**ژولیا کریستیڤا:** ئەی ئەوانی تر دەیانەوێ خۆیان لەگەڵ ئێوەدا یەك بخەن؟

**بەیان سەلمان:** دەیانەوێ، بەڵام ئەمە زەحمەتە. بە ڕای منیش مەسەلەکە لێرەدا ویستن و

نەویستن نییە، بەڵکو پابەندە بەوەی بزانین ئەگەر نەخشەی ئەمڕۆی جیهان ئەو ڕێگایە دەدات یان نا.
**ژولیا کریستیڤا:** بەڵێ، یەکگرتن لە ئێستادا قورسە، کەواتە زلهێزەکان ئەم یەکگرتنەیان ناوێ؟

**بەیان سەلمان:** وای لێ تێدەگەم کە لە ئێستادا کوردیش قەناعەتیان بەوە هێناوە بە دوای مۆدێلێکی سویسری و یان وڵاتە عەرەبییەکاندا بچن. نزیکەی بیست ساڵێکە کە لەو بەشەی ئێمە لە کوردستان سەرکەوتین، کە زمان و کلتووری کوردی بگەڕێنینەوە ناوچەکە، ئەمەش وای کردووە کە ژیانی ڕۆژانەش واتایەکی هەیە.
**ژولیا کریستیڤا:** ئایا بوونی نەوت وڵاتە ڕۆژئاواییەکان هان دەدا کە بە دوای کوردستانێکی یەکگرتوو بچن، کە هێزێکی سیاسیی گەورە لە ناوچەکە دورست دەکات؟

**بەیان سەلمان:** دەبێ شتەکان لەو ڕوانگەیەوە لێك بدەینەوە کە ڕژێمێك لە پێش هەموو شتێك لە مرۆڤ پێك هاتووە. هەر وەك مرۆڤیش مەیل و خواستی دەسەڵات دەمانبات بەڕێوە. بەم پێیەش نامانەوێ کەس لەو حەڵوایەمان بخوات. دونیایەك کوردی سوریا دەگەنە ناوچەکە، بەڵام دەرگاکان بایی خۆیان کراوە نین لە ڕوویان.
جەنابت چۆن سەیری مەسەلەی ژینۆسایدی کورد دەکەی؟
**ژولیا کریستیڤا:** بەڵێ، لە کاتی خۆیا باسیان کرد، ئێستاش کەس ناوی نابات.

**بەیان سەلمان:** نەخێر، باسی کورد دەکرێ کە گازباران کرا، بەڵام کەس باسی ژینۆسایدی کورد ناکات، کە نزیکەی ٢٠٠٠٠٠ ژن و منداڵ و پیاو سەرونوگم کران. هەموو بەڵگەیەکیشمان هەیە کە ئەم کردارە ئەنجام دراوە...
**ژولیا کریستیڤا:** بۆ ئەوەی ئەم کرداری ژینۆسایدە بناسرێ دەبێ ONU ; UNESCO دانی پێدا بنێن.

**بەیان سەلمان:** دەڵێن گوایە کۆمەڵی وڵاتان دەستیان تێدا هەیە، لەبەر ئەوە سەری نهێنییەکانیان لەسەر هەڵنادەنەوە.
**ژولیا کریستیڤا:** بەڵێ، چەکیان فرۆشت بە سەدام و یارمەتییان دا، ئەوجا کە ئەمشیان لەناو برد، وەك بڵێی ئەوەمان کرد کە پێویست بوو، ئیتر باسی هیچ مەکەن؛ بەڵام ئێوە داوای قەرەبووتان کردووە؟

**بەیان سەلمان:** بەڵێ، بەڵام دەبێ ڕژێمی عێراق جارێ دانی پێدا بنێ کە ژینۆساید کراوە...

**ژولیا کریستیڤا:** بەڵام عێراق ئەمڕۆ وەك قیمە وایە، ڕەنگە لەگەڵ ئەمان هیچ نەکرێ، بەڵام بڕۆنە بەردەم دادگای نێونەتەوەیی و مەسەلەکە لەلایەن حکومەتی کوردییەوە بخرێتە بەرچاو نەتەوە یەکگرتووەکان. ئەوسا عەدالەت سەنگی مەحەکە، کە ئەم مەسەلەیە ساغ بکاتەوە. بێ ئەوەی لە بیرشمان بچێ کە تاوانی زۆر دەرهەق ئەم میللەتە کراوە. دەبێ ئەم کارە بە شێوەیەکی قانوونی و شەرعی پێی هەڵسن و لە لای دادگا نێونەتەوەییەکان، جگە لەوەی دەبێ کەسانی ڕۆشنبیر چالاکانە بەشدار بن لە هۆشیارکردنەوە و بانگهێشەکردن بۆ جەغتکردن لەسەر ئاشکراکردنی ئەوە. ئەمە لە لایەك و لە لایەکی ترەوە دەبێ نیشانی بدەن کە لەسەر بنەما سەرەتاییەکانی ئیسلام، دەکرێ فیکرێکی هەڵسەنگێنەری گەشەکەر بێتە ئاراوە، کە چالاکانە بەشدار بێت لە سەردەمێکی ڕووناکیی نوێی هیومانیست، کە تێدا جێی ژن و منداڵ و ئازادی ببێتەوە و شارساتنییەتی کورد ببێتە مایەی ڕێزی جیهان.

**بەیان سەلمان:** لە ئاست ئەو هەموو نەهامەتییانە نووسین چی مانایەکی هەیە هێشتا؟ دەکرێ کاریگەری بەسەر ڕەوتی ڕووداوەکانی دونیا هەبێ؟

**ژولیا کریستیڤا:** بە بڕوای من دەبێ لەگەڵ ئەوەیا خۆمان بگونجێنین، کە بوونمان لە ژیاندا ماوەیەکە، ئێمە نەمر نین، لەبەر ئەوە دەبێ بیر بکەینەوە چی بکەین لە ژیانمان. بە بڕوای من دوو شت هەیە بیکەین:

یەکێکیان دژ بە هەموو ئەوانە بین کە دوژمنی ئازادین و خەفەی دەکەن.

دژ بەوانە بین، کە ژن و منداڵ و کەسی پەکەوتە و لاواز و پیر سەرکوت دەکەن، ئەمە پێی دەڵێن بەرپرسیارێتیی ئیتیك. دیارە ئەمە بە سیاسەتدا ڕەت دەبێ، بەڵام دەکرێ شتێکی بچووکیش بگرێتەوە، لە پەیوەندیی کەسایەتی بۆ پەیوەندیی دراوسێتی، سیاسەت زۆرجار دەستی بەرداوە لەم ڕەهەندە ئیتیکییە. سیاسەت ئەمڕۆ بۆتە بەڕێوبەرێکی ئابووری و دارایی، کەچی لەلاشمان ڕوونە کە ئابووری و دارایی پێویستیان بە سیاسەت نییە، سیاسەت لە خزمەتی داراییە و بۆتە کۆیلەی

و بەرژەوەندییەکانی هاوپەیوەندییەکان دەپارێزێ. سیاسەت ئەمڕۆ ئەوە ڕۆڵەی نییە کە لە سەدەی هەژدە دژ بە پادشایەتی و ئاین تێدەکۆشی. بێبەهایی سیاسەت لە ئەمڕۆ ئاشکرا دەبێ. ئەگەر هەموو لایەك بەرەو ئەو بیرۆکەی بەرپرسیارێتیە ئیتیکە بچن و هەستیار بن بەرامبەر بە هاوکاری، ئەوە بێگومان لە سەر ئاستی هەموو جیهاندا هاوکارییەکی گرنگ دەبوو. لە لایەکەی ترەوە، نووسین لە لای شارستانییەتی (گرێك، جولەکە، مەسیحییەت) و بەشێکی ئیسلامی سۆفیگەرا، نیشانیان دا کە مرۆڤ بریتی نییە لەوەی تەنها بەرهەمهێنەری منداڵ بێت و ئیشکەر بێت، بەڵکو وەزیفەیەکی ناواخنیشی هەیە، بیر دەکاتەوە، پرسیار دەکات، ئامرازی ڤیرتوەل دادەهێنێ، موزیك، تابلۆ، دەق و هەموو ئەو شتانەی کە لەناویش دەچن، بەڵام ئەمانە نموونەیەکیشن بۆ ڕەتدانی کات، بەمەش خەڵکی تر فێر دەکەن بۆ ئەوەی باشتر بژین. ئەمە ناو دەنێم ئەزموونی ناوەکی. دەکرێ ئەمە فۆرمێکی فەلسەفیی هەبێ، دەقێکی کورتی رۆژنامەیەك بێت، پرسیارێك بێت لەسەر کۆمەڵکوژیی، لەوانەشە هەڵبەستێك، یان ڕۆمانێك بێت. ئا ئەمەشە کە فێرمان دەکات خۆمان کورت نەکەینەوە بۆ نانەوەی منداڵ و ئیشکەرێك، بەڵکو گەشە بەوە بدەین، کە زمان ئەو توانایەی کردنمان پێدەبەخشێ، لێرەش مەبەست لە دروستکردنی واتایە.

**بەیان سەلمان:** جەنابت ڕۆمان دەنووسی، لەسەر فەلسەفە و دەروونناسی و فیمینیزم دەنووسی. ئایا هەر یەك لەوانە ئەو لایەنە ناوەکییەت پێدەبەخشن کە ئاماژەت پێکرد؟

**ژولیا کریستیڤا:** دەقاودەق وایە. تەنانەت ڕۆمان بەو شێوەیەی من دەیخەمە کار و تەماشای دەکەم، بەوە دەچێ کە لە سەدەی هەژدەدا پێیان دەگوت "ڕۆمان تۆتال" کە گشت شتێکی دەگرتەوە. بەشێکی شیعریەت بوو، بەشێکی گێڕانەوەیە و تێمێکی هەیە، بەشێکی تێکۆشانی تاکە، بەشێکیشی فەلسەفییە. ئەم جۆرە ڕۆمانانە کە ژمارەیەکی زۆریان لێ چاپ ناکرێ، وەك ئەوانەی لە ناو وێزگەی قیتارەکاندا دەفرۆشرێن، منیش ئەو جۆرەتانم مەبەستە، کە چەند ڕوویەکیان بۆ ئەزموونی ناوەکی کەسەکە هەیە، جۆرە نوێژێکی عیلمانییە کە دەیکەین.

**بەیان سەلمان:** دەکرێ بڵێین کە بیرۆکەیەك بە خوێنەر دەدا لەسەر لایەنی ژیان و ئەزموونی کەسەکە ئەگەرچی دەقەکە خەیاڵیش بێت.

**ژولیا کریستیڤا:** تەواو وایە. ئێستا دەزانین کێ لەگەڵ کێ جووت دەبێ، سەرۆکی کۆمار و کەسانی تر... هەمووی ئاشکرایە. من ئەم جۆرە خۆهەڵتێقورتانە زۆر بە کردارێکی ڕەق و کێوی دادەنێم. لە خۆمانەوە ئەچینە ناو ژیانی

کەسەکان بۆ ئەوەی بە ڕاستی بزانین چی ڕووی داوە لە ژیانیان و چ جۆرە ئازارێکیان چێژاوە، یان خۆشییان بینیووە، کەچی وەها دەرناکەوێ. وێنەکە تۆزێ بە ڕەقی ئەو ئەزموونە ناوەکییە نیشان دەدات، بەڵام ئەگەر ئەو شتانە بە وشە دەرببڕین، تێبینی دەکەین کە ناتوانین هەموو شتێك وەك خۆی چۆنە، وەها بیڵێین. بە هەڵبژاردنی وێنە، میتافۆر، فیگەری ڕەوانبێژی (بەلاغە، ریتوریك)، وێنەی هاودژ و جێگۆڕکێ دەریاندەبڕین. ئەمەشە دەقی خەیاڵ، هەر ئەوەی مرۆڤایەتی لە دەمێکەوە سەرقاڵە پێوەی، لە کتێبە پیرۆزەکان بێت یان لە ئەدەب. لەوانەیە موسا هەرگیز نەبووبێ و کەسایەتییەکمان خولْقاندووە کە تێکەڵەیەکە لەو. لەوانەیە مەریەمی پاکیزە و ڕۆمیۆ و ژولییێتیش هەر نەبووبن و داهێنانێکی خەیاڵی بن.
ئەو کتێبەم "تیرێز ئاڤیلە" باسی ژنە ئاینییەك دەکات، کە خۆشەویستی بۆ خوا هانی دەدات لەسەر ئەو خۆشەویستییە بنووسێ، لە ڕێگای ئەوەوە جەستەی ئازاد دەکات، بەڵام بە شێوەیەکی خەیاڵی باسی لێدەکات.

**بەیان سەلمان:** ئەم جۆرە نووسینە وەك زمانێکی دووهەم وایە، کە بوار دەدات باشتر قسەی پێبکەی.
**ژولیا کریستیڤا:** بەڵی، ئا ئەوەیە، زمانێکی نوێ کە بوار دەدات خەڵکی تر خۆیانی تێدا ببیننەوە.

بەم زووانە

ئەنوەری ڕەشــی عەوڵا

ڕۆمان

شەڕۆی شمقار بڕیار نەبوو خۆکوژی بکات. ڕووناری عەتار لە بەرزەخی نێوان ژیان و ئەودیو ژیان تیاماوە و نازانین چ بڕیارێک دەدات. من بە هەموو هەست و پێستمەوە؛ ئەم حیکایەتەتان بۆ دەگێڕمەوە. جا هەموو ئەو فیگۆرانەی بەریدەکەون؛ لە جوغزی تنۆکە بارانێکەوە کە بە زمانی خۆی دەدوێ، کلوە بەفرێک کە ژیانی خۆی ئەزموون دەکات، هەتاوەکو مرۆڤەکان بە شێت و ڕۆحانی و شۆڕشگێڕ و تەنیا و دۆڕاو و براوەکان، خۆمن و منیش نیم. بۆ شێوەپێدان و خستنە ڕوو و نیشاندانی دڵی ئەو هاوکێشەیەش کە هەموو ئەو جیاوازیانەی لە خۆیدا نومایش کردووە، ئەوەم ئەنجامداوە کە لە توانای فیکری و سۆزدارییانە و ویژدانی و زمانمدا هەبوون. چرکەساتی گێڕانەوەکان هیچ ڕێسایەک نایانگرێتەوە، لێگەڕاوم تێڕامانەکان خۆیان لە خۆیاندا بخەملێن و خۆیان ڕێی خۆیان بگرنە بەر.

دەتوانم بڵێم ڕەگی ماخۆلیاکان، وەهان لە دڵی ڕووداوەکان و ئەوەی کە دەیخوێننەوە.

خولاسە " ئەمە ڕێگەی منە، ڕێگای تۆ کامەیە"..؟



# عەباس مەعرووفی

سازدانی: دانا فایەق

"عەباس مەعرووفی" ناوێکی نامۆ نییە بە خوێنەری کوردی. ئەو لە ڕێی ڕۆمانەکانی (سەمفۆنیای مردووەکان، ساڵی ئاشووب، پەیکەری فەرهاد و فەرەیدوون سێ کوڕی هەبوو) -کە کراون بە کوردی-، کەم تا زۆر ئاشنایەتیی لەگەڵ خوێنەری کوردیدا دروست کردووە.

مەعرووفی ساڵی **1957** لە تاران لەدایك بووە و لە زانکۆی تاران بەشی (هونەری دراماتیکی)ی تەواو کردووە و ساڵانێك مامۆستایەتیی کردووە. یەکەمین کۆمەڵەچیرۆکی ساڵی **1980** بە چاپ گەیاندووە، بەڵام دوای چاپکردنی

ڕۆمانی (سەمفۆنیای مردووەکان) ناوی و ناوبانگی وەك نووسەرێکی باش لە ئێراندا بڵاو بووەوە و ناسرا.
"گەردوون" گۆڤارێك بوو کە مەعرووفی چەند ژمارەیەکی لێ بڵاو کردەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی لەگەڵ سیاسەتی دەوڵەتدا نەدەهاتەوە، دواتر درا بە دادگا و گۆڤارەکە ڕاگیرا. هەر لەو سەروبەندەدا مەعرووفی خرایە زیندانەوە و ئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆر درا، دوای ئازادبوونی ناچار بوو لە ئێران هەڵبێت و ساڵی **1996** ڕووی کردە وڵاتی "ئەڵمانیا" لە "بەرلین"ی پایتەختی ئەو وڵاتە نیشتەجێ بوو. ئێستا لەوێ کتێبفرۆشییەك و ناوەندێکی هونەری و ئەدەبیی داناوە بە ناوی (هیدایەت)ەوە و هەر لەوێ خولی فێرکاریی چیرۆکنووسین دەڵێتەوە، هەروەها دەزگایەکی چاپخانەی هەیە بە ناوی (گەردوون)ەوە و کۆمەڵێك کتێبی فارسیی بە چاپ گەیاندووە.
عەباس مەعرووفی چیرۆك و ڕۆمان و شانۆنامە دەنووسێ و تا ئێستا **15** کتێبی لەو بوارانەدا بە چاپ گەیاندووە، بۆ ئەو کارانەی چەند خەڵاتێکی پێبەخشراوە.
ئەم گفتوگۆیە لە ڕێی ئیمایلەوە سازدراوە، ئێمە کۆمەڵێ پرسیارمان نارد بۆ ئاغای مەعرووفی و ئەوان بەم جۆرە وەڵامیان داوینەتەوە. ئەم گفتوگۆیە بە هاوکاریی خاتوو (بەیان ڕەشیدی) ئەنجام دراوە، ئەو پرسیارەکانی ئێمەی کردووە بە فارسی و دواتر وەڵامەکانی مەعرووفیی کردووە بە کوردی.

دانا فایەق: بەشێك لە کارەکانی تۆ خستنەڕووی مێژووی وڵاتەکەتە و پەیوەندیدارە لەگەڵ ئەو مێژووە. جیاوازیی ڕۆماننووس و مێژوونووس لە کوێدایە؟ ئایا دەکرێ ڕۆماننووس بە هەمان شێوەی مێژوونووس ئەمانەتداربێ لەگەڵ مێژوودا؟

عەباس مەعرووفی: ڕۆماننووس هەرگیز مێژوونووس نییە، تەنانەت ئەگەر ڕۆمانی مێژووییش بنووسێ، لەبەر ئەوەی دەست دەخاتە ناو ڕووداوەکانی مێژووەوە و دەستکاریی ئەو ڕاستییانە دەکات، کە لە دالانی یادەوەرییەکانیدا هەن. فۆرم و شێوازێکی تریان پێئەدات و خیانەتیان لێئەکات، بۆ ئەوەی ڕۆمان بنووسێت...
لە ژیانی تایبەتی کەسەکاندا، ناشیرینترین ڕەفتار درۆ و خیانەتکردنە لە ئەمانەت، بەڵام لە ڕۆماندا نابێت نووسەر واقیع بۆ خەڵك دووبارە بکاتەوە، لەبەر ئەوەی ئەوان شەو و ڕۆژ لەگەڵ ئەو واقیعەدا دەژین؛ خوێنەر بۆ ئەوە ڕۆمان دەخوێنێتەوە، تا لەگەڵ ژیانێکی دیکەی لە سەرووی ژیانی خۆیەوە پەیوەندی دروست بکات.
ئەوان ڕۆمان دەخوێننەوە، بۆ ئەوەی سەیری خەون و خەیاڵی شەهرەزادێك بکەن.








ڕۆمان لەدایکبووی شارە، خەڵك بۆیە ڕۆمان دەخوێننەوە، تا شاریتر بن، شارستانییەتەکان ببینن و وا بکەن بەرگەی ژیان بگرن، بەڵام کاتێك مێژوو دەخوێننەوە، بۆ ئەوەیانە کە بزانن شتەکان بۆچی وایان لێهاتووە.

**دانا فایەق:** ئەو شتانەی لە دەوروبەر ڕوو دەدەن، تا چەند ڕەنگی داوەتەوە لە کارەکانتدا؟ بە گشتی واقیعی ڕۆژانە و ژیانت تا چەند کاریگەریی هەیە لە ئەدەبەکەتدا؟

**عەباس مەعرووفی:** مەگەر دەکرێ لەژێر کاریگەریی ڕووداو و ساتەکانی دەوروبەردا نەبین؟ خۆ لەبارەی مەریخەوە نانووسین. باسی ئەو شوێن و شتانە دەکەین، کە لە دەوروبەرمانن و لەگەڵیان دەژیین.

جاری وا هەیە ڕەنگێك، بۆنێك یان دەنگێك دەمباتەوە بۆ کۆڵانەکانی "ئیمامزادە یەحیا"ی تاران؛ هەندێجار بە خەونی شەقامێك لە بەرلیندا بەئاگا دێم.

نووسەر کە لە خەو هەڵدەستێ بیر لەوە دەکاتەوە چ خەونێکی بینیووە؟ وێنەکانی خەونەکەی چۆن بوون؟ بۆ ئەوەی بتوانێ لەگەڵ بێدارییەکانیدا ئاوێتەیان بکات و وێنەیەکی لێکدراویان لێ دروست بکات، بەشێك لە وێنەکان لە دونیای خەونەکانیەوە دێن. ڕاستییەکی بێئاگایانە و دەستکاریکراوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە حازرخۆر نەبێ! شتە کۆنەکان نەجوێتەوە و لەباتیی ئەوانە وێنەی تازە دروست بکات. چ کارێکی سەختە... شیرین و سەخت!

**دانا فایەق:** ئەفسانە و میتۆلۆژیا لە زۆربەی کارەکانی تۆدا بوونیان هەیە. تێڕوانینی ئێوە بۆ ئەفسانە چۆنە و بە چ جۆرێك دەکرێ ئەو پەیوەندییە لە نێوان ئەفسانە و ئەدەبی نوێدا دروست بکرێ؟

**عەباس مەعرووفی:** وابزانم هەموو تەمەنی چیرۆکنووسینم بە بەرزەفڕییەکانمەوە تێپەڕیووە، بۆ ئەوەی بزانم چۆن سنووری واقیع و ئەفسانە و خەون دەبەزێنرێ، بە جۆرێك خوێنەر بکەیتە خەو و لەوێدا بیگەڕێنی، لەمبەر بۆ ئەوبەر و خەبەری نەبێتەوە، بەڵام ئەوە گرنگترە چۆن ڕۆمان یان چیرۆك دەکرێت بە ئەفسانە؟ لە سەردەمی گەنجێتیمدا لە خۆمم دەپرسی بۆ "نیزامی" توانیویەتی "شیرین و فەرهاد" بکات بە ئەفسانە و من ناتوانم؟ ئایا

سەردەمی ئەفسانە کۆتایی هاتووە، یان من لێی نازانم؟ شانۆنامەی "دلی بای و ئاهوو"م نووسی؛ کاتێ نمایش کرا، ڕۆژنامەکان نووسییان: "عەباس مەعرووفی بۆ نووسینی ئەم ڕۆمانە کەڵکی لە ڕۆمانێکی کۆنی تورکمانی وەرگرتووە..." دیارە من بێدەنگ بووم و هاوکات خۆشحاڵیش بووم، لەبەر ئەوەی قبووڵیان کردووە ئەوە ئەفسانەیە! ئەفسانەیەك کە بە خەیاڵی خۆم ئافراندبووم.

لەوەوە زانیم تەنانەت لەم سەردەمەشدا دەکرێ ئەفسانە دروست بکرێ و وەکو مورەبا کەوچك کەوچك دەرخواردی خەڵکی بدرێت.

ئەفسانە بۆ من هەر چیرۆکەکانی دایەگەورەمە، ئەو کاتەی لەسەر سنگی دەیخەواندم و ئەوەندەی دەوت، تا لە شیرینییەکەیدا ون دەبووم. هەزاران جار ئەفسانەیەکی بۆم دەوتەوە و من دیسان دەمویست گوێی لێبگرمەوە. یەکێ لەم ئەفسانانە لە بەشی کۆتایی ڕۆمانی "فەرەیدوون سێ کوڕی هەبوو"دا هاتووە. یەکێکی تریشیانم بە تازەیی نووسیوەتەوە بە ناوی "ئەفسانەی ئەشقێکی تەمومژاوی".

**دانا فایەق:** ئەو ئەفسانەیەی ئێوە لێی سوودمەند بوون، تەنیا ئەفسانەی ناو میللەتەکەی خۆتانە، یاخود پەڕیوونەتەوە بۆ ئەفسانەی گەلانی تریش؟ بە مانایەکی دی، ئەفسانەیەك هەیە تەنیا هی میللەتەکەی ئێوە بێ و ئەوانی تر، بەتایبەت میللەتانی دەوروبەر لێی بێبەش بن؟



**عەباس مەعرووفی:** ئەدەبیاتی جیهان هیی هەموو مرۆڤەکانە. کێ دەتوانێ بڵێ "شازادە چکۆلە" هیی من نییە؟ خۆشەویستی من نییە؟ جەرگی من نییە؟!

دەتوانین لەم خەیاڵەدا تا ڕادەیەك بەرەوپێش بڕۆین و بە ئاسانی بڵێین "ڕاسکۆلنیکۆڤ"ی هاوپۆلی زانکۆم؛ چەندە سەختی و نەبوونیی کێشا...! چەندە کوڕێکی ناسك بوو! دەکرێ بڵێین من "ڕۆبێرت سیبرتن"م و حوکمی لەسێدارەدانم بۆ دەرچووە! چونکە "گلۆریا"ی تاکەهاوڕێمم بە خواستی خۆی کوشت، لەبەر ئەوەی ئەوان تەقە لە ئەسپەکان دەکەن..!

لە ساڵە ڕەش و تاڵەکانی دەیەی هەشتای ئێراندا، کاتێك دایکێك ناچار دەبوو تەرمی کوڕە گەنجە ئەندازیارە لەسێدارەدراوەکەی لە باخچەی حەوشەی ماڵەوە




بنێژێ و هەمووو شەوێ بۆ دڵی خۆی "شامی غەریبان" بگرێ، لە سەر "ئانتیگۆنە"ی سۆفۆکلیس چیرۆکی "موری"م نووسی؛ برای ئانتیگۆنە کوژراوە و بە فەرمانی "کرۆئۆن" تەرمەکەی نابێت بنێژرێ و دەبێ ببێ بە خۆراکی قەل و داڵ...

ئانتیگۆنە بە دوای گۆڕێکدا دەگەڕێ بۆ ناشتنی تەرمی براکەی. هەر لە سەرەتای شانۆییەکەدا شڵەژاو و شپرزە دێتە سەر شانۆ و ڕوو لە خوشکەکەی "ئاسمینە" دەکات و بە شیوەنەوە دەڵێ: "ئاسمینە" خوشکەکەم، دڵسۆزی ڕۆژانی چەرمەسەریم، ئاگاداری سزای خوداکانی لە سەرمان؟"

سۆفۆکلیس سێهەزار ساڵ پێش ئێستا ئەم شاکارەی نووسیووە، بەڵام ئێمە هێشتا بە دوای گۆڕدا بۆ برا کوژراوەکانمان دەگەڕێین.

**دانا فایەق:** "سادق هیدایەت" چ کاریگەرییەکی لەسەر ئەدەبیاتی تۆ هەیە؟ یاخود بە شێوەیەکی تایبەتی چ پەیوەندییەك لە نێوان (کونەپەپووی کوێر)ی هیدایەت و (پەیکەری فەرهاد)ی ئێوەدا هەیە؟

**عەباس مەعرووفی:** هیچ... مەگەر دەکرێ مرۆڤ لە ژێر کاریگەریی کتێب و فیلم و ئەزموون و موزیك و شێوەکاریدا نەبێت؟ هەندێجار سێ ساڵ سەیری پەیکەرێك دەکەی! هەڵبەت من نازانم ئەو بابەتانەی کاریگەرییان لەسەر نەستم بووە؛ چین، بەڵام دەزانم هیدایەت هیچ کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆی لەسەرم نەبووە. قسەی زۆرم لەگەڵ هیدایەت بوو؛ دەبوایە قسەکانمی پێبڵێم. لە ڕۆمانی "پەیکەری فەرهاد"دا دیالۆگێکم لەگەڵی دروست کرد. ئەو لە ڕوانگەی پیاوەوە سەیری "ژنی وەهمی" دەکات و دەینووسێتەوە، بەڵام من لە "پەیکەری فەرهاد"دا بووم بە "ژنی وەهمی"، گوڵێکی نیلوفەرم بە دەستەوە گرت و لە بەردەمی پیرەمێردە کۆمەکەدا نووشتامەوە و چاوم بڕییە چاوە ڕەش و گەشەکانی ئەو پیاوەی "کوونەپەپووی کوێر"ی نووسیووە.

گێڕەرەوە، یان کەسایەتیی سەرەکیی "پەیکەری فەرهاد" ئاشقی ژیانە، لە کاتێکدا گێڕەرەوەی "کوونەپەپووی کوێر" شەیدای مەرگە.

لە "پەیکەری فەرهاد"دا "هەرزە و خەیاڵی" یەك کەسن. لە کتێبی "حەوت پەیکەر"ی نیزامی-شدا هەر یەکێکن.

"ماە پەیکەر"ی ئەفسانەیی و خەیاڵی دەبێ بە هەرزە و زۆر شتی تریش...
ئەگەر ئەم قسانەم وەك وتارێکی ئەدەبی لە ڕۆژنامەیەکدا بڵاو بکردایەتەوە، (با) ڕۆژنامەکەی دەبرد، بۆیە بە ناچاری چواردە مانگ بێوچان دانیشتم و ڕۆمانی "پەیکەری فەرهاد"م نووسی؛ ڕۆمانێك کە لە ڕاستیدا دژەڕۆمانە...

**دانا فایەق:** قسەیەك هەیە دەڵێ؛ ڕۆمانی فارسی تا ئێستا "کونەپەپووی کوێر"ی تێنەپەڕاندووە... بەڕاست ڕۆمانی فارسی ئەو ڕۆمانەی تێنەپەڕاندووە؟

**عەباس مەعرووفی:** ڕۆمانی فارسی لە "کوونەپەپووی کوێر" -کە باشترین ڕۆمانی هیدایەتە- تێپەڕیووە، گەیشتووەتە کۆمەڵێ ڕۆمان و چیرۆکی تر. هاوکات هیچ شتێك لە قورسایی "کوونەپەپووی کوێر" کەم نەبووەتەوە.
دیارە ئێستا لە قۆناغێکی ئێجگار سەرووتری "کوونەپەپووی کوێر"داین. گومان مەکەن. نەوەی پاش من، ئەگەر ئەدەبی من بەرەوپێشەوە نەبەن، بۆچی کاغەز ڕەش دەکەنەوە؟ هیدایەت بەو هەموو زیرەکی و چوختیبوونەوەیەوە ئەگەر نەوەی پاش ئێمە بووایە، دەبوو باشتر و بەهێزتر لە ئێمەی بنووسیایە، بۆ؟ چونکە لە دوای ئێمەوە دەهات.
دونیا بەرەو کامڵبوون دەڕوات، قەرارەکە وایە: ئەوانەی دواتر دێن، دەبێ باشتر بن لە ئێمە. چڕوپڕتر، ئاڵۆزتر و وریاتر.
"کوونەپەپووی کوێر" شێوەیەکە لە شێوەکانی ڕۆمانی فارسی، "سەمفۆنیای مردووەکان"یش شێوەیەکە لە شێوەکانی ڕۆمانی فارسی، بەڵام نەك بە هەمان شێوەی "کوونەپەپووی کوێر". هەرگیز نەمویستووە و نامەوێ ڕۆمانی "کوونەپەپووی کوێر"، یان هەر تێکستێکی تری ئەدەبی بە وەحی بزانم و نەکرێ ڕووبەڕووی ببینەوە، یان ڕەخنەی لێبگرین، بۆ نموونە؛ من لەگەڵ چیرۆکی دەفتەری یەکەمی "مەسنەوی مەولەوی"دا کێشەم هەیە. ناتوانم قبووڵی بکەم خودا کچێکی گەنجی لە پێناو چێژی پادشایەکدا خوڵقاندبێ. لە کارەکانمدا شتەکانیش کارەکتەرن و کەسایەتییان هەیە. مرۆڤەکانی ناویان پاڵەوان نین، بەڵکو ئینسانن. چۆن قبووڵی بکەم ئینسانەکان وەکو خاشاك مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ و هەرچییان بەسەر هات، چش...؟
چۆن دەبێ ئەو قسەیەی مەولانا قبووڵ بکەم؟ ئەمە ڕوانگەیەکی مەلایانەیە، لەبەر ئەوەی مەولانا تەنیا چیرۆکەکە ناگێڕێتەوە، بەڵکو بڕیار دەدات و ئامۆژگاریش دەکات.








من لەو بارەیەوە قسەی خۆمم لە ڕۆمان "ساڵی ئاشووب"دا کردووە. هەر ئەو خۆشەویستییەی کچی پاشا بۆ کابرای زەڕەنگەر... من ئەو ئەفسانەیە بە شێوازێکی تر دەگێڕمەوە. لە گێڕانەوەکەی مندا کچ یان ژن بێدەسەڵات نین؛ بیر دەکەنەوە و ڕۆڵیان هەیە.

**دانا فایەق:** هەندێ پێیان وایە ئەدەبیات لە دۆخی ئازاد و کراوەدا گەشە دەکات، بەرەوپێش دەچێت و دەتوانێ هەناسە بدات، لە بەرامبەردا ڕایەك هەیە کە پێی وایە لە فەزای داخراودا نووسەر دەتوانێ داهێنانی زیاتر بکات و کاتێك هەموو دەرگاکانی بە ڕوودا دادەخرێن، ناچارە پەنا بۆ شێوازی تری نووسین ببات و ڕێگەی جیاواز تاقی بکاتەوە، ئەمەش وا دەکات داهێنان بخوڵقێنێ. تۆ لە کام بۆچوونەیانەوە نزیکی؟

**عەباس مەعرووفی:** یانی چی دۆخی داخراو لەگەڵ خۆیدا داهێنان دەهێنێ؟ ئەم هەموو خەڵکە لە زیندانەکاندا دەرزێن و کات بە فیرۆ دەدەن و پیر دەبن، ئەی بۆچی تەنانەت یەك کاری ئەدەبی ناخوڵقێنن؟ شارەزایەکی باشی شەترەنجیان لێدەردەچێ، بەڵام نابن بە ڕۆماننووس. بێمانایە، باوەڕ مەکەن دۆخی داخراو ببێتە هۆی داهێنان. ڕەنگە نووسەر هەندێجار لە بارودۆخێکی داخراودا ژیان بەسەر بەرێ، ئەم حاڵەتە بۆ منیش ڕوویداوە، دەزانم لە دۆخی داخراودا کاتێك ڕێگە لە هونەرمەندێك دەگیرێ، بیری داهێنەرانەی ڕێگەیەکی تر دەدۆزێتەوە، بەڵام دۆخی داخراو داهێنان سیس و وشك دەکاتەوە و گیانی دەکێشێ. ئەدەبیات لە دۆخی ئازاد و کراوەدا هەناسە دەدات و باڵا دەکات، بۆیە ئەدەبیاتی داهێنەرانە لە هیچ قەفەزێکدا جێی نابێتەوە، نە لە قەفەزی تەسکی ئایینەکاندا و نە لە قوتووی تاریکی ئەو ئایدیۆلۆژییانەدا، کە بە "چەپ" ناسراون، خراپترینەکەشی سەردەمی "ستالین"ە، کە کۆمەڵێ نووسەری گەورە ئەزموونی ئەو دۆخەیان کرد و تیا چوون. "ئیزاك بابل" و "ئوسیپ ماندالیشتام" و چەندانی تر نموونەی ئەو نووسەرانەن. بێگومان دەزانن چ بەڵایەك بەسەر بولگاکۆڤدا هات، ڕۆحی دەرچوو تا ڕۆمانی "مامۆستا و مارگرێتا"ی نووسی و بڵاوی کردەوە.

دەرهێنەری ناوداری دانیمارکی "سوزانە پییەر" لە فیلمەکانیدا کۆمەڵگەی پێشکەوتوو و ئاستبەرزی دانیمارکی لە بارودۆخێکی دژوار و داخراودا نیشان دەدات، دواتر دەیخاتە ژێر ڕەخنەیەکی توندوتیژەوە. وای دادەنێ ئەگەر کەسێکی

دانیمارکی بخرێتە جێی کەسێکی سەر بە "تاڵیبان"، ئایا وەکو ئەوی لێدێ؟ بەڵێ... تۆیش ئەگەر لەو دۆخەدا بیت، وەکو ئەوت لێدێت و بگرە خراپتریش. حەزم لەم تێڕوانین و ئازادی و مامەڵەیەیە.

هونەرمەند دەبێ ئەو ئازادییەی هەبێت چاودێریی خەڵکی کۆمەڵگەکەی بکات و بیانخاتە ناو بۆتەیەکی ئاگرینەوە، بۆ ئەوەی ئاستی خۆڕاگری و مرۆڤایەتیی بەرز بکاتەوە. مامۆستا، سەرباز، سەرمایەدار، ژن، پیاو، منداڵ...

دواتریش کاتێك فیلمی "براکان" نمایش دەکات، لە بەرامبەر ئەوەی چارەی برا سەربازەکانی ناشیرین کردووە، دەوڵەت ڕاپێچی دادگای ناکات. ئەو دەڵێت: وای دابنێین سەربازێك نێردراوە بۆ ئەفغانستان، تاڵیبان دیلی کردووە و ئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆری داوە، دواتر بە هۆی هەندێ ڕووداو و پێشهاتەوە ناچار دەبێ "هاوزیندانی"یەکەی بکوژێ، پاش ئەوەی چەند شتێك ڕوو دەدات، ئازاد دەبێ و دەگەڕێتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی. ئەم دەرهێنەرە وێنەکە نیشانی سەربازەکە دەداتەوە و پێی دەڵێ: ئەمە تۆیت کە لە تاڵیبانیش خراپتری... ئەگەر وا نیت، ئاگادار بە؛ هەرگیز وا نەبیت...

زۆر جوانە، ئەم تێڕوانینە جێی ستایشە؛ بە پێچەوانەوە، بۆ نموونە ئەمڕۆ ڕاپۆرتێکم خوێندەوە کە ئیسرائیلییەك نووسیبووی، لە سەدا ٦٣ی گەنجانی ئیسرائیل دڵنیان کە ئەم دێڕە: (دونیا دژی ئیسرائیلە) وەکو ئایەتێکی ناو (تەورات) قەت گۆڕانکاریی بەسەردا نایەت. من و زۆربەی هاوڕێکانم دژی ئیسرائیل نین... ئیتر بۆ درۆ دەکەن؟





هەروەها نووسیویەتی: (ئیسرائیلییەکان تووڕە دەبن بەرامبەر ئەو شتانەی لە جیهاندا و بە تایبەتی لە ئەورووپا دژ بەوان دەوترێن) ئەمە یانی چی؟

لە سەدەی ڕابردوودا یەك مرۆڤی دەروونەخۆش تاوانێکی گەورەی کردووە، ملیۆنان مرۆڤی کوشتووە و دونیای بەرەو ڕمان بردووە، بەڵام جەنگ کۆتایی هاتووە. "ویلی برانت" لە بەردەم گۆڕی کوژراوەکاندا داوای لێبووردنی لە هەموو دونیا کرد. دوای جەنگ هەموو ڕووناکبیران بە شێوازی جۆراوجۆر هاوخەمیی خۆیان نیشان داوە، بەڵام هێشتا ئیسرائیلییەکان بە بیستنی هەرشتێك دژ بە خۆیان، تووڕە دەبن. بۆ؟ هەست بە لاوازیی خۆیان دەکەن؟ دەترسن؟ ئەو هەموو حەساسییەتەیان لە چییە؟ ئەو خۆ بە بەشخوراو نیشاندانە بەردەوامەیان دەگات بە کوێ؟ وەکو ئەوە وایە ئێمە هێشتا بە بیستنی ناوی مەغۆلەکان بلەرزین. قسەیەکی باو هەیە دەڵێ: "پاك بە و بێباك بە".




ئەم شتانە یاری بە فیکری من دەکەن و دەمخەنەوە بیری دەسەڵاتدارانی وڵاتەکەی خۆم. لە وڵاتی مندا هەر نووسەر و دەرهێنەرێك بیەوێ کارەکتەرێك لە هەر بوار و پیشەیەکدا دروست بکات، بەردەوام دەبێ بڕوات و بڵێ: ببوورن مەبەستم ئەوە نەبوو کە ئێوە لێی تێگەیشتوون. هەندێك لە پیشەکان هەر قەدەغەیە باس بکرێن، بۆ نموونە مەلا، سەرباز، بەسیجی، پۆلیس، قازی و زۆری تر. ئەگەریش باس بکرێن، دەبێ وەك ڕوخسارێکی جوان و بەرز بخرێنە ڕوو. مەگەر لەبەر چییە زیاتر لە نیوەی نووسەرە بەناوبانگەکانی وڵاتی من لەملاولای جیهاندا دەژین و ئاوارەن؟

**دانا فایەق:** تۆ پێشتر لە وڵاتێکدا ژیاویت و نووسیوتە، کە تێیدا سانسۆرێکی زۆر لەسەر نووسین و هونەر هەیە، بە ڕادەیەك نووسەر و هونەرمەند ناچارە بەر لەوەی کارەکانی لە لایەن دەسەڵاتەوە سانسۆر بکرێن، سەرەتا خۆی فیکر و خەیاڵی خۆی سانسۆر بکا، ئەوجا کار دەکات. ئەو خۆسانسۆرکردنە چەندە بوونی هەیە لە کارەکانتدا؟ بەو مانایەی ئەگەر ئەو کارانەی پێشتر لە ئێرانی ژێر سایەی سانسۆردا نووسیوتن، لە ئەڵمانیای دوور لە سانسۆر نووسیباتن، جیاوازییان زۆر دەبوو؟

**عەباس مەعرووفی:** کاتێك لە ئێران بووم ڕازی نەدەبووم بە سانسۆر، یان خۆسانسۆرکردن، بەڵام چەند جارێك بەری کەوتم! وەختێك ڕۆمانی "پەیکەری فەرهاد"م نارد بۆ وەزارەتی ئیرشاد تا مۆڵەتی چاپکردنی وەربگرم، ١٥ دێڕی توندم بۆی زیاد کرد؛ لەوێ ١٣ دێڕیان دۆزییەوە، من خۆم دوو دێڕەکەی تریشم نیشان دان و مۆڵەتی چاپکردنەکەیم وەرگرت. بەڕێوەبەری گشتیی کتێب پێمی وت: "بەڕاستی تۆ کەسێکی شەریفی" و سوپاسی کردم! بۆ کتێبی "تەواوە" لە دەزگای وەشاندن و چاپکردنەوە پەیوەندیم پێوە کرا و وتیان وەزارەتی ئیرشاد ٣٥ شوێنی لە کتێبەکە دیاری کردووە کە دەبێ بیانگۆڕم. وتیان قبووڵتە؟ وتم دیارە کە قبووڵمە!. ڕووداوەکانی ناو ڕۆمانەکە لە نێو زیندانێکی دوای ئینقیلابدا دەگوزەرێ. نووسەرێکم خوڵقاندووە لە زیندانی ئەو سەردەمەدا و لە ژێر ئەشکەنجەدا خەریکە گیان ئەدا؛ چۆن بەمەیان نەزانیووە؟! دوای دەستکاریکردنی ئەو ٣٥ شوێنە، کتێبەکە چاپ و بڵاو کرایەوە، بەڵام دوای یەك هەفتە دابارین بەسەریدا و هەمووی کۆ کرایەوە.

تا ئێستا کارەکانم کە لە ئێران و ئەڵمانیا نووسراون، هەرهەموویان بەبێ خۆسانسۆرکردن خراونەتە سەر کاغەز، تەنانەت یەك دێڕی نووسینەکانم لە دۆخێکی ئازادتردا ناگۆڕم. هەر ئەمەیە کە هەن! بەڵام زۆربەی کتێبەکانم لە ئێران مۆڵەتی بڵاوکردنەوەیان نییە.

**دانا فایەق:** ئەدەبیات و سیاسەت لە کوێدا یەك دەگرنەوە؟ یاخود شوێنێك هەیە ئەو دووانە بە یەك بگەیەنێ؟

**عەباس مەعرووفی:** سیاسەت و ئەدەبیات دوو هێڵی یەکئاڕاستەن، هەرگیز بە یەك ناگەن. قسەیەکی بەناوبانگ هەیە دەڵێ: "تا ئەو کاتەی حکومەت ببێ، شۆڕشیش هەیە" ئەدەبیات هیچ کاتێك نابێت بە کەری دەستەمۆکراوی سیاسەت.

ئەدەبیات ئەسپێکی یاخییە لە بەرامبەر سیاسەتدا، سیاسەتمەدار ببینێ، یاخی دەبێ، سم ئەکوتێ و ڕێ نادات سواری ببن.

تاکە خاڵی هاوبەشیان درۆیە. سیاسەت لەسەر درۆ وەستاوە. سیاسەت درۆ دەکات بۆ ئەوەی خەڵك فریوو بدات و بیانچەوسێنێتەوە، بنەمای ڕۆمانیش خەیاڵ و خەونە. ڕۆماننووس واقیع ناگێڕێتەوە، مێژوونووسیش نییە، بەڵکو دەستکاریی واقیع دەکات، بە ڕاست نیشانیانی دەدات و درۆی شاخداریان بۆ زیاد دەکات.





ئەدەبیات خەیاڵ دەچنێ، درۆ دەکات، زەوی و زەمان دەگرێ بە شایەت، تا دونیا جوانتر و ئینسانیتر بکات و جێگەی بەرگەگرتن بێ.

چ تێکستێکی ئەدەبی ژیانی کەسێکی وێران کردووە، یان بەشی کەسێکی خواردووە، یاخود خوێنی کەسێکی ڕشتووە؟ بە پێچەوانەوە، چ سیاسەت و سیاسەتمەدارێك هەیە ئەمانەی نەکردبێ؟ ئەلبیر کامۆ دەڵێ: "کەسانێك چارەنووس و سیاسەتی مرۆڤەکان دەبەن بەڕێوە، کە هیچ گەورەیی و قابیلیەتێکیان نییە. ئەوانەی گەورە و شایستەن ناچنە ناو سیاسەتەوە".

ئێستا بیهێننە بەرچاوی خۆتان، هەرکامێکیان درۆکەی شاخدارتر بێ، توانای کاریگەریی زیاترە. تا ئەو شوێنەی یادم بێ، لە ١٥٠ ساڵی ڕابردووی ڕووسیادا چەندین حکومەت هاتوون، خەڵکیان کوشتووە، خەڵکیان تاڵان کردووە و دواتر ڕووخاون، بەڵام




"دۆستۆیڤسکی" بە درێژایی ١٥٠ ساڵ وەکو کێوێك لە جێی خۆی ماوەتەوە، ئینسانی و ڕەگداکوتراو. لە فەڕەنسای ئازاد و ئەورووپا لەم پەنجا ساڵەی ڕابردوودا چەند سەرۆککۆمار گۆڕاون؟ کەس بیری نییە، بەڵام کەس "ئەلبێر کامۆ"ی بیر نەچووەتەوە. بۆ؟ چونکە "مۆرسۆ"ی دروست کردووە و "بێگانە"ی خوڵقاندووە. مەگەر "شازادە چکۆلە" چ پەیوەندییەکی بە سیاسەتەوە هەیە؟ بەڵام ئەو سەگبابە زۆر قسەی زیندووی پێیە، کە سیاسەتمەدارەکان دەیجوونەوە و دیسان خەڵکی پێ فریوو دەدەن.

**دانا فایەق:** هەندێك لەو باوەڕەدان ئەدەبیات شتێکی زاتییە و نووسەر کاتێك دەنووسێ، تەنیا دەبێ خۆی لە بیر بێ و بیر لە هیچی دی نەکاتەوە... لەولاوە ڕایەکی تر هەیە کە پێی وایە ئەدەبیات دەبێ لە خزمەتی کۆمەڵگەدا بێ و نووسەر ئەرك و وەزیفەیەکی ئەخلاقیی لەسەر شانە بەرامبەر کۆمەڵگە!. تۆ پێت وایە ئەدەبیات و نووسەر ئەرك و وەزیفەیەکی ئەخلاقیی لەو جۆرەی لەسەر شان بێ؟

**عەباس مەعرووفی:** نووسەر ژنێکە بەردەوام سکپڕ دەبێ لە کۆمەڵگە، بۆ ئەوەی شتێك بێنێتە بوون، گەورەی بکات و بیسپێرێتەوە بە کۆمەڵگە، بێ ئەوەی خۆی دەسەڵاتێکی هەبێ لەم پێچەبەدەورییە.
پەیام و بەڵێن با هەر بۆ "ماکسیم گورکی!" بێت. بەڵێن بە کێ؟ بە چی؟ نووسەر شەو لە پاڵ کۆمەڵگەدا نووستووە و توانای دووگیانبوونی بووە، ئێستا دەبێ بەرپرسیش بێ؟
بۆ؟ هەندێك جار دەوترێ "نووسەر ویژدانی کۆمەڵگەیە"، من دەپرسم مەگەر کۆمەڵگە خۆی ویژدانی نییە؟ نا... نووسەر ویژدانی خۆیەتی. بە باوەڕی من "نووسەر" ددانی کۆمەڵگەیە، هەموو شتێك ورد دەکات و ئەیهاڕێ، بۆ ئەوەی تەحەمول بکرێ. ئەگەر بەردیش بێت، دەشکێ. کۆمەڵگە ئەگەر بێددان بێت، بێنووسەر و کتێب بێت، دەبێ هەموو شتێك بکرێتە شلەمەنی و دەرخواردی بدرێ. سیاسەتمەدارەکان حەز دەکەن هەمیشە شلەمەنی دەرخواردی کۆمەڵگە بدەن و نایانەوێ کاڵاکەیان لەژێر ددانی نووسەردا شی بکرێتەوە. سیاسەتمەدار شەڕکردن لەگەڵ وڵاتانی دراوسێ و هاوئایین بە گەورەیی و شەرەف دادەنێ، بەڵام نووسەر ئاگری هیچ شەڕێك خۆش ناکات. ئەگەر ڕۆژێك دەسەڵاتدارە

ستەمكارەكان بڕوخێندرێن، دیسان نووسەر ڕێ لە تۆڵەسەندنەوە دەگرێ و داوا لە خەڵك دەكات كەس بە عەموودی كارەباوە هەڵنەواسن. پێیان دەڵێ؛ عەموودی كارەبا دروستكراوە بۆ ڕووناكیی شارەكە.
بەڵام ئیشی ڕاستەوخۆی نووسەر ئەمانە نییە، ئیشی نووسەر ئەوەیە چیرۆك و ڕۆمان و ئەدەبیاتی داهێنەرانە بخوڵقێنێ، وەكو "شەهرەزاد" چیرۆك بچنێ و لە خەڵكەوەی بپێچێ و دووریان بخاتەوە لە بەڵا...

**دانا فایەق:** ئێوە نووسەرێكن ڕەگێكی قووڵتان لە ناو وڵاتەكەتاندا هەیە و زۆرینەی خوێنەرەكانتان لەوێن. ئێستا كە ئاوارەن و دوور كەوتوونەتەوە لەوان، ئەو دوورییە و نەبوونی پەیوەندی و بەركەوتنی ڕاستەوخۆ لەگەڵیان، چ كاریگەرییەكی كردووەتە سەر خۆتان و كارەكانتان؟

**عەباس مەعرووفی:** نووسەر دار نییە كە سێبەرەكەی لەسەر زەوییەكی تر بێت. نووسەر ئینسانە و ئینسانیش ڕیشەی لەو شوێنەدایە، كە لێی لەدایك بووە. یەكەم شت كە دوای بیستنی ناوی بەریتانیا بە بیرمدا دێت، "ویلیام شەكسپیر"ە. بۆ بترسم لەوەی كە لە هەركوێیەكی ئەم دونیایەدا بژیم؟ لە هەر خانوویەك بم، پەنجەرەكەم ڕووەو خانوو و گەڕەكی خۆم كراوەیە. ئەو كاتەی "سەمفۆنیای مردووەكان" بڵاو بووەوە، تەمەنم سی ساڵ بوو، لە گفتوگۆیەكدا لەگەڵ "ئیسماعیل جەمشیدی" بۆ گۆڤاری "ئارمان" وتم: من سەرەتا دەبێ لە خانووی خۆمەوە گەشە بكەم و بناسرێم، دواتر لە گەڕەكەكەم، ئینجا ناوچەكە. پێم خۆشە بابەتەكانم لە وڵاتانی دراوسێم وەربگێڕدرێن و بڵاو ببنەوە. ئەوكاتە بە سەرنج و پشتگیریی ئەوانەوە دەتوانم بڕۆم بۆ ئەوروپا و ئەمریكا و وڵات و زمانەكانی تر... مەگەر دەكرێ نووسەر لە ماڵ و گەڕەكی خۆی نەناسرابێت و هاوكات جیهانی بێت؟
زۆر نووسەری گەنج دەناسم كە تیراژی كتێبەكانیان ناگاتە "هەزار" دانە، پەل دەكوتن و هەوڵ دەدەن كارەكانیان بە زمانی ئینگلیزی و فەرەنسی و ئەڵمانی وەربگێڕدرێن. بۆ؟ سوودی ئەمە چییە؟ یەكێكیان دەیوت: "ئەم خەڵكە خوێنەر نین، دەبێ چاویان لێبپۆشین و خۆمان بە جیهان بگەیەنین" وتم: "سەیرە! چاو لە خەڵكەكەی خۆت بپۆشیت و چاوەڕێش بیت دونیا تۆ ببینێ!" ناكرێ... جگە لە چەند نموونەیەكی دەگمەن كە نووسەر بە هۆی بارودۆخی سیاسییەوە جیهانی بوون، وا باوە سەرەتا








ئیمزاکەی لە ماڵ و گەڕەکی خۆی بپاریزێ. دونیا دیوارێکە، نووسەر شوێنپەنجەی خۆی لەسەر دادەنێت و تێدەپەڕێ. لە نێوان ئەم شوێنپەنجانەدا چ مرەکەبێك بەکار بێنێ بۆ ئەوەی زەمەن و تۆز و سەرما و ئاگر نەیسڕێتەوە؟ کارێکی قورس، بەڵام شیرینە. هەندێجار پێویست دەکات پەنجەی بکات بە ناو فرمێسك و خوێنی خۆیدا و بیکێشێ بە دیوارەکەدا. مرەکەبی فرمێسك و خوێن هەرگیز کاڵ نابێتەوە.

**دانا فایەق:** ئاغای مەعرووفی ئێوە دەتانەوێ نووسەرێکی جیهانی بن یاخود ئێرانی؟ لەگەڵ ئەوەی زۆربەی کارەکانت وەرگێڕدراونەتە سەر چەندین زمان و خوێنەری باشیشیان بووە، هەروەها کۆمەڵێ خەڵاتی جیهانیت پێبەخشراوە، کەچی هەندێجار وەکو نووسەرێکی ئێرانیی ناسیونالیست دەردەکەویت و قسە دەکەیت! پێت وا نییە پێویستە نووسەر ئەو سنوورانە تێپەڕێنی بۆ ئەوەی ببێ بە نووسەرێکی جیهانی؟

**عەباس مەعرووفی:** نیشتمان دایکی مرۆڤە. ئەمەوێت دەستم لە دەستی دایکمدا بێت بۆ ئەوەی لەم دونیا بێسەروبەرەیەدا ون نەبم. نامەوێ خۆم ون بکەم. دەمەوێ ئەگەر کەسێك بە دوامدا گەڕا لە باوەشی دایکمدا بمدۆزێتەوە. ئەمە ناسیۆنالیزمە؟ نازانم. من نووسەرێکی ئێرانیم.

لە ئەڵمانیا بە بۆنەی ڕۆمانەکانمەوە خەڵاتی ئەدەبیی گەورەم وەرگرتووە. شوێنێکی پتەوم بۆ خۆم دروست کردووە و کتێبەکانم بۆ کۆمەڵێ زمانی دیکە وەرگێڕدراون، وەکو تورکی و چەندین جاریش کوردی، بەڵام وتوومە، نامەوێ خۆم ون بکەم.

**دانا فایەق:** هەرچەندە ئەدەبیاتی فارسی مێژوویەکی دێرینی هەیە و بەراورد بە وڵاتانی دەوروبەر ئاستێکی باڵاتریشی هەیە، بەڵام تا ئێستا ئەو ئەدەبیاتە وەکو پێویست نەیتوانیووە بناسرێ و جێی خۆی بکاتەوە لە ئەدەبیاتی جیهانیدا، دیارە مەبەستمان ئەدەبیاتی هاوچەرخی فارسە. ئێوە ئەمە بۆ چی دەگەڕێننەوە؟

**عەباس مەعرووفی:** جیهانیبوون پێویستی بە سیستەمێکی سیاسیی ئاقڵ و بەهێزە. سیستەمێك کە پشتگیری لە

بونیادنەرانی کولتوور بکات، نەك لە ئەدەبیات و هونەر و کتێب و فیلم و موزیك بترسێ. بۆ دەبێ سالآنی گەنجێتی و داهێنانم لە ڕاڕەوەکانی وەزارەتی زانیاری بسووڕێمەوە و دواتر بۆم دەرکەوێت "سەعید ئیمامی" و پرۆژەی "کوشتنی زنجیرەیی"ی ددانم لێ تیژ دەکەنەوە؟

بۆ دەبێ لە کاتی لێپرسینەوەدا بڵێم: "سورمێلینا" خەیاڵ و خەونی منە و فلاّن خانم نییە، کە ئەتانەوێ سیناریۆکەیم بۆ بنووسن؟ بۆ دەتانەوێ دەستدرێژی بکەنە سەر خەونەکانم؟

جیهانیبوون پێویستی بە سیستەمێکی سیاسییە، کە متمانەی بە خۆی و نەمریی خۆی هەبێت، نەك ڕوخێنەرانی پەیکەر و کتێب و نووسەر و شێوەکاری و هونەر. سیستەمێك داوا لە نووسەرانی بکات کۆمەڵگە بخەنە بۆتەی ڕەخنەوە، بەوێنەی بکەن، ڕووناکی بخەنە قوولاّیی تاریکییەکانی، نەك بە نێو تێکستەکانی ئێمەدا بگەڕێت بۆ ئەوەی بزانێت کوێی بخاتە بەر مەقسەڵەی تیاچوون.

من و کەسانی چارەڕەشی وەکو من، دەبێ نیوەی هێز و وزەمان بۆ پووچەڵکردنەوەی پیلانەکان دابنێین، ئەوسا دەست بکەین بە نووسین. لە پاڵ ئەمانەدا خەمی مووچە، خەمی بلاّونەبوونەوەی کتێبەکانمان لە ولاّتی خۆماندا، خەمی نەدانی مۆڵەتی بلاّوکردنەوە و هەزار خەمی تر. ئەو خەمانەی کە چیتر خەم نین، بەڵکو بوون بە حوزن.

هەڵبەت؛ دەقی ئەدەبیی والاّ هاوارێکی پێچراوەیە لە ئاسمان، ڕۆژێ لە ڕۆژان هەر بە گوێی خەڵکانی تر دەگات، بەلاّم درەنگتر. ئێمەش ڕاهاتووین بەو دواکەوتنە. ڕۆمانێکی من ٢٦ ساڵی خایاند تا لە ئێران بلاّو کرایەوە! کاتێ نووسینی ڕۆمانەکە تەمەنم ٢٦ ساڵ بوو و کاتی بلاّوبوونەوەی ٥٢ ساڵ! خەمناك نییە؟



**دانا فایەق:** تۆ هاتی بۆ ولاّتی ئەڵمانیا کە خاوەنی چەندین گەورە نووسەر و فەیلەسووف و بیرمەند و قوتابخانەی ئەدەبی و فیکرییە، لە ناو ئەو پاشخانە گەورە و دەوڵەمەندەی فیکر و نووسیندا چۆن دەتوانی ون نەبیت و جێی خۆت بکەیتەوە؟ یان لەو باوەڕەدای بتوانی جێی خۆت بکەیتەوە؟

**عەباس مەعرووفی:** من یەکەم ئێرانیم کە میوانی "ماڵی هانریش بۆل" بووم، یەك ساڵیش بەڕێوەبەری ئەوێ بووم. پێنج کتێب و پتر لە هەشتا بابەتم لە گۆڤار و




کتێبەکانی ئانتۆلۆژیا و ژمارەیەکی زۆر گفتوگۆم بڵاو بوونەتەوە.
دوو شانۆشم بە زمانی ئەڵمانی نمایش کراوە و ئیتر... بیرم نەماوە!
لە ئەڵمانیا فێر بووم پابەندی کات بم، هەرگیز درۆ نەکەم، دەمامکم نەبێ، خۆم بم. لە ساتەکانم بە باشی کەڵك وەربگرم و چێژیان لێببینم، خۆمم خۆش بوێت و هاوکات ئامانجە جوانەکانی کولتوورەکەم نیشانی هاورێ ئەڵمانییەکانم بدەم. هاورێی زۆر باشم هەیە و ئیتر هەر ئەم شتانە!!!
ساڵانێکە لە شەقامی "کانت"ی بەرلین دەژیم و کار دەکەم، شەقامەکانی دەوروبەرم بە ناوی فەیلەسووفە ئەڵمانییەکانەوە ناو نراون. ئەگەر کەسێکی ئازیزم سەردانم بکات، دەیبەم بۆ گۆرستانەکەی تەنیشت ماڵی "برتۆلت برێشت" و لە ناو ئەم رۆخسارە هەمیشە زیندووانەدا دەیگەرێنم تا لێوی بە بزە بگەشێتەوە.
هەروەها دەخوێنمەوە، لەگەڵ دراوسێکانم هاورێیەتی دەکەم، جلوبەرگی پاك و پوخت لەبەر دەکەم، سەرنجی رەفتارەکان دەدەم و هێشتا دەتوانم لە مناڵێکی چوارساڵانەوە شت فێر ببم. هێشتا دەتوانم لە قووڵایی دڵەوە بگریم. هەموو هەفتەیەك فیلمێك دەبینم، رۆژانە سەعاتێك پیاسە دەکەم و هەزار کاری تریش...
رەنگە لە رۆمانەکانی "فەرەیدوون سێ کورێ هەبوو" و "تماما مخصوص"دا بۆتان دەرکەوێت چۆن وڵاتی ئەڵمانیام ناسیووە. هەرشتێك نیگای نامۆی من هەڵیگرتبێ، لە رۆمانەکانمدا هەیە.

**دانا فایەق:** پەیوەندیی ئێوە لەگەڵ چیرۆکنووسی ناوداری ئێران "هوشەنگ گوڵشیری" چۆن بوو؟ ئەو چ کاریگەرییەکی لەسەر ئەدەبیاتی ئێوە هەبووە و هیچ کاتێك ویستووتانە وەکو ئەو بنووسن؟
**عەباس مەعرووفی:** "هوشەنگ گوڵشیری" بەشێکە لە ژیانی من، ٢٢ ساڵ هاورێیەتی و سەفەر و کۆمەڵێ چیرۆکی تر... سەرەتا مامۆستام بوو، دوایی بووین بە هاورێ، پاشان هاوکار و پاشتریش زۆرجار هاوسەفەر. ساڵی ١٩٩٦ من و گوڵشیری بە هاوبەشی خەڵاتی "هێڵمان هامت"مان پێبەخشرا. مرۆڤەکان بەم شێوەیە دەبن بە مێژووی ژیانی یەکتری. گوڵشیری ٢٢ ساڵ لە من گەورەتر بوو.

من هەرگیز هەوڵم نەداوە وەکو کەسێکی تر بنووسم. بەردەوام ویستوومە خۆم بم. مەگەر نووسینەکانم چ عەیبیان هەیە، تا بمەوێ وەکو کەسانی تر بنووسم؟

**دانا فایەق:** ئێوە ڕۆمانی "تماما مخصوص"تان نووسی، چاپتان کرد و بڵاوتان کردەوە، بەڵام دواتر دەستکاریتان کرد، جارێکی دی چاپ و بڵاوتان کردەوە و چاپی پێشووتان کۆ کردەوە! ئایا نووسەر بۆی هەیە دوای بڵاوبوونەوەی کارەکەی، جارێکی دی دەستکاریی بکات و سەرلەنوێ چاپ و بڵاوی بکاتەوە؟ مەگەر ناگوترێ نووسین تا ئەو کاتە موڵکی نووسەرە، کە بڵاو نەبووەتەوە، دوای بڵاوبوونەوە ئەبێت بە موڵکی خوێنەر؟

**عەباس مەعرووفی:** هیچ نووسەرێك تا ئێستا کەرێتیی وای نەکردووە! کاتێك کتێبەکە بڵاو بووەوە، لە بارودۆخێکی دەروونیی زۆر خراپدا بووم و هەموو شەوێك دەستکاریم دەکرد، شەوێکیان خەونێکم بینی و بۆ بەیانییەکەی دەستم بە نووسینی ڕۆمانەکە کردەوە. شەش مانگ بەردەوام کارم تێدا کرد و لە لاپەڕەی ٧٧ەوە گۆڕیم. ئێستا زۆرم خۆشئەوێ، باجەکەشم داوە. ئەوەی یەکەمم کۆ کردەوە و هەموویم لەناو برد. هەرکەسێك ئەوەی پێشووی بهێنایەتەوە، یەکێکی تازەم پێشکەشی دەکرد. هەر لەبەر ئەم هەڵە و پەلەکردنە، ڕۆمانەکەم بە خۆڕایی لەسەر سایتەکەم داناوە، بۆ ئەوەی هەموو کەسێك بتوانێ بیخوێنێتەوە.

بەم کارانە ویستم داوای لێبووردن لە خوێنەرەکانم بکەم و پێیان بڵێم، ئەمە کارێکی زۆر خراپە وەختێ کتێبێك چاپ بوو، نووسەرەکەی نوسخەیەکی تازەی لێ بڵاو بکاتەوە.





**دانا فایەق:** ئێوە نووسەرێکی دیارن لە بواری چیرۆك و ڕۆماندا، بەڵام لە هەمان کاتدا جارجارە "شیعر"یش دەنووسن. ئەمەتان بۆ ئەوەیە وەکو شاعیریش بناسرێن و ناوبانگتان هەبێ؟

**عەباس مەعرووفی:** تا ئێستا نەمبینیووە کەسێك لەبەر ئەوەی شیعر دەڵێت، لە نووسەری دەربکرێ! بەڵام گەلێك شاعیری ناسراوم بینیوون کە ڕۆمانی خراپ و لاوازیان نووسیووە.

خۆ مرۆڤ ئەم نازناوانە بە خۆی نادات، بەڵکو خەڵك پێی دەبەخشێ. دەتوانم بڵێم من تا ئێستا هەرچییەکم نووسیووە، بە دڵ نووسیوومە و هەر نووسینێکم پارچەیەکە




لە دڵم.

هەرگیز بیر لە ناو و ناوبانگ ناکەمەوە، هەرگیز. هەمیشە بیر لە نووسین و یاری بە وشەکان دەکەمەوە. حەزم لە هەیەجانی نووسینە.

**دانا فایەق:** تا چەند ئاگاداری کوردەکانیت؟ ئاشنایەتیتان لەگەڵ نووسین و ئەدەبیاتی کوردیدا چۆنە؟

**عەباس مەعرووفی:** کورد... ئەوان کۆنترین نەتەوەی ئێرانن و هاوڕێی باشی منن. دوو ساڵ لەمەوبەر بڕیار بوو لەگەڵ بەختیار عەلی و شێرکۆ بێکەس لە هەولێر شەوێکی هاوبەشی ئەدەبی ساز بکەین، بەڵام بە داخەوە نەسازا.

بەختیار عەلی یەکێکە لە نووسەرە باشەکانی ناوچەکەی ئێمە. شێرکۆ بێکەس نازەنین و خۆشەویستم بوو، زۆر حەیف زوو چوو.

کاری نووسەرە کوردەکانی تریش دەخوێنمەوە. من کوردم خۆش دەوێت.



# موراد ئەعزەمی

## ڕۆمان ڕێک بەرهەمی مرۆڤی مۆدێرنە

یەکێکە نووسەر و ڕەخنەگرە دیارەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات و خەڵکی ئاوایی کانی سپی سەر بە شاری شنۆیە. چالاکیی جیددیی ئەدەبی هاوکات لەگەڵ دامەزراندنی سروە بە دەست ماموستا هێمنەوە دەست پێکرد. خۆی گووتەنی سەرەتا بە شیعر دەستی پێکردووە، پاشان خووی داوەتە چیرۆکنووسین. ئێستاش بەشی دەروونناسیی تەواو کردووە و لە بواری ڕەخنە و لێکۆڵینەوەی ئەدەبیدا خاوەنی کۆمەڵێك بەرهەمی جدییە، بەتایبەت لە بواری توێژینەوە و خوێندنەوە و ڕاڤەکردنی رۆماندا، لەم وتوێژەدا موراد ئەعزەمی قسە لەسەر هونەری ڕۆماننووسین دەکات وەك ژانرێکی نوێی ئەدەبی.



**ئیدریس عەلی:** لە چاو لقەکانی دیکەی ئەدەبدا ڕۆمان ژانرێکی تازەیە لە ناو کایەی ئەدەبیی ئێمەدا، سەرباری ئەمەش کۆمەڵێك هەوڵی لێرەولەوێمان هەیە و خاوەنی چەند بەرهەمێکین لە بواری ڕۆماننووسیندا.. بەگشتی، تۆ ئەو هەولانە چۆن هەڵدەسەنگێنیت؟

**موراد ئەعزەمی:** ڕۆمان نەك لە پانتایی ئەدەبی ئێمەدا، بەڵکو بە گشتی لە ئەدەبی جیهاندا ژانرێکی نوێیە. ڕۆمان ڕێك بەرهەمی مرۆڤی مۆدێرنە. واتا یەك لە دەرکەوتەکانی مۆدێرنیتە ئەم ژانرەیە، کە لە هەناوی ڕۆمانس و لەسەر دەستی سێروانتێس، سەری هەڵداوە، زۆر زوو و خێرا پەرەی سەند و بوو بە ژانری یەکەمی پانتایی ئەدەبی مۆدێرن. ئەو کاتەی دێکارت بانگەشەی ئەزموونی دووبارەی تاکەکەسییانەی ئەزموونەکانی کرد لەسەر دەستی ئاوەز و عەقڵی تاکەکان، دەقی ڕۆمان وەك بواری گێڕانەوەی ئەزموونەکانی ئەم تاکە سەبارەت بە چەمکەکان و ئەو وەڵامانەی خۆی پێی گەیشتوون و ئەو پرسیارانەی لە بەردەمی قوت بوونەتەوە، سەریهەڵدا. وەك کۆندرا دەڵێ، ئەوسا جیهان بوو بە ئەزموونگەیەك بۆ مرۆڤی پرابلێماتیك و کێشەدار، ڕۆمان ڕەنگدانەوەی ئەم جیهانەیە بەدەم داهێنان و کەشف و دۆزینەوەی پێناسە ونبووەکەی ئەم. لە سەدەی بیستدا بوو کە شەپۆلەکانی ئەم پێناسە و ڕوانگە نوێیە، ئەم دیاردە جوداوازە گەیشتە وڵات و کۆمەڵگای تەواو سوونەتیی کوردەواریش. ئەوەش یەك لە دژوازە سەیرەکانی مێژووی ئەدەبی کوردییە، کە دیاردەیەکی تەواو مۆدێرن، لە بەستێنی کۆمەڵگایەکی تەواو سوونەتیدا سەرهەڵدەدا. واتا لە کوردەواریدا، بە پێچەوانەی ڕۆژاوا و وڵاتانی پێشکەوتوو، ڕۆمان دەرەنجام و ئیدامەی کۆمەڵگایەکی مۆدێرن و سەرلێشێواوییەکانی مرۆڤی مۆدێرنی ناو ئەم کۆمەڵگایە نییە. ئاڕاستەی سەرهەڵدانی دیاردەکە لە کۆمەڵگاوە بۆ تاك نەبوو، بەڵکوو بە پێچەوانەوە، ئەوە هێندێك تاك بوون، کە دابڕاو و ڕەها لە ڕەوتی کۆمەڵگا، ڕوانگە و جیهانبینیان نوێ ببۆوە و بە ڕوانگەیەکی

نوێوە دەیانڕوانییە کۆمەڵگای سوونەتیی دەوروبەری. ئینجا بە ناسینی ڕۆمان وەك دەرفەتێك بۆ ئەزموونکردنەوەی تاکەکەسییانەی جیهان، دەستی دایە قەڵەم، ئەوە تاکەکان بوون کە دیاردەی مۆدێرنی ڕۆمانیان، لەبەرچاوی کۆمەڵگای سوونەتی ڕاگرت. ئەوەی کە بە درێژایی ئەم ساڵانە و لە "پێشمەرگە"ی ڕەحیمی قازییەوە، تاکو ئێستا، ڕۆمان بەردەوام بەرهەم هاتووە و تەنانەت ئاڵوگۆڕی زۆریشی بەسەردا هاتووە، ڕۆماننووسی باشیشمان هەبووە، حاشاهەڵنەگرە و نکۆڵیی لێناکرێت. بەڵام وەك باس کرا، ئەم تاکانە بەرهەمی کۆمەڵگا نەبوون، کە دواجار دەق بە پێی ئەزموونەکانیان لە کۆمەڵگا بخوڵقێنن. بەڵکو بەرهەمی ئاڵوگۆڕە فکرییەکانی خۆیان بوون، بە شوێنوەرگرتن لە جیهانی مۆدێرن، دەقی ڕۆمانیش بەرهەمی ئەزموونی تاکەکەسیی خۆیانە لەتەك چەمکەکان و دیاردە و تەنانەت دژوازییەکان. کەسانی وەك (ڕەحیمی قازی، عەرەب شەمۆ، حسێن عارف، شێرزاد حەسەن، بەختیار عەلی، مەولوود مەم، جەبار جەمال غەریب، فەرهاد پیرباڵ) و...، هەروەها (فەتاح ئەمیری، حسێن شێربەگی، عەتا نەهایی، سەیدقادر هیدایەتی) ئەو تاکە هەڵکەوتانەن، کە دیاردەی ڕۆمانیان بە پێی ئاڵوگۆڕە فکرییە تاکەکەسییەکانیان، بەبێ ئەوەی کۆمەڵگا ڕەوتی مۆدێرنبوون بە خۆیەوە ببینێت، خوڵقاندووە.

**ئیدریس عەلی:** کەسیتیی ڕۆماننووس، زیاد لە نووسەرانی بوارەکانی تر دەبیت خاوەنی ئاستێکی بەرزی ڕۆشنبیریی و ئاگاییەکی باشی لە فکری تازەی دنیا و هۆشیاریی بۆ ڕووداوەکانی چواردەوری خۆی هەبێت، بەڵام پێت وایە ڕۆماننووسانی ئێمە خاوەنی ئەم تایبەتمەندییانە بن؟

**موراد ئەعزەمی:** ڕۆمان، پتر لە هەر بوار و ژانرێکی تر، وەك بەرهەمی سەرەکیی مۆدێرنیتە دێتە ئەژمار. لە بەرهەمەکانی فکری ئەم قۆناغەش، ئەزموونی دووبارەی تاکەکەسییانەی کێشەکانی فکری بەشەریی، دۆزینەوەی سەربەخۆ و پشتئەستوور بە وزەی فکریی و زانیاریی تاکە بەرامبەر بە وەڵامی پرسە کۆن و ئەبەدییەکان. ژانری ڕۆمان بەستێن و بوارێکە بۆ ورووژان و تانوپۆی ئەو پرسانە، هاندانی بیر و زەینی مرۆڤی مۆدێرن بۆ تاقیکردنەوەی دیاردە و کێشە و کەڵکەڵەکان، گەیشتن بە وەڵامێکی تەواو





تاقانە و تاکەکەسییانە. جا بۆ ئەوەی نووسەرێك توانای خوڵقاندنی ئەو بەستێنە و هەستپێکردن و دۆزینەوە و بەڕەوایەتکردنی ئەو پرسانەی سەر بە چەمکەکانی سەرەکی و بنەڕەتی مرۆڤی هەبێت، سەرەتا پێویستە مرۆڤ بناسیت. ئاگاداری میکانیزمەکانی دەروونی مرۆڤ و مەعریفەناسی و شێوەی بیرکردنەوە و ڕوانین و ڕووبەڕووبوونەوەی بەرامبەر بە دیاردە و کێشە و ئاستەنگەکان بێت. خەم و داڵغە سەرەکییەکانی هەست پێبکات. بۆ ئەو ئەرکەش، هیچ ڕێگای نییە جگە لەوەی تا ئەو جێگەی پێویستە و بۆی دەلوێ، ئاگاداری زانستە مرۆییەکان بیت. ڕۆماننووس، پێویستە بەپێی ئەو ئەرکانەی باسمان کرد، تا ڕادەیەك ئاگاداری دەروونناسی، کۆمەڵناسی، مەعریفەناسی، فەلسەفە بێت و پسپۆڕی ئەدەبی ڕەواییش بێت. جگە لەمە، خوێنەری چالاکی دەقە ئەدەبییەکانی وڵات و جیهانیش بێت. جا ئەو چەند وزە و توانست و جیهانبینییەکی پتەویشی هەبوو، بۆی هەیە دەست بداتە قەڵەم و ڕەوایەتەکانی خۆی سەبارەت بە جیهان و مرۆڤمان بۆ بگێڕێتەوە. سەبارەت بە ئەوەی کە ئایا ڕۆماننووسانی ئێمە خاوەنی ئەم تایبەتمەندییانە هەن یان نا؟ بە بڕوای من ناکرێ بڵێین نا. لە بەر ئەوەی ئەو کەسەی توانیبێتی دەقێکی تا ڕادەیەك سەرکەوتووی ڕۆمان بخوڵقێنێت، دیارە تا ڕادەیەك خاوەنی تایبەتمەندییە گۆڕینەکانە. ناکرێ کەسێك مرۆڤ نەناسێت و ئاگاداری کێشە و پرسە سەرەکییەکانی نەبێت و جیهانبینییەکی قووڵیشی سەبارەت بە دنیا و دەوروبەر نەبێت، دەقێکی ڕەوایی لە گوێن ڕۆمان، ئەگەرچی لە ئاستێکی بەرزیشدا نەبێت، بخوڵقێنێت.

**ئیدریس عەلی:** ئەدەب توانای ئەوەی هەیە کارەسات و تراژیدیاکانی نەتەوە لە پرۆسەیەکی ئیبداعیدا تەوزیف بکات و تێکستی گەورە بخوڵقێنێت. بێگومان کوردیش لەو نەتەوانەیە، کە خاوەنی کارەسات و قوربانییەکی بێشومارە. پرسیارەکە ئەوەیە بۆچی ئەدیب و نووسەرانی ئێمە کەمتر ئاوڕیان لەوە داوەتەوە ئەو کارەساتانە لە تێکستەکانیاندا تەوزیف بکەن؟

**موراد ئەعزەمی:** هۆی ئەم دیاردەیە دەتوانێت زۆر شت بێت. زۆر هۆش تا ئێستا لە لایەن زۆرێك لە ڕۆشنبیرانەوە باس کراون. من لێرەدا هەوڵ دەدەم ئاماژە بە دوو هۆیان بکەم، کە تا ئێستا یان ئاوڕیان لێنەدراوەتەوە، یان زۆر کەم باسیان لێوە کراوە. سەرەتا ئاماژە بە پرۆسەیەك دەکەم، کە ناوی لێدەنێین (مەوداگرتن). هەر جۆرە دیاردەیەك، بە دوو شێوە بەر تیشکی نیگا دەکەوێت. یەکەم: بە شێوەی پاژبینانە، واتا هەموو وردەکاری و ورکەپاژەکانی دیاردەکە ببینرێت. دیارە بۆ ئەم شێوەڕوانینە، پێویستە دیاردەکە زۆر لێمان دوور نەکەوێتەوە و تا بۆمان بلوێ، لێمان نزیك بخرێتەوە، ئەوە ئەرکی وردبینیمان باشتر سەر دەگریت. دووهەم: شێوەڕوانینی گشتبینانەیە. واتا هەموو دیاردەیەك یەکجێ وەبەر تیشکی نیگامان بکەوێت. بۆ ئەو مەبەستە پێویستە دیاردەکە تا مەوایەکی دیاریکراو لێمان دوور بخرێتەوە، تا وەکو بە تەواوی یا تا ئەو جێگەی بلوێ، بە تەواوی بکەوێتە ناو بازنەی بینینمانەوە. ئەو شێوە پۆلێنە سەبارەت بە بینین دیاردە مێژووییەکانیش دەگرێتەوە. واتا کاتێ بمانەوێ دیاردەیەکی مێژوویی بە وردی ببینین و شەنوکەوی بکەین، واتا ئەوەی بۆمان گرینگە گشتی ئەو دیاردەیە و بەستێنی ڕوودانی و پێوەندی ئەم لەتەك دیاردەکانی بەر لە خۆی و دوای ئەو نییە، بەڵکو تەتەڵەی پاژبەپاژی دیاردەکە مەبەستی سەرەکیی سەرنجمانە، ئەو دەم باشتر وایە تا ئەو جێگایەی بۆمان بلوێ، هەر گەرماوگەرم و دوابەدوای ڕوودانی، دیاردەکە وەبەر تیشکی نیگامان بخەین و باسی لێوە بکەین. ئەوە هەمان شێوە ڕوانینە پاژبینانەکەی گۆڕینە. کەچی ئەگەر بە پێچەوانەوە، پتر گشتی دیاردەکە و بەستێنی تایبەتی ڕوودانی و پێوەندی و کارلێکی ئەم لەتەك دیاردە و ڕووداوەکانی بەر لە خۆی و دوای خۆی، شوێن و جێپەنجەی ئەم لە سەر ڕەوتی فکریی و مێژوویی و بوارەکانی تری بەشەری، مەبەستی سەرەکیی ڕوانینەکەمان بێت، ئەوە پێویستە تا مەودایەکی خۆشدەس ڕابگرین، تاوەکو دیاردەکە بە تەواوی و بە دیاردەکانی دەوروبەریشییەوە بکەوێتە ناو بازنەی ڕوانینمانەوە. دەقی ڕەوایی لە گوێن ڕۆمان، بۆی هەیە بە هەردوو شێوە ڕوانینەوە بپەرژێتە گێڕانەوەی تایبەتی دیاردەکە، بەڵام لەبەر ئەوەی شێوە ڕوانینی گشتبینانە بەستێنی ڕوودانی ئەم و دیاردەکانی دەورووبەریشی مەبەستە، بۆیەش پتر ئەوە سەرنجی نووسەرانی ڕۆمانی بە خۆوە خەریك کردووە. چونکە کەرەسە و ئێلێمانی لەئەژمارنەهاتوو لەبەر دەستی نووسەر دادەنێت، جوودا لەمە، بەو مەوداتێکەوتنە، مەودایەکیش





بۆ خەیاڵ و ئوستوورە بەرهەم دێت، کە خوازراوترین کەرەسەن لە لایەن نووسەرانەوە بۆ دارشتنی ڕۆمان. جا بۆیە لەوانەیە ڕۆماننووسان هێشتا هەستیان بەوە نەکردبێت کە ئەو مەودایە پەیدا بووبێت بۆ ڕوانینێکی گشتبینانەی خەیاڵبزوێنی ئوستوورەسازێن.
جگە لەم هۆیە، هۆیەکی دی دەگەڕێتەوە بۆ یەك لە پێوەندییەکانی ڕۆمان و مێژوو لەگەڵ یەك، کە دەڵێ: ڕۆمان، شوێنە سپی بە جێماو و نەدیتراو و نەگوتراوەکانی مێژوو دەخاتە بەر تیشکی خۆی و دەیگێڕێتەوە. بە داخەوە، ئەوەی بەر لە ڕۆمان و بە گشتی ئەدەب، ئەگەر نەڵێین ون، گەلێ کاڵ و بێجووڵەیە لە کۆمەڵگای کوردیدا، نووسینەوە و تۆمارکردنەوەی زانستییانەی مێژووە. زۆر یەك لە ڕووداو و بەسەرهات و کارەسات و دیاردەی گرینگی مێژوویی کورد هێشتاش نەبوونەتە دەق و تۆمار نەکراون و نەخوێنراونەتەوە. بۆ نموونە هەر بەرچاوترینیان، ئەنفال و هەڵەبجە، کە یەك لە جەرگبڕترین کارەساتەکانی بەشەرین، هێشتا نە بە شێوەی پاژبینانە و نە بە گشتبینییەوە ئاکادێمیکییانە نەخوێنراونەتەوە، نەبوونەتە دەق، تاوەکو ڕۆمان بێتە مەیدان و ئەنگوست بۆ بۆشاییەکان ڕادێریت و شوێنە سپی و فەرامۆش و بایکۆتکراوەکان، بە شێوازی تایبەت بە خۆی بگێڕێتەوە. بە کورتی هێشتا مێژوو بەشەکانی خۆی دەستنیشان و هەڵنەبژاردووە، تاوەکو دوابەدوای ئەمدا ڕۆمان شوێنە جێماوەکانی ئەم خەرمانە کۆ بکاتەوە و بیکات بە دەقی ڕەوایی.

**ئیدریس عەلی:** دووجۆر تێڕوانین هەیە لەسەر بوون و نەبوونی ڕەخنەی ئەدەبی، هەندێك پێیان وایە ڕەخنە لە غیابێکی ترسناکدا دەژی و هەشن پێیان وایە ڕەخنە کەوتووەتە سەرپێی خۆی، دەمانەوێت بۆچوونی سێهەم لە تۆوە ببیستین و بزانین سەرنجی تۆ لەم بارەوە چییە؟

**موراد ئەعزەمی:** ڕەخنە هەیە و نیشە. هەر لە قۆناغی کلاسیکەوە بەر لە تەوژمەکانی مۆدێرنیتە، ڕەخنە کاری خۆی دەکرد و لە جۆڵەدا بوو. ئێستاش

مەمرەومەژی خەریکی خوێندنەوەی دەقەکانە. بەڵام قەت نەبووە کە پێبەپێی دەقە ئەدەبییەکان هەڵسووڕێت و لە ڕەوتی بەرهەمهێنان و بڵاوبوونەوەی دەقەکان زۆر دوا نەکەوێت. ئێستا بەتایبەت لە باشوور، مانگانە بە دەیان دەقی شیعرو کۆچیرۆك و ڕۆمان دەخوڵقێن و بڵاو دەبنەوە. بە سەدان دەقی تاك لە گۆڤارەکاندا دەکەونە بەردەستی خوێنەران، بە هەزاران دەق لە دنیای خێرای مەجازیدا ئاپلۆد دەکرێن. ئاخۆ ڕەخنە چەندە دەرەقەتی ئەو تەوژمە دێت؟ لە سەدا چەندی ئەو دەقانە دەخوێنرێتەوە؟ مانگانە لە بەرامبەر ئەو دەقە ئەدەبییانەدا چەند دەقی ڕەخنەیی بڵاو دەبێتەوە؟ بەبێ گوتن دیارە وەڵامی ئەو پرسیارانە ئەژمارێکی زۆر نزمترە لە قەدەر دەقە ئەدەبییەکان. ئینجا بۆ وایە؟ هۆی کەسادبوونی بازاڕی ڕەخنە چییە؟ لە کۆی لێزگەی ئەو هۆیانەی بلوێ بۆ ئەم خەسارە باسیان لێوە بکرێ، من قامك دەخەمە سەر دوو هۆیان. یەکیان دەگەڕێتەوە بۆ دەروونناسیی کۆمەڵ و کۆمەڵناسیی کوردەواری، ئەوی تریان لە هەناوی دەروونناسیی تاکی کوردەوە هەڵدەقوڵێت.

ڕەخنە و گوتاری سەر بەم دیاردەیە بەرهەمی ڕەوتێکی فکری و گەشەی بیر و ئەندێشەیە لە کۆمەڵدا، کە بۆ ئەوەی بگات بەم قۆناغە، ناچارە ئەم ڕەوتە تێپەڕێنیت. لە قۆناغی سەرەتایی بیری بەرهەست (عەینی)یەوە تاوەکو تەفەکوری چەند لایەنەی فرەتوێژی دیالێکتیك و وەرگرتن و تێکبەزاندنی بیرە لێکدژەکان و بەرهەمهێنانەوەی ڕوانگە و بۆچوونێکی سێهەم، کە نە ئەوە و نە ئەم و هەم ئەوە و هەم ئەم، چەندین قۆناغی فکریی تر هەن، کە یەك بە یەك پێویستە تێیانپەڕێنیت، تاوەکو بەو ڕادەیە لە گەشە و ڕاگەیشتن بگات کە نەك دوو، کە چەندین بیروڕای جیاواز و دژواز سەبارەت بە دیاردە و چەمکێك وەربگریت و تاووتوێیان بکات. ئەو دەم دەکرێ بڵێین کە کۆمەڵگا گەیشتۆتە عەقڵانییەتی ڕەخنەیی. بە وردبوونەوە و تاوتوێکردنەوەی کۆمەڵگای ئێستای کوردەواری، بەو حەقیقەتە تاڵە دەگەین، کە هێشتا گەلێ زووە بۆ گەیشتن بەم قۆناغە، چاوەڕوانیی گۆڕانی گوتارێکی پتەوی ڕەخنەیی لە هەناوی کۆمەڵگاوە چەندێك ئاواتێکە بۆ بەرەکانی داهاتوو. بۆیەش ئەوەی هەیە و ئەو دەقە ڕەخنەییانەی بەرهەم دێن، بەرهەمی گەشەی فکریی کۆمەڵگا بەگشتی نین، بەڵکو بەرهەمی تاکی مۆدێرنی یاخی و خاوەن عەقڵانییەتێکی پلۆرالیستیکی ڕەخنەییە، کە لە هەناوی ئەم کۆمەڵگا خاوەن بیری ئۆستوورەییەوە سەریهەڵداوە. بۆیەش





دەڵێم ڕەخنە لە ئێستای کۆمەڵگای کوردەواریدا هەیە، چونکە ئەو تاکانە هەن و خەریکی چالاکیی فکری و ڕەخنەیین. کە دەشڵێم نییە، لە بەر ئەوەی جووڵەیەك و شەپۆلێك و بەرەیەکی خاوەن عەقڵانییەتی ڕەخنەیی بە شێوەی سیستەماتیك هێشتا بەرهەم نەهاتووە.




# ئیمپراتۆری شیعر مالاوا

کۆمەڵە پەیام، وتار و شیعری کوردی و فارسی
بۆ چلەی ماتەمینی شێرکۆ بێکەس

کۆکردنەوە و ئامادەکردنی
شەریف فەلاح

# مەنسوور کووشان

**سازدان و ئامادەکردنی بە فارسی و وەرگێڕانی بۆ کوردی: بابەک سەحرانەوەرد/ تاران**

مەنسور کووشان، نووسەر و شاعیر، لەدایکبووی ساڵی **1948** لە شاری ئیسفەهانە. لە کۆتایی چلەکاندا لە بواری چیرۆك و شانۆ و دواتر ڕۆمان، تا ئێستا چل و پێنج ساڵی ڕەبەقە کە لەم گۆڕەپانە بێسنوورەدا بەردەوامە، زۆر شێلگیرانە بەکار بووە و زێدە لە پەنجا بەرهەمی بەپێزوهێزی ئاڕاستەی بەردەنگە جیددییەکانی تەوەری ئەدەب کردووە. ئەم نووسەرەیش وەك چەند رۆشنبیری هاوچەرخ میناکی عەبباس مەعرووفی بە هۆی کێشەی سیاسی، ناچارەکی نیشتمانی جێهێشت و نزیکەی بیست ساڵ لەگەڵ خێزانەکەی لە مەنفا ژیانی

بردە سەر. بەڵام لە تاراوگە دەسەوەسان نەما و لە مەیدانی ئافراندن هەرە چالاکڤان خۆی دەرخست، بە جۆرێك کە لە ساڵی **2010** خەلاتی گەورەی "ئازادیی پەیڤ"ی ئۆسیسکیی بەدەست هێنا و لەولایشەوە بە جەختێکی زۆرەوە بە بنیاتنەری سەرەکیی "یانەی ئازادی پەیڤ"یش پێناسە کرا و بۆ گشت ئەم کارەیلە، ناوەکەی لە مەنفا پتر لە هەر زەمەنێکی تر زڕا. ئەم رووناکبیرە، تا ئێستا دەیان دەقی شانۆیی کورت و درێژ، حەوت رۆمان، پێنج کۆمەڵەچیرۆك، هەشت کۆمەڵە شیعر، پتر لە دوانزە بەرهەمی توێژینەوەیی، دەیان وتاری چاندیی، ڕامیاری و لێکۆڵینەوەیی بڵاو بووەتەوە. هێزی داهێنەرەتی و ئاگایاری لە شێوە مۆدێرن و ئیمرۆییەکان، بەشێکن لە شێوە تایبەتییەکانی ئەم نووسەرە ناوازەیە.

شایانی باسە ئەم دیمانە کە چەندین لایەنی جیاجیا دەگرێتەوە، بۆ دوو ساڵ لەمەوبەر دەگەڕێتەوە، کە هێشتا ئەم نووسەرە لەباری تەندروستییەوە لەشساغ بوو، بەڵام بەداخەوە دەرەنجام لە ناوەڕاستی ساڵی **2014** بە هۆی نەخۆشیی شێرپەنجە، لە مەنفا و دوورەوڵاتیدا و لە تەمەنی **66** ساڵی کۆچی دوایی کرد و بۆ هەمیشە خامۆش بوو. ڕۆحی شاد بێت.

**بابەک سەحرانەوەرد:** مامۆستا، وێڕای سپاس لە ئێوە، وەك دەستپێك پێم باشترە بەگشتی باسی سەرەتای ڕەوتی نووسین و چۆنییەتی ئەو بارودۆخەی کە تێیدا ژیاون، بکەن.

**مەنسوور کووشان:** هەڵبەت باشترین ناسنامەی هەر نووسەرێك، بەرهەمگەلی ئەو نووسەرەن. هیچ گێڕانەوەیەك چڕوپڕتر و تەواوکەرتر لە دەقەکانی ئەو دەقنووسە ناتوانێت و ئەو بڕستەی نییە تایبەتمەندییە نەفسی، فیکری، هەستی و نەستی و هەڵوێستەکانی دەربڕێت و دەریخات. چوونکا هەروا کە هەر مرۆڤ لە هەر قۆناغێکی ژیانیدا خووخدەیەکی تایبەت بەو تافەی گرتووە، بەرهەمی هەر تافێکیش وەك ئاوێنەیەکە لەو نووسەرە و بەرهەمەکەی تەنها سیمای ئەو تافەی پێ نیشان دەدات و لە کۆتاییدا لە سەرجەم ئەمانەیە، کە گشت کەسێتیی ئەو نووسەرە بیچم دەگرێت و دێتە بەرچاومان. لەمەیش بترازێت باس لە چلوسێ ساڵ نووسین و داهێنان نە لە تاقەتی خوێنەرانی ئەم هەڤپەیڤینەدایە و نە لە تاقەتی خۆیشمدا.





چوونکا بە هۆی چارەنووسێکی لەپێشدانراو بۆ نووسەرێکی پرۆفیشناڵ، بەتایبەت لە وڵاتانێك بە ناوی جیهانی سێهەم یان لە حاڵی ئاوەدانی و گۆڕانکاریدا، منیش ناچارەکی لە گشت بوارە وێژەیی و هونەرییەکان چالاکەڤان بووم. دۆسیە وێژەوانییەکەی من زێتر لە پەنجا پەرتووکی لە ئامێز گرتووە. لە قەڵەمڕەوی هەڵبەست، لە گۆڕەپانی بەرینی کورتەچیرۆك، ڕۆمان، شانۆ، سیناریۆ، ڕەخنە و توێژینەوە، گەلێك چالاك بووم و تا ئێستا دەیان وتارم لە بواری ڕۆژنامەوانی بە چاپ گەیاندووە و بۆ ماوەیەك سەرنووسەری چەند گۆڤاری ئەدەبیی بووم و بەگشتی چالاکیگەلی هەرە زۆرم لە ئەستۆ گرتووە کە بە هەوراز و نشێوگەلی سەیروسەمەرە ئاوێتە بوون و ئەزموونی شیرین و تاڵی زۆریان لەخۆ بەجێ هێشتووە، کە هیوادارم کاتێك بڕەخسێت و ڕۆژێك بێت تا بتوانم هەموویان هەر لە سەرەتاوە تا ئێستا بنووسمەوە. لەبەر ئەوە کە ئاکام و ئەنجامی ئەم ئەزموونگەلە، بۆ خوێنەر و ڕوودەمەکانم بەتایبەت بۆ نەوەی گەنج تاوتۆ بکەم.

**بابەک سەحرانەوەرد:** بە بڕوای ئێوە دووری لە ئێران تەئسیر لەسەر جۆری نووسین دانانێت؟ مەبەستم ئەوەیە کە جۆرە دابڕاوی و پچڕاوییەك لە نووسیندا بەدی نایەت؟

**مەنسوور کووشان:** دوورکەوتنەوە لە زاتی خۆیدا خراپ نییە، دوورکەوتنەوە لە خۆت و کولتوور و وڵاتی خۆت، نەك خراپ نییە، بەڵکو زۆریش بەنرخە. بەڵام دابڕاوی، لە هەردوو چەشنی خۆیدا کێشەگەلێکی زۆری لێدەبێتەوە، کە ئەگەر بە هۆشیارییەوە لغاو نەکرێن، تەئسیرێکی وێرانکەر لەسەر ڕەوتی نووسین بەجێ دەهێڵن. مەبەستم لە هەردوو جۆرەکە، دابڕاوی و دوورکەوتنەوە بە زۆرەملی لە یەك لا و بە ڕەزامەندی و بە دڵی خۆت لە لایەکی ترەوەیە. واتە جیاوازییەکی زۆر لە نێوان نووسەرێك هەیە کە ناچارەکی مەنفای بۆ ژیان هەڵبژاردووە، لەگەڵ ئەو کەسەی کە بە ڕەزامەندییەوە ڕێگەی هەندەرانی گرتۆتە بەر و دیارە هەر کاتێ پێی خۆش بێت، دەتوانێ

بۆ نیشتمانەکەی بگەڕێتەوە و زۆریش سەربەستە لەوەی کە بەرهەمەکانی بە زمانی زگماگی و بۆ هاوزمانەکانی خۆی بڵاو بکاتەوە.
نووسەری دوورخراوە، ئەگەر هۆشیار و ئاگادار نەبێت و تەکووزی و جەختی خۆی بو نووسین دوو ئەوەندە نەکات، ناتوانێت بەرهەمی بەپێز و هەرمانی لە خۆی بەجێ بهێڵێت. بە واتەیەکی دی، دوورکەوتنەوە لە نیشتمان و کولتووری خۆت، ئەگەر بە دابڕان و لێکترازانی پەیوەندیی خوێنەران هاوتا نەبێت، دەتوانێت زۆریش بەسوود و نرخ بێت. چونکە یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی تێڕوانین، دیارە، باش نووسین و دوورکەوتنەوەیە و یەکێك لە پێداویستییەکانی تێهزرین، تێکەڵبوون بە کولتووری گەلانی دیکەیە. واتە ئیمکانێکە کە لە واقیعدا تەنها لە دوورکەوتنەوەدا بە شیاوترین چەشن دەرخسێت. لە ئەنجامدا دەکرێ وەڵامی ئەم پرسیارە بە زاراوەی (ئاشنایی سڕینەوە)، یان نامۆکردن بدەینەوە، بەم مانایە کە پێداویستیی نووسین و ئافراندنی بەرهەمی بەپێز، بەدەسهێنانی تەکنیکی (ئاشنایی سڕینەوە)یە، کە فۆڕمالیستە ڕووسەکان لە بەرهەمگەلێکدا پەیدایان کرد، بەرهەمگەلێك کە بە ڕێکەوت، زۆربەیان لە دەرەوەی نیشتمانەکەی خۆیان نووسرابوون.

**بابەک سەحرانەوەرد:** پێم خۆشە لە نووسەر و شاعیرە خۆشەویستەکانی خۆتان بۆمان بدوێن. چ کەسایەتیگەلێك بە چەشنی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لەسەر نووسینی ئێوە تەئسیریان بووە؟

**مەنسوور کووشان:** گشت شاعیر و نووسەر و نیگارکێشە مەزنەکان بە شێوەیەك لە شێوەکان لەسەر من کاریگەریی خۆیان داناوە. هەندێکیان بە چەشنێکی گشتی و چەند کەسێکیش بە شێوەی تایبەتی. بە ڕای من ئەم کاریگەرییە تەواو حاشاهەڵنەگرە. نووسەرێکی باش و شارەزا، لە هەموو چرکەساتگەلی ژیان، تەنانەت لە خەون و خەیاڵیشدا، بە دووی ڕاوکردنە. کەواتە، هەروا کە نێچیرڤان لە ڕاوەکانی بەهرەمەند دەبێت، نووسەریش لە دۆزینەوەی چرکە هەرمانی و ڕەسەنەکاندا لە بەرهەمگەلی خۆی بەهرە وەرئەگرێت. بڕێجار ئەم بەهرەوەرگرتنە، ڕاستەوخۆیە و بڕێجاریش ناڕاستەوخۆ و بڕێجاریش ئاگادارانەیە. نوسەرە ئاگادار و هۆشیارەکان لەم خاڵە ئاوڕ ئەدەنەوە و لە بەدواچوونەوەیەکی پەیتا پەیتا، دەرەنجام لەم تەئسیرە



گاهەزییە، یان ئاڵوگۆڕی بەسەردا دێنن یاکوو بەیەکجاری فەرامۆشی دەکەن.

**بابەک سەحرانەوەرد:** لە ڕووی دۆخی ئەم چەند ساڵەی ئێراندا، بارودۆخی ئەدەبیی ئەم وڵاتە چۆنچۆنی لێك دەدەنەوە؟

**مەنسوور کووشان:** هەر بەرهەمێك بۆ سەرکەوتن و پێشڕەوتی خۆی، پێویستی بە دۆخێکی شیاو، بڕشتدار و گونجاوە. هەروا کە لە نێوان گەندڵدا ناتوانین چاوەڕێ بین گوڵی دڵگەش و بۆنخۆش بڕوێت، نایشتوانین چاوەڕێ بین کە لە زەلکاو و گەنداوی تەواو ڕەشیی حکومەتی ئیسلامیی ئێران، ئەدەب و هونەر پێشکەوتنێکی شیاو بەخۆ ببینێت. هەڵبەت هەندێجار گوڵێك لە قەراغ و لەملاولا سەرهەڵئەدات، کە سەد مەخابن بە هۆی ئەم دۆخە نالەبارە، هەر زوو تووشی ژاکاوی و دڵمردوویی دەبێت.

**بابەک سەحرانەوەرد:** لە بیرمە چەن ساڵ لەمەوبەر چاوم بە وتەیەکی ڕۆماننووسێك کەوت کە وتبووی: « نووسەرانی ئێرانی ناتوانن خۆیان لە چەنبەری (هیدایەت) و (ئال ئەحمەد) قوتار بکەن.» ئێوە چۆن تەماشای ئەم مەسەلە دەکەن؟

**مەنسوور کووشان:** لە ڕاستیدا من لە مانای ئەم قسەیە بە باشی تێناگەم، مەگین نووسەرە ڕووسەکان توانیویانە خۆیان لەژێر تەئسیری (پاڵتۆ)ی گۆگۆلدا ڕزگار بکەن؟ ئەدەبی ڕۆژئاواییش بەگشتی، لەژێر کاریگەریی شانۆنووسانی یۆنان یان لە ژێر پەنجە بەهێزەکەی ڕەوایەتی (تەوڕات) بووە. هیچ نووسەرێك نەبووە کە بە یەکەم دەسپێکەر هاتبێتە ژمار. هەروا کە حەزرەتی«سلێمان» لە پەرتووکی «کۆمەڵگادا» دەڵێ: «هیچ شتێك لەژێر ئەم خۆرەتاوە، بە شتێکی تازە و نوێ لە قەڵەم نادرێت.» هەموو نووسەران ئاڵقە ونبووەکانی زنجیرێکن. زنجیرێك کە لە ڕاستییدا سەرەتا و ئەنجامێکی نییە. هیچ چیرۆکێك، بەتایبەت چیرۆکی تەنز و کۆمیدی لە دەرەوەی کاریگەریی (دۆنکیخۆتە)ی سیرڤانتێس نەنووسراوە. کەواتە

نووسەرە ئێرانییەکانیش ناتوانن لە (هیدایەت) یان تەنانەت لە (ئالی ئەحمەد) تەئسیر وەرنەگرن.
بەڵام ڕەنگە مەبەستی ئەو نووسەرە بەڕێزە لە چەنبەرەبوون، بانتر لە کاریگەری بێت و بە مانای بەدیلی بوون یان تووشی دۆخێکی زۆر ئاستەم و بێدەربازبوون بێت. کەواتە، ئەم قسەیە بۆ من زۆر ڕوون نییە. بە چەشنێکی گشتی، هەتا ئەو کاتەی کە کۆمەڵگەی ئێرانی، بەتایبەت کۆمەڵگەی فەرهەنگی-ڕۆشنبیریی ئێران بۆ ئازادی خۆی خەبات نەکات، دیارە ئەم کیشمەکێشە زەینییە بەردەوام لەگەڵ کەسایەتیگەلێك وەك هیدایەت و ئالی ئەحمەد بوونی دەبێت. دەبێ چاوەڕوانی ڕۆژێك بین کە هەر نووسەر و رۆشنبیرێکی ئێرانی بتوانێت تەواوی ئەمانە لە دەروونی خۆی بەرجەستە بکاتەوە. ئینجا دەتوانێت لەم دوو کەسێتییە تێپەڕێ و قەڵەمباز بدات و سەربەستانە بە ترۆپکی سەربەخۆیی بگات.

**بابەک سەحرانەوەرد:** چیرۆکی فارسی لە باری بابەت و ناوەڕۆکەوە بەزۆری بۆ پێش شۆڕشی 78ی ئێران دەگەڕێتەوە. بە ڕای ئێوە ئەمە لە زاتی خۆیدا نابێتە خۆپاریزی و ڕوووەرگێڕیی خوێنەران لە ڕۆمان و کورتەچیرۆکی هاوچەرخ؟ هۆکاری لایەنگریی ئەم نووسەرانە بۆ ڕووداوەکانی پێش ڕاپەڕینی 78 لە بەرهەمگەلی خۆیان چییە؟
**مەنسوور کووشان:** ئافراندنەوەی ڕابردوو یان خەلقکردنی زەمەنی ئێستا، لە بنەڕەتەوە و بە تاقی تەنها ناتوانێ وەك عەیبە یان باشیی بەرهەمێك لە قەڵەم بدرێ و خۆی بەرجەستە بکاتەوە. بەڵکو ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە ئەم دەقانە چۆنچۆنی و بە چ هەڵوەستە و بە چ زمانێك ئاڕاستە بووە یان پێکهاتەی ئەو تێکستانە چۆن بووە و دیارە ئەو مەرجگەلەی سەرەوە، دەبێتە هۆی ئەوەی کە خوێنەران ئاوڕی لێبدەنەوە یاکوو فەرامۆشی بکەن و کەسێك نەیخوێنێتەوە. لە ڕوانگەیەکی گشتی، بەشێکی زۆروزەوەند لە ئەدەبی جیهان، بە ئافراندنەوەی ڕابردوو خۆی بەستۆتەوە. هەر نووسەرێك بۆ نووسینی بەرهەمێکی شیاو و هەرمانی، بەتایبەت ڕۆمان، پێویستیی بە توێژینەوە و ئەندێشەی زۆر لەسەر بابەتێکە، کە دەیەوێت بە شێوەی ڕۆمان ڕەوایەت و وەسفی بکات. کەواتە، ئەم ئیمکانە پتر لە هەر شتێك، لە بەڵگەکانی ڕابردووە و لە ناخی مێژوودا بە تەواوەتی سەقامگیر بووە. نووسین لەمەڕ رۆژگاری خۆت، بەو هۆکارە کە زوو تێدەپەڕێت، هەرە





دژواره و دووهەم هۆکاریش ئەوەیە کە کێشەی زۆری لێدەبێتەوە. بە چەشنێکی دی، یەکێك لە باشترین و پەسەندترین شێوەگەل، سوودوەرگرتن لە زەمەنی رابردووە وەکو پردێك بۆ پەڕینەوە بەرەو دەربڕینی زەمەنی ئێستا. کارێك کە زۆربەی نووسەرە گەورەکان کردوویانە و بەرهەمگەلی هەرمانیی بەزۆری خاوەنی ئەم خەسڵەتەن. بەر لەم هۆکارگەلە، هەڵبەت قسە لەسەر ئێران دیارە شتێکی جیاوازە. هەروا کە زۆربەی نووسەرە ئێرانییەکان نەك بە هۆی نەبوونی بەڵگە و ژێدەر، بەڵکو بە هۆی ڕاکردن لە لاوازی و هەروەها ڕاکردن لە تیغی سانسۆرە کە ئاوڕ لە ڕابردوو ئەدەنەوە. هەرچەند ئەو شتە کە لە ئێستادا کێشەی سانسۆری هەیە، ئافراندنەوەکەیشی بەداخەوە لە ڕابردوو بە هەمان شێوە کێشەسازە.

**بابەک سەحرانەوەرد:** ئێوە بەر لە ڕۆمان، بە شاعیرێکی خاوەن ئەزموون و جیددیش ناسراون. بڕێ لە شاعیران وادەزانن زمانی شێعر دەبێ دژی زمانی ستاندارد بێت. پێم خۆشە بزانم ئێوە چۆن لەم مەسەلە دەڕوانن؟

**مەنسوور کووشان:** ئەگەر بێین و بە جێگەی زمانی ستاندارد، زمانی ڕۆژانە داتاشین، بە ڕای من پەسەندترە. چوونکا زمانی ستاندارد، زمانێکی ناسیاو نییە، کام زمانی ستاندارد؟ ئەم کەسانە لە کام زمانی ستاندارد ئەدوێین؟ ستانداردی زانسگایی، جوانیناسانە، شاعیرانە، ڕۆمانتیکی، یا زمانی دیکە؟ هەر بەرهەمێکی بەرز، سەرکەوتوو و ڕەسەن، خاوەن زمانێکی تایبەتە، کە بۆ خودی ئەو بەرهەمە و بەرهەمەکانی دیکە دەبێتە زمانی ستاندارد. ئایە دەکرێ بە غەزەل وەك زمانێکی سەر و ستاندارد بنواڕین؟ نا، چوونکا لە نێوان غەزەلی حافز و سەعدی دا جیاوازی خوڵقاوە. ئەدەب و هونەر و بەتایبەت (زمان) لەم دوو دەڤەرە فرەڕەهەندەدا دیارینەکراوەیە و ئێمە ناتوانین هەروا بە سانایی پێوەرێکی نەگۆڕ بۆ زمان داتاشین. ڕەنگە ئەم کەسانە کە بەم شێوە باوەڕمەندن و خۆیان وەك لایەنگران و پاسادارانی زمانی ستاندارد دەبینن، مەبەستیان لەم ئاخێوە، نوێخوازی لە خودی زماندا بێت.

ئەگەر ئەمە بێت، بەڵێ، بەشێکی گرینگ لە دڵڕفێنیی شێعرێك، هەر بۆ خودی (زمان)ەکەی دەگەڕێتەوە. بەداخەوە دەبێ بڵێم ئێستاکە قسەی کەشخە و تازە نەماوە یان زۆر دەگمەنە، ئەمە تەنها زمانە کە ئەو تین و هێزەی هەیە هەتا مانا و چەمك لەم چاخەدا لە دووپاتبوونەوە قوتار بکات و بۆ ملیۆنها جاریش ئەو دەقە، بە دەقێکی دڵڕفێن و خۆش لە قەڵەم بدات.

**بابەک سەحرانەوەرد:** لە کۆمەڵگای ئێمە بەتایبەت دوای ڕاپەڕینی 78، بۆ ماوەیەك لە شێعری سیاسی و کۆمەڵایەتی ئاوڕیان ئەدا و ماوەیەکیش لە شێعری ئەڤینداریانە. هۆکاری ئەم ئاوڕدان و ئاوڕنەدانەوە لەم دوو جۆر شێعرە لە چ مەسەلەیەکدا دەبینن؟

**مەنسوور کووشان:** ئەم پرسیارە پێویستیی بە دوو وڵامە. یەکەم ئەوە کە ئەمە ڕاستە کە ئێمە بە شێعرگەلێك ئەڤیندارانە یان سیاسی دەڵێین. بەڵام لە دیدی من، هیچ شێعرێکی ئاشقانە کە سیاسی نەبێت، لە واقیعدا هەر بوونی نییە. دووهەم ئەوە کە شێعر، لە پێناسەیەکی هەمەکی و گشتی، واتە بە ڕوانگە هەڵبژاردنی شاعیر بەرامبەر بە دۆخێك خەلق دەبێت. کەواتە هەر شێعرێکی سیاسی هێندە ئەڤیندارانەیە، کە هەر شێعرێك کە ئاشقانەیە. مەگین ئەوەی کە پێناسەی شێعر جێ بێڵێن و لە دەقگەلی نیمچەشێعریی ئاوڕ بدەینەوە، کە خۆیان بە سیما و ڕواڵەتی (شێعر) دەرهێناوە. تۆ تەماشا بکە باشترین غەزەلەکانی حافزی شیرازی هەم زۆر سیاسین و هەم زۆریش ئاشقانەن. هەروەتر باشترین شێعرگەلی نیما، فروغ و شاملوو.

**بابەک سەحرانەوەرد:** هەندێ لە ڕەخنەگەران لەم سێ دەیەی دوایی وای بۆ چوون کە بڕێك لە نووسەران کە مەنفایان بۆ ژیان هەڵبژاردووە، نەیانتوانیووە بەرهەمێکی ئەوتۆ و بەپێزوهێز داهێنن. ئاخۆ ئێوەیش لەگەڵ ئەم بیروڕایەن یان ئەوە کە بە جۆرێکی دی لەم مەسەلە ئاوڕ ئەدەنەوە؟

مەنسوور کووشان: بەڵێ، هەندێك لە نووسەرانی تەرکەدیارکراو ئیتر هیچیان نەنووسیووە، یا ئەگەر شتێکیشیان نووسیووە، وەك دەقێکی تازە و پێشڕەو دەرنەکەوتووە. بەشێك لەم کارەساتە، بە ڕاستی بۆ وڵاتێکی وەك ئێران کە سەرجەم دوو نووسەری باشی تێدا نییە، بە





ڕاستی دڵتەزێنە و ئەمەیش بۆ دۆخی نووسەر لە تاراوگە دەگەڕێتەوە و بەشێکیش لە توانایی و بەهێزبوونی ئەو کەسە  ئاوڕ ئەداتەوە. من بەش بە حاڵی خۆم لەو بڕوایەدام کەسانێك لە تاراوگە، بەتایبەت دوا یەك دوو بەرهەمی نە زۆر باش، بۆ هەمیشە بێدەنگ بوون و ئیدی بەرهەمێکیان نەنووسی یا بڵاو نەکردەوە. ئەگەریش لە ئێران بوونایە، بە هەمان شێوە هەر ئەمە لە دۆسیەکەیان تۆمار دەکرا. بە چەشنێکی گشتی، ئێمە گەلێکی ماڵپەرەست و ئاسایشخواز و تەمەڵین. واتە لە هەرەتی گەنجی تۆزقاڵێك جەخت دەکەین، ئەگەر سوودێکی بۆ ئێمە بوو کە باشتر، ئەگەریش نەیبوو، دیارە زوو بەجێی دەهێڵین و شوێنی خۆشی و ئاسایشی شەخسیی خۆمان دەکەوین. چوونکا ئەدەب بەدەگمەن بۆ داهێنەرەکەی ئاسایشی هێناوە.

**بابەک سەحرانەوەرد:** چ هەڵوەستەیەکتان لە بەرانبەر بەرهەمی ئەم جیلە گەنجە لە دەڤەری چیرۆك و شێعردا هەیە؟ ئاخۆ فریا دەکەون نووسینەکانی ئەم نەوەیە بخوێننەوە ؟

**مەنسوور کووشان:** بەڵێ، وابزانم تەنانەت زۆرتر لەو شتەیش کە لە خۆمدا شکی دەبەم، دەخوێنمەوە. دەبێ بڵێم من نووسینەکانی ئەم نەوە بەڕێزە دەخوێنم. بەتایبەت ئەو بەرهەمانە کە بۆم دەنێرن و منیش چ بمەوێت و چ نەمەوێت، بۆ خوێندنەوەیان پابەند دەبم. ئەگەر بە ڕامانەوە تەماشای ئاستی چاپکردنی کتێب بکەین، ئێمە کتێبی زۆرمان هەیە، کە پەیتا پەیتا چاپ دەکرێن، بەڵام کتێبی باش و لێهاتوو زۆر بەدەگمەن دێنە بەردیدی خوێنەر. ژمارەی بەرهەمە لاواز و خراپەکان هێندە زۆرن، کە تەنانەت  وچانمان پێنادەن هەتا یەك دوو بەرهەمی باش و شیاو لە نێوان ئەم خەرمانە بەرهەمە بدۆزینەوە و لەسەری بدوێین. هەڵبەت هۆکارەکەشی زۆر ڕوونە و گەنجەکان و ئەو نەوەیە کە ئیمرۆکە لە تەوەری وشە و ئافراندن سەرقاڵی تەراتێنن، خەتایان نییە، لەبەر ئەوەی کە سەد مەخابن هیچ شتێك

لە حکومەتی ئیسلامیی و لەم ئێرانەدا بایەخی پێنادرێ. لە هیچ کوێی ئەم وڵاتەدا، چلۆنایەتی و هەرمانی بوونی بەرهەم گرینگ نەماوە. ئیدی مەلا و خواناسەکانیش بەقەد فلسێ بۆ داهاتوو و بەهەشت بایەخ تەرخان ناکەن، چ بگات بەو نەوە گەنجە، کە بە هەموو جۆرێك دژی ئەخلاق و مۆراڵ ڕاهاتووە، کە بووەتە بەرهەڵستێك بۆ کۆمەڵگە و خەڵکیی خۆی.
لەلایەکی ترەوە بڵاوبوونەوەی بێسەرەودەرە و هەمەجۆرەی دەق لە ئینتەرنێتدا، گەشەی بەم سەرلێشێواوییە داوە و بووەتە هۆی ئەوە کە گەنجان چ بایەخێك بۆ بەرهەمێکی ئەدەبیی بەپێز دانەنێن و ئینتەرنێتیش گشت کاتی ئەم جیلەی بە خۆییەوە زەوت کردووە و ناهێڵێت بەرهەمێکی بەهێزوپێز داهێنن.

**بابەک سەحرانەوەرد:** بەڕای ئێوە ئاخۆ گۆڕانکاری و نوێخوازی لە بنوبنچینەی ئەدەبدا لە هەر قۆناغێك وەك هەرامەیەکی پێویست دێتە ژمار یاکوو لە بنەڕەتەوە لەو باوەڕەن کە گۆڕان و نوێخوازی لە واقیعدا لە گۆڕانکارییە سیاسی و کولتوورییەکانی کۆمەڵگا سەرچاوە ئەگرێت؟

**مەنسوور کووشان:** هەردوو ڕستەکە یەك شتمان وەبیر دەهێننەوە. دیارە گۆڕان و نوێخوازی لە زاتی ئەدەبدا هەرامەیەکی پێویستە، چوونکا ئەدەب بە تاقی تەنها ئەو بڕستەی تێدا نییە جیا لە گۆڕانکارییە سیاسی و کولتوورییەکانی کۆمەڵگا خۆی دەرخات. ئەم دوو چەمکە پەیوەندییەکی پراکتیکی، ئۆرگانیك و سفتوسۆڵیان پێکەوە ڕەخساندووە و هەردوویان دەتوانن لە یەکتری تەئسیر وەرگرن. بۆیە هەرچی ئەدەبی میللەتێك پەرە بسێنێ، ئەو کۆمەڵگەیە گۆڕانێکی هەمەلایەنە و بەرینتری بەسەردا دێت و هەرچی بارودۆخێکی سیاسی و ئابووری لەبارتری بێت، کولتوور و ئەدەبی ئەو کۆمەڵگەیە بە شێوەیەکی بەرفراوانتر خۆی بەرجەستە ئەکات و سەقامگیر دەبێت.

**بابەک سەحرانەوەرد:** لە حەفتاکاندا، هەندێك نووسەر و ڕۆشنبیری ئێرانی وەکو «گوڵشیری» و «دوکتۆر بەراهەنی» لە تاران کارگەی ئەدەبییان ڕێ خست. لە بنەڕەتەوە ئێوە ئەم کارەتان پێ باش بوو؟ ئاخۆ لەو بڕوایەن کە ئەم نووسەرانە توانیویانە لە دەورە و قۆناغێکی





دیاریکراودا لەسەر ڕەوتی ئەدەبیی ئێران تەئسیر دانێن؟
مەنسوور کووشان: بەڵێ، ئەم ڕووداوە بە تایبەت لە کۆمەڵگەیەکی بەستراو کە سیستەمێکی دکتاتۆری خۆی بەسەردا سەپاندووە، زۆریش ڕەوا و پەسەندە. ئەو کۆمەڵگایە کە ئازادیی تێدا دیار نەبێت، هەروەها میدیا جۆراوجۆرەکان و جێگەیەکی دیاریکراوی بۆ فێربوونی تێدا دانەمەزرابێت، ڕەچەیەکی دی بۆ بەرسڤدان بە پێداویستییەکانی ژیان ئەدۆزێتەوە.چوونکا لە ئێران گۆڤار و ڕۆژنامەیەکی ئەوتۆ بڵاو نەدەبووەوە و جێگەیەکیش بۆ کۆڕە شێعریی و چیرۆك و ڕەخنە و بیروبۆچوونەکان ڕێ نەخرابوو، دیارە ئەم جۆرە کارگانە تەئسیرێکی زۆر باشیان بووە. کۆڕە ئەدەبییەکان چەشنی (کۆڕی پێنج شەممە) کە دابونەریتەکەی بۆ سەردەمی «جونگی ئیسفەهان» دەگەڕایەوە، لە ئاکامدا بووە کۆڕێکی جیددی، کە شاعیران بتوانن لەوێدا هۆنراوەکانیان ئاڕاستە بکەن. لە واقیعدا جێگەیەك بووە بۆ فێرکاری و باسە ئەدەبییەکانی گەنجان.
ئەم کارگە ئەدەبییانە تا ڕادەیەك کاریگەرییان لەسەر ئەو کەسانە نواندووە، کە لەو کۆڕانەدا بوونەتە ئەندام. هەڵبەت لەولایشەوە دەبێ بڵێم تەئسیرێکی ئەوتۆیشی نەبووە، چوونکا لەم جێگانە زۆر بە دەگمەن دەکرێ بیروبۆچوونە تاکەکەسییەکان وەدی بێن یان ئەوە کە شوێنێکی جیددی لەبۆ مشتومڕ و لێکۆڵینەوە بێتە ژمار، چوونکا کاتێك کۆمەڵگا بە هەموو لەونێك دەرگاکانی داخراو بێت و بە هەموو تینوهێزەوە خەڵکانی لغاو کردبێت، دیارە یەك بۆچوونی تاك، بە تاقی تەنها و بەبێ هیچ پشتیوانێکی هزری و مەنتیقی، بەسەر هەموو بیروبۆچوونەکانی دی زوو زاڵ دەبێت و ئەمە دەیان تەنگژە و خەساری جۆراوجۆری لێدەبێتەوە.

**بابەک سەحرانەوەرد:** بەڕێز کووشان، بۆ ئەم هەڤپەیڤینە بەنرخە گەلێك سپاس.
**مەنسوور کووشان:** منیش بەش بە حاڵی خۆم هیوای سەربەرزیتان بۆ دەخوازم.

فرانتزکافکا

# بەدگۆڕان

وەرگێڕانی

جەلیل کاکەوەیس





# ئایرس سکۆت

سازکردن و ئامادەکردنی بە زمانی ئینگلیزی: ڕەوشت محەمەد
و. لە ئینگلیزییەوە: مەهد خەلیل

(1)(Finger painting) یاخود وێنەکێشان بە پەنجە ئەو شێوازە تایبەتەیە، کە خانمە هونەرمەندی لاو ئایرس سکۆت کاری لەسەر دەکات و پێی ناسراوە.
چێژوەرگرتن لە کارەکانی ئایرس سکۆت لە تەماشاکردنی تابلۆکانەوە دەست پێناکات، بەڵکو لای ئەو چێژوەرگرتن لە ساتی دروستکردنی تابلۆکەوە دەست پێدەکات، وەختێ دەستکێشەکانی دەکاتە دەست و بەبێ بەکارهێنانی هیچ فڵچە و ئامێرێك، پەنجەکانی بە ڕەنگەکان دەسپێریت و لەگەڵ خەیاڵی خۆیدا تێکەڵیان دەکات. پێنج پەنجە بەسەر



ڕەنگەکانەوە سەما دەکەن، کارەکە زیاتر لەوە دەچێت پیانۆ بژەنێت تا ڕەنگ تێکەڵ بکات، سکۆت بەو جۆرە دەکەوێتە نیگارکێشان. ئەو بەرلەوەی بە تابلۆکەی سەرسامیمان بکات، بە کێشان ئەفسوونمان تێبەردەدات.

ئایرس سکۆت دانیشتووی شاری نیۆیۆرکە، ساڵی **2006** لە زانکۆی (**Washington state**) بەکالۆریۆسی لە هونەرە جوانەکاندا بەدەست هێناوە. لە شاری فلۆرەنسی ئیتالیا ڕاهێنانی لەسەر هونەری شێوەکاری کردووە.

سەربوردەی بەکارهێنانی پەنجەکان لای (ئایرس سکۆت) دەگەڕێتەوە بۆ ڕووداوێکی سەیر، تەمەڵی کە لای ئێمە دەبێتە هۆی کوشتنی ساتەکان و هەلەکانی ژیانمان لەبار دەبات، کەچی لای ئەو تەمەڵی لە تەنیا ساتێکدا دەرگای جوانی بەڕوودا دەکاتەوە و دەبێتە ئەو خانمەی کە بەداهێنەری شێوازی (**Finger painting**) ناو ببرێت.

سکۆت ساڵی (**2009** ڕوو دەکاتە تایوان ساڵێك لەوێ دەمێنێتەوە، دوانیوەڕۆیەکی گەرم سکۆت خەریکی وینەکێشان دەبێت، لە کاتیکدا پێویستی بە فڵچەیەکی پاك دەبێت، تاقەتی نابێت کەشی وێنەکێشانەکە بەجێ بهێڵێت و بچێت لە ستۆدیۆکەی بیهێنێت، ناچار بۆ تەواوکردنی ئەو خەیاڵەی لەو ساتەدا بەگیری هێناوە، پەنجەکانی بەکار دەهینێت، جوڵەیەك و دوان و سیان، هەستێکی سەیر دایدەگرێت و تەکنیکێکی جیاواز و جوان بەدی دەکات لە کارەکەیدا، ئەمە دەبێتە سەرەتایەکی شێتانە بۆ شێوازێکی جوان و ناوازە و دواتر ناوی دەنێت (**Finger painting**)، لە ساڵی **2010**وە، ئەم خانمە بە تەواوی دەست دەکات بە وێنەکێشان بە پەنجەکانی و ئیتر ئەو فڵچەی بۆ جارێکی تر بەکار نەهێنایەوە.

**ڕەوشت محەمەد:** سەرەتا با هونەرمەندان و خوێنەرانی کورد لە زاری خۆتاوەوە ئایرس سکۆت بناسن، بە شێنەیی باسی خۆتمان بۆ بکە. ئەو قەدەرە چۆن بوو ئێوەی خستە باوەشی ڕەنگەکانەوە. ڕووداوێك یان ڕایەڵێك هەیە منداڵیی ئێوە ببەستێتەوە بە



هونەرەکەی ئێستەتانەوە؟

**ئایرس سکۆت:** من لە لایەن دایکم، کە مامۆستای پیانۆ و باوکمەوە، کە دارتاشی کەوانتەرە، پەروەردە کراوم، دایك و بابم ئەندام بوون لە بزووتنەوەی گەنجانی (2) (HIPPIE) کە سالانی کە شەستەکانی سەدەی ڕابردوو لە سانفرانیسکۆ سەریهەڵداوە، ئەو بزووتنەوەیە هانی دۆزینەوە و داهێنانیان دەدا، ئەوان هەردووکیان هونەرمەند بوون، ڕووخۆش بوون و حەزیان لە یاری و گاڵتەکردن بوو.

گفتوگۆکردن لەگەڵ ئەم دوو مرۆڤەدا لەسەر هەر بابەتێك بە لای منەوە لە ڕاهینانی کردەیی کەمتر نەبوو، لەبەر ئەمە، من لە تەمەنی هەشت ساڵییەوە بە هاوکاری ئەو ژینگەیەی ئەو دوو مرۆڤە بۆیان درووست کردم، وەکو حەزێك دەستم دایە وێنەکێشان و چوومە بەر خوێندنی بنەماکانی وێنەکێشان.

**ڕەوشت محەمەد:** ئەم ستایلەی تۆ کاری پێدەکەیت، ناوی دەنێیت چی؟ سەربە کام جیهانبینیی هونەری شێوەکارییە، ئایا خۆتان داتانهێناوە، یان پەرەتان پێداوە؟

**ئایرس سکۆت:** ئەمە پرسیارێکی جوانە، (Finger painting) شێوەکارکردنێکی نوێیە لە هونەری شێوەکاریدا، لەبەر ئەمە کە پێش من هیچ هونەرمەندێکی تری شێوەکار لە وێنەی زەیتیدا بەم ستایلە کاری نەکردووە، زۆر سەرنجم داوە و گەڕاوم بزانم هیچ وێنەکێش یان هونەرمەندێکی ناودار بەم ستایلە کاری کردووە، یان بەم جۆرە تابلۆی بەرهەم هێناوە، نەمدیوە.

ڕاستە ئێستا هەندێك هونەرمەند ئەوانەی کە بە ماجیکی زەیتی، یان قەڵەمی خەڵوز، یان تەباشیر کار دەکەن، زۆرجار سەری پەنجەکانیان بۆ تێکەڵکردنی ڕەنگەکان بەکار دەهێنن، لێرەشدا هەر بە ماوەیەکی کەم من پێش ئەوانیش کەوتووم لە بەکارهێنانی پەنجەکاندا، سەبارەت بە چۆنییەتیی دۆزینەوە یان دەستپێکی ئەم شێوازە، ڕۆژێك لە تایوان لە ستۆدیۆکەی خۆمدا هەر بە چانس کەوتم بەسەر ئەم شێوە تابلۆکێشانەدا، لە کاتی وێنەکێشاندا پێویستم بە فڵچەیەکی پاك بوو، ڕاستییەکەی تاقەتم نەبوو



وێنەکێشانەکە بەجێ بهێڵم و بچم تا ستۆدیۆکە، لە خۆوە پەنجەکانم بەکار هێنا، جوڵەیەك و دوان و سیان، هەستێکی سەیر دایگرتم و تەکنیکێکی جیاواز و جوانم بەدی کرد لە کارەکەدا. شێوازی من کارکردنە لە چێوەی (الانطباعیة الحدیثة) سەر بە کلاسی سەرنجڕاکێشی سەردەم، جیهانبینیی پشت ئەم ئەم شێوە کارکردنەی منیش دەگەڕێتەوە بۆ سیحر و ئەفسوونی پەنجەکان، بە لای منەوە پەنجە زۆر چێژبەخشە، پەنجە چارەسەرە. هەر بۆیە من ئێستا کەسێکی دوور لە خەم و دوودڵیم.

**ڕەوشت محەمەد:** لەگەڵ ئەوەدا کە دونیای نوێ و تەکنۆلۆژیا چەندین زیادەیان خستووەتە سەر ڕێکار و قۆناغەکانی دروستکردنی تابلۆ ـ وێنەی هونەری، کەچی ئێوە وەك ستایلی خۆتان تەنانەت سوود لە فڵچەش وەرناگرن و بە پەنجەکانتان ڕەنگەکان دەدەن بەیەکدا و تێکەڵیان دەکەن و دەیانخەنە سەما و جوانییان پێ دەخوڵقێنن. ئایا پێتان وایە ئەو ئیحساسە هونەرییە ڕاستەوخۆ لە پەنجەتانەوە زووتر و جوانتر دەگات تا لە فڵچە و ئامێرە تەکنۆلۆژییەکانی ترەوە؟

**ئایرس سکۆت:** پێم وایە لایەنە باشەکانی بەکارهێنانی پەنجە لە لە کارەکەمدا زۆر لە لایەنە خەوشبارەکانی زیاترن.

یەکەم: ئەم ستایلە کار لەسەر بەکارهێنان و بەیەکگەیاندنی کۆمەڵێك هێڵ و خاڵی کورت و کول دەکات، پەنجە وەکو فڵچە نییە کە هێڵی یەکجار باریك و ورد بکێشێت، ئەمەش بەو مانایە دێت کە من دەتوانم وردەکاری تێپەڕێنم بە ڕزگاربوون لە داوی وردەکاری.. وردەکاری.. وردەکاری.. بەم شێوەیە دەتوانم سەرنج و توانای خەیاڵم بخەمە سەر هەستی گشتیی دروستکردنی دیمەنەکە، لەگەڵ ئەوەشدا ئاگادارییی ئەو وردەکارییە بم، کە پێویستە بۆ وتوویژ و تەماسگردتن بە بابەتی تابلۆکەوە.

دووەم: دەتوانم پێنج جار خێراتر تابلۆکەم بەرهەم بهێنم، چونکە من چوار ڕایەڵی زیاتری پەیوەندیم هەیە بە تابلۆکەمەوە کە پێنج پەنجەکانی دەستمن، نەك تەنیا یەك فڵچە، هەروەها دەتوانم هەست بە وردەکاریی تابۆکەم بکەم، لەگەڵ هەموو ئەمانەدا من



تێدەگەم کە بەکارهێنانی زەیت دەشێت خەوش و کەموکورتیشی هەبێت، لەبەر ئەمەیە باشترین جۆری زەیت بەکار دەهێنم، کە جۆری (Holbein)ە.

ڕەوشت محەمەد: لە ستایلەکەی تۆدا هێڵ بوونی نییە، لە کارەکانتدا هێڵێکی درێژبووەوە نابینین، ڕەنگەکان دەست پێدەکەن و کۆتاییان دێت.. دیسان دەست پێدەکەنەوە و کۆتاییان دێتەوە. بەم هەناسە کورتکورتانەوە، دنیایەك جوانی دروست دەکەیت.. لەبارەی ئەم سەرنجەوە چیمان پێدەڵێیت؟

ئایرس سکۆت: چەند پرسیارێکی جوانە!. سروشتی شێوازی (الانطباعي) زیاتر لە خاڵەکانەوە نزیکترە تا هێڵ، وەك چۆن لە سیستمی دیجیتاڵدا وێنەی نێو شاشەکان لە ملیۆنەها پێکسڵی ورد (3) (Mega Pixel) دروست دەبێت، وێنە و شێوازەکەی منیش لەسەر ئەم دەستوورەیە، هەر وێنەیەك دەیکێشم، دەکرێت بچووك بکرێتەوە بۆ پێکسڵی پەنجەکانم (پێکسڵی گەورە).

ئەو ڕۆژانەی وێنەیەك دەست پێدەکەم و دەکێشم؛ کاتێك نانی ئێوارە دەخۆم و لە ماڵ دەچمە دەرەوە بۆ بەسەربردنی پیاسەیەك، جوانتر هەست بە خۆم دەکەم، کە بیر لە پنت و خاڵەکان دەکەمەوە، دەمەوێت دیسان ناوی ڕەنگەکانی جیهان بنێمەوە بە گویرەی ئەو قوتووی ڕەنگانەی لە ماڵەوە دامناون، لەو کاتەدا وا بیر دەکەمەوە کە پیاسەکەم بریتییە لە کۆبوونەوەی ڕەنگی ئەرخەوانی و زەردێکی مەیلەوسووری خاکی، یان ڕەساسییەکی مەیلەوشین. بەڵێ هەست بە ئاسمان دەکەم بەسەر سەرمەوە بە ڕەنگێکی شینی تۆخ یاخود کاڵێکی ڕوونەوە.

**ڕەوشت محەمەد:** بەڕای تۆ هونەرمەندبوون پەیوەندیی بە ڕۆحەوە هەیە؟ یان دەشێت لە کاتێکی دیاریکراودا مرۆڤ ببێ بە هونەرمەند؟ تۆ پێت وایە هەر لە منداڵییەوە هونەر لە ڕۆحی تۆدا ئامادەیە؟

**ئایرس سکۆت:** بە بۆچوونی من لێرەدا کۆمەڵگە کاریگەریی یەکجار زیادی هەیە لە بەرکەوتنی مرۆڤ، لە لەدایکبوونی هونەرمەند. پێم وانییە کەسەکان سەرەوەختی

لەدایکبوون ڕۆحی هونەرمەندانەیان تێدا چێنرابێت، باوەڕم وایە کە هونەری مەزن لەدایك دەبێت کاتێك حەزی ئەو لەگەڵ فێرکردنە بنچینەییەکان بەدیاریکراوی لەودا دەستیان پێکرد، ئەمە بۆ هەر هونەرێك دروستە، یان لاساییکردنەوەی ئەو کارە هونەرییانەی سەرسامت دەکەن، یان ڕاهێنانی شێتانە لەسەر ئەوەی پێت خۆشە ببیت بەوەی دەتەوێت، ئەمانە لەو کاریگەرییانەن هونەرمەند دروست دەکەن. لەمانە هەموو گرنگتر ئەوەیە: لە کۆتاییەکەیدا هونەرمەند بتوانێت یاساکانی پێشتر هونەری پێناسیووە، بەجێ بهێڵێت یان تێك بشکێنێت و شێوازێکی تازە دابهێنێت، لە ڕاستیدا ئەم پرۆسەیە کۆبوونەوەی کۆمەڵێك هەڵە و کێشەن، کە دواجار هونەرمەند بۆ خۆی چارەسەری کردوون، بڕوام وایە ڕۆح و دەروونی هونەرمەندانە زیاتر دەرەنجامی هەڵبژاردنی کەسێکە، نەك ئەوەی وەکو دیاری و بەخشش بدرێت.

من وەکو منداڵێك حەزم دەکرد باشترین هەوڵی خۆم بدەم، جیاوازیم نەدەکرد لەوەی لە قوتابخانەم یان ماڵەوە، دیسان جیاوازیم نەدەکرد ئەمە وانەی مۆسیقایە، یان وەرزش، یان وێنەکێشان... ئەو کاتەی ئەوانیتر هەستیان کرد من سەلیقە و بەهرەی وێنەکێشانم لە هاوڕێکانم زیاترە، ئەوکات وا گوزارشتیان لەو ڕاستییە دەکرد، کە من هەر لە سەرەتاوە بە ڕۆحێکی هونەرمەندانە خەڵات کراوم لە لایەن ئاسمانەوە. خۆم باوەڕ بەوە ناکەم کە ئاسمان خەڵاتی منی کردبێت، تەنیا وا دەزانم کە من بەردەوام بووم لە ڕاهێنانی هونەرێك کە هاوتەمەنەکانم لێی دوور بوون، من لەوە دڵنیام هەر کەسێك، لە هەر تەمەنێکدا، لە هەر کاتێکدا، دەست بکات بە فێربوونی زانستە بنچینەییەکانی هونەر، بە وێنەکێشان و ڕاهێنان و لاساییکردنەوەی کار و شێوازی هونەرمەندە ناودارەکان، ئەوا تەنیا چەند ساڵێکی کەمی پێویستە بۆ ئەوەی بەهرەیەك، نهێنییەك، تازەگەرییەکی سەرسوڕهێنەر لە خۆیدا بدۆزێتەوە.

**ڕەوشت محەمەد:** لە نێو کارەکانی تۆدا ژن ئامادەییەکی جوان و فرەڕەهەندی هەیە، خۆت وەك کچێك چۆن باس لە ڕۆحی مێینەبوون دەکەی لەم سەردەمەدا؟



**ئایرس سکۆت:** چەند پرسیارێکی جوانت لێ وروژاندم ڕەوشت، من بەختەوەرم کە ژنێکی ئەمریکی 30 ساڵم و نیشتەجێی شاری نیۆیۆرکم لە ساڵی 2014دا، من هیچ هەست بەو تەنگەبەرییە ڕۆحی و جەستەییانە ناکەم، کە دایکم، یان نەنکم لەو کاتانەی لە تەمەنی مندا بوون، هەستیان پێکردووە و بە سەد ڕێگا گوزارشتیان لێکردووە، ڕاستی، من هەست بە





توانایەکی زۆر دەکەم لە خۆمدا و چ ڕێگرییەك نابینمەوە لە بەردەم ئەوەی دەمەوێت بیکەم و ئەوەی دەمەوێت پێی بگەم، ئەسڵەن جیاوازیی جێندەری لای من هیچ کاریگەرییەکی دانەناوە، باوەڕم وایە ئاگایی و هۆشمەندیی ژنان بەو ئاڕاستەیە دەڕوات، کە لە داهاتوودا ژن جیهان بەڕێوە دەبات، ئەمە باوەڕی ڕاستەقینەی نێو هۆشی منە.

**ڕەوشت محەمەد:** هونەرمەندان زۆرتر لە ڕۆحەوە نزیکن، دەوترێت ئایینیش پەناگەی ڕۆحە، تۆ وەك هونەرمەندێك چۆن لە ئایین دەڕوانیت، هەست دەکەیت ئەمڕۆ ئاین پێویستییەکی ڕۆحیی و کۆمەڵایەتییە؟

ئایرس سکۆت: ئەمە ڕاستە، ڕەنگە هونەرمەند بە شێوەیەك زیاتر و توندتر لە ڕۆحەوە نزیکتر بێت، چونکە هونەر زیاتر پێویستی بە بەکاربردنی توانا زهنییەکانی مێشکە بۆ دۆزینەوەی ڕێگای خاڵیبوونەوە لەو شتانەی کە پەست و حەزیان پێناکات. ڕای من وایە هونەر پێویستی بە هەستێکی یاریخوازانەیە، نەك بە ڕۆح و دەروونێکی ماندوو بتەوێت لەگەڵیدا مانا ڕەسم بکەیت.

لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا، وا دەبینرێت ئایین هێشتا پێداویستییەکی کۆمەڵایەتی بێت، بەڵام ئەمە بە نیسبەت گەنجەکانەوە، بەتایبەت ئەوانەی لە شارەکاندا دادەنیشن، وانییە، بە لای ئەوانەوە ئایین ئەو گرنگییەی نییە، ئەمە بەنیسبەت منیشەوە تەواوە، ئاڕاستەکە بەو شێوەیەیە، کە نەبینە بەشێك لە ئایینێکی دامەزراو.

**ڕەوشت محەمەد:** بینەر دەبێ چی لە تابلۆکانی تۆ چاوەڕوان بکات، لە پرۆسەی تەماشاکردندا بینەر گرنگە بۆ شتی جوان بگەڕێ، یان بە جوانی تەماشا بکات؟

**ئایرس سکۆت:** تازەگی بابەتێکم خوێندەوە باس لەوە دەکات کە چۆن کاتێك زاناکانی بواری تەندروستی وێنە تیشکییەکان بەکار دەهێنن بۆ ڕۆشنکردنەوەی مێشکی نەخۆشەکان. ئەوان بە ئاشکرا ئەوەیان سەلماندووە کە کاردانەوەی مێشکی نەخۆش بۆ

وێنە تیشکییەکان، وەکو کاردانەوەیە بۆ بینینی ئاشنا و خۆشەویستێکی خۆی، یانی کاردانەوەی مێشك بە بینینی وێنەیەکی جوان، هەمان کاردانەوەیە کە خۆشەویستان دەبینێت.
من پێم وایە تابلۆکان دەبێت پەنجەرەیەك بن، دەبێت ڕوانینێکی کورت بن بۆ ئەو جیهانەی کە ڕەنگەکان دەوری تێدا دەگێڕن، جیهانێکی هاوسەنگ و جوان.
ڕەوشت محەمەد: ڕاستی سوپاسی کاتی بەنرخت دەکەم، وێنەیەکی گفتوگۆکەت بۆ دەنێرم وەختێ بڵاوم کردەوە.
ئایرس سکۆت: منیش سوپاسی پرسیارە جوانەکانت دەکەم، چێژم لە وەڵامدانەوەیان وەرگرت.

پەراوێزەکان:

(1) (Finger painting) بە مانای وێنەکێشان بە پەنجە. سەرەتا لە بەرانبەر ئەم وشەیەدا (پەنجەنێگار)م بەکار هینا، دوای پرسوڕاکردن بە چەند هونەرمەندێکی شێوەکار و نەبوونی وشەیەك لە بەرانبەر ئەو ناوەدا پێم باش بوو وشەکە ئینگلزییەکە وەکو خۆی دابنێم.

(2) بزووتنەوەی گەنجانی (HIPPIE) بزووتنەوەیەك بوو، ساڵانی شەستەکان لە ئەمریکا بڵاو بووبووەوە، ئەم بزووتنەوەیە گومانیانیان لە زۆربەی خووخدە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو کاتەی نەتەوەی ئەمریکا دەکرد و باوەڕیان وابوو چ پێویستییەك لەئارادا نییە کە گەنجانی ئەو کات خوو و نەریتەکانی پێش خۆیان وەربگرن و پەیڕەویی لێبکەن، ئەم بزووتنەوەیە لە شێوەی جلوبەرگ و گوێگرتن لە مۆسیقا و کۆمەڵێك دابی تایبەتدا جیاواز بوون.

(3) (Mega Pixel) لە دوو وشە پێکهاتووە، یەکەم (Mega) کورتکراوەی ملیۆن، دووەم (Pixel) کە کورتکراوەی (Picture Element)ە، بەمانای ڕەگەز و پێکهاتەکانی وێنە کە بریتییە لەو خاڵ و چوارگۆشە زۆر وردانەی کە لەسەر شاشەکان ئامێرە دیجیتاڵەکان وێنەیەك دروست دەکەن، ئەمەش زۆر بە ئاستەم بە چاو دەبینرێن، لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنە کۆنەکان بە ئاسانی دەبینران.







محەمەد سەرابی
ئۆ هینری
میران ئەبراهام
پەیمان وەهاب زادە
چیرۆک
ئەدەبی سەردەم
١٠٧ ئەدەبی سەردەم

# جەنگ

موحەمەد سەرابی

سەرباز 1:

ـ هەست دەکەم بیر لە شتێك دەکەیتەوە..

سەرباز 2:

ـ چۆن؟!

سەرباز 1:

ـ فکرت لە کوێیە؟ .. لەوەتەی لە جەنگ گەڕاوینەتەوە، لەسەر خۆت نیت...

سەرباز 2:

ـ بەڵێ ڕاستت دەوێ لەسەر خۆم نیم.. دەزانیت ئەمڕۆ لەکاتی جەنگدا شتێکی زۆر سەیرم بینی..

سەرباز 1:

ـ قسە بکە.. چیت بینی، وا هۆشت لەدەست داوە؟

سەرباز 2:




ـ دەمەو بەیانی بوو، ئەو کاتەی جەنگ بەرەو کۆتایی دەڕۆیشت، من و فەرماندەیەك و شەش سەربازی دیکە، لە قوڵی چەپەوە دەجەنگاین.. دوژمن بە تەواوەتی شکابوو.. زانیمان چەند سەربازێکی دوژمن لە خانوویەکدا ئازوقەیان لێبڕاوە و گیریان خواردووە.. بە تەواوەتی گەمارۆمان دان. بە هۆی هاوان و تۆپەکانیشەوە لایەکی خانووەکە ئاگری گرتبوو.. سات بە سات خانووەکە ئاگرەکەی بڵێسەی دەسەند و گڕی زیاتر دەچووە ژوورەوە.. هیچ ڕێگەیەك بۆ دەربازبوونی سەربازەکان نەمابوو.. لەو کاتەدا فەرماندەکەمان هاواری کرد:

ـ وەرنە دەرێ و خۆتان بدەن بە دەستەوە.. هیچ ڕێگەیەکتان بۆ دەربازبوون نییە.. دڵنیا بن ئەگەر نەیەنە دەرەوە، کەمێکیتر بە هۆی دووکەڵەکەوە دەخنکێن و خانووەکە بەسەرتاندا دەڕوخێت..

دڵنیا بوو بە زوویی خۆیان دەدەن بە دەستەوە، چونکە هەموو بیرکردنەوەیەك بۆ خۆ ڕزگارکردنیان بێسوود بوو.. دوژمن بە تەواوەتی دوور کەوتبووەوە.. تەقاندنی تۆپ و هاوانەکان ڕاگیرابوون.. ئەو دەنگانەی دەبیستران، دەنگی قرچەی سووتاندنی درەختی لاکۆڵانەکان بوو، دەنگی خۆکۆکردنەوەی سەربازەکانیش دەهات.. دووکەڵ لە هەموو لایەوە بەرز دەبووەوە.. هەندێ کاتیش بە هۆی سووتانەوە، خانوویەك یان باڵەخانەیەك هاڕەی دەکرد.. لە پڕا یەکێك لە سەربازەکانی دوژمن، لە ژوورەوە هاواری کرد:

ـ تەقە مەکەن.. تکایە تەقە مەکەن، دێینە دەرەوە و خۆمان دەدەین بە دەستەوە..

فەرماندە:

ـ زۆر باشە.. ئەوە باشترین کارە کە دەیکەن، چەکەکانتان دانێن و وەرنە دەرەوە..

وەك وتیان، چەکەکانیان فڕێ دا و دەستیان کردبووە پشتی سەریان و هاتنە دەرەوە..

فەرماندە:

ـ بکەونە سەردەم.. هەر ئێستا بکەونە سەردەم!...

لە ناو تۆز و ڕەشووی ئەو کوچەیەدا، کەوتنە سەردەم.. پاشان فەرماندە فەرمانی بە دوو سەربازی هاوڕێم کرد: دەستەکانیانی ببەستنەوە.. پاشان فەرمانی بە سەربازەکان کرد: هەستنە سەرپێ و بە ڕیز بووەستن.. چوار سەرباز بوون، دوو گەنجی چوارشانە و یەکێکی مناڵکار و یەکێکی بە

تەمەن.. چاوەڕێم نەدەکرد فەرماندە بە زوویی ئەو فەرمانە دەربکات: فەرمانی بە من و سێ سەربازی دیکە کرد، هەر یەکێکمان بچینە بەردەمیان و یەکی فیشەکێك بنێین بە نابەینی بڕۆیانەوە.. لە ماوەیەکی کەمدا، سێ سەربازەکەی تر، بەبێ بیرکردنەوە، دووکەڵیان لە سەری سەربازەکان هەستان.. سەرە گەیشتە سەرەی من، لە ماوەی چەند چرکەیەکدا خۆم لە بەردەمی یەکێ لە سەربازە گەنجەکان بینییەوە.. گەنجێکی سپیکەلە بوو، بە جۆرێك تەپوتۆز و دووکەڵی جەنگ سپێتییەکەی بۆ نەشاردرابووەوە.. سادە دەهاتە پێشچاوم، چونکە تەواوی چەك و نیوتاق و پاڵتۆ جەنگییەکەی فڕێ دابوو.. بەڵام ئەوەی سەیر بوو، بە پێچەوانەی تەواوی ئەو کەسانەی لە ساتێکی وادا، کە چاوەڕوانی موعجیزەیەك دەکەن بە فریایان بکەوێت و ڕزگاریان بکات.. وەك ئەوەی بە مەرگی خۆی خۆشحاڵ بێت، زۆر ئارام بوو، خەندەیەکی قووڵیش لەسەر لێوانی بوو.. هەر بۆیە نەدەکرا بەبێ ئەوەی پرسیاری ئەوەی لێبکەم بیکوژم.. لێم پرسی:

ـ بۆچی .. بۆچی پێدەکەنیت؟ .. نازانیت مێشکت دەپژێنم؟

سەری کەمێك بەرز کردەوە و چاوی لە چاوم بڕی و وتی:

ـ دەزانیت.. دەزانیت من و تۆ یەکتری ناناسین؟

ـ ... ڕاستە.. من و تۆ یەکتری ناناسن.. بەڵام خۆ دەزانین دوژمنی یەکترین.

ـ بەڵام پرسیارەکە ئەوە نییە.. بەڵکو ئەوەیە، بە چ هۆکارێك من و تۆ لە ئێستادا لێرەین؟.. چی بۆتە هۆی ئەوەی من و تۆ بەبێ ئەوەی یەکتر بناسین، بووینەتە دوژمنی یەکتری، مێشکی یەکتری دەپژێنین؟ باشە تۆ بۆ لە خۆت ناپرسی: من و تۆ ئەگەر لە قاوەخانەیەکدا یەکترمان ببینیایە، چیمان دەکرد، پێم بڵێ چیمان دەکرد؟مێشکی یەکترمان دەپژان؟... یان ڕەنگە قاوەیەکمان پێکەوە بخواردایەتەوە و پاشان خەندەیەکمان بۆ یەکتر بکردایە، هەر یەکێکمان بە ڕێگای خۆیدا بڕۆیشتایە.. کامیانمان دەکرد.. تۆ پێم بڵێ کامیان؟.

ڕاستی وەڵامێکم بۆ قسەکانی نەبوو.. خەریك بوو منی دەخستە ناو بیرکردنەوەوە.. لەناکاو دەنگی فەرماندە بەرز بۆوە و هۆشی هێنایەوە بەبەرما...

فەرماندە:

ـ چییە بۆ کارەکەت ئەنجام نادەیت؟ دەڵێی دوودڵی نەفام.





لەو کاتەدا سەربازەکە کەمێك هاتە پێشەوە و لوولەی دەمانچەکەمی گرت و خستییە سەر ناوچەوانی خۆی و وتی:

دوودڵ مەبە، خێرا کارەکەت تەواو بکە، من دڵگران نیم کە تۆ دەمکوژیت.. چونکە هەم من و هەم تۆش دۆڕاوین و براوە نین، هەرچەندە هەر من لە تۆ براوەترم.. چونکە من ئیدی لە کوشتنی ئەو سەربازانە دەوەستم، کە نازانم بە چ هۆیەك دەیانکوژم.. بەڵام تۆ...

بە هۆی فەرماندەوە قسەکانی تەواو نەکرد.. چونکە فەرماندە کەمێك نزیك بووەوە و هاواری کرد:

ـ چییە بێدەماخ! بۆچی وەستاوی؟ هەر ئێستا تەواوی بکە.

بە دەست لەرزێکی زۆرەوە، پەنجەم نا بە پەلەپیتکەی دەمانچەکەمدا و باروت و خوێن و گۆشم لەگەڵ یەکتریدا تێکەڵاو کرد. خوێنێکی زۆر پرژا بە دەم و چاوما.. لە ناو خۆڵ و ڕەشووی ئەو کوچەیەدا کەوت.. چاوی لە ئاسمان بڕی و گیانی دەرچوو.. خوێنی بەسەر ئەو کوچەیەدا ڕێچکەی بەست و تێکەڵ بە خوێنی هاوڕێکانی بوو.. هەتا بە جێشمان هێشت، هەر خەندەیەکی سیحراوی لەسەر لێوەکانی بوو...

# دەرگا سەوزەکە

نووسینی: ئۆ هێنری
و. لە سویدییەوە: باران

وایدانێ پاش نیوەڕۆیەك بە پیاسە، بە شەقامی -برۆدوەی-دا دەچیتە خوارەوە، پاش دە خولەك چێژبردن لە کێشانی سیگارەکەت، بیر لەوە دەکەیتەوە ئایا بچیت بۆ سەیری شانۆگەریی تراژیدیایەکی سەرگەرمکەر یاخود بۆ بینینی نمایشێکی خەندەهێن. لە پڕێکدا یەکێك دەست دەخاتە سەر قۆڵت، خێرا ئاوڕ دەدەیتەوە و نیگات لە چاوە جوانەکانی



خانمێکی قەشەنگ گیر دەبێت. ئەو لە پۆشاکێکی چەرمدا، بە خشڵەکانییەوە دەدرەوشێتەوە و ساندویچەکەی دەستیت بۆ درێژ دەکات، ئەوجا دێتە پێشتر، بە مقەستێکی بچکۆلە قۆپچەی پێش دوادوگمەی پاڵتۆکەت دەبڕێت و بە چرپە دەڵێت: لاتەریبەکان.چرکەیەك دوای ئەوە لە جادەکەی بەرامبەرەوە، دەیبینیت لەسەر شانەوە بە خەمباری لێت دەڕوانێت و لە ناو قەرەباڵەغییەکەدا ون دەبێت.

سەرت دەسوڕمێت، وا نییە؟ هەڵبەت بە ڕووداوێکی ڕۆژانەی ئاسایی دانانێیت، ڕەنگە بەبێ ساندویچەکە، بە سەراسیمەیی لە پیاسەکەت بە بڕۆدوەیدا بەردەوام بیت و بە شڵەژاوی دەستت بەو کونە قۆپچەیەوە بگریت، کە لەناکاو بێقۆپچە بوو.

ڕۆدۆڵف ستاینەر وای کرد و چەند شەوێکیش نەچووەوە ماڵەوە، بە شەقامەکاندا سووڕایەوە، بەو هیوایەی جارێکی تر و بە شێوەیەکی دی ڕووبەڕووی ماجەراکەی ببێتەوە. ئەو پێی وابوو لە پشت هەموو سووچە شەقامێکەوە ماجەرایەك خۆی مەڵاس داوە، ئارەزووشی بۆ ململانێکردنیان، تووشی زۆر ڕێگای نادیار و پڕمەترسیی کردبوو. هەر لەو ماوەیەدا دوو شەوی لای پۆلیس بەسەر بردبوو، چەند جارێك دووچاری فێڵ و تەڵەکەی فریوودەران بووبووەوە و باجی ئێوارەیەکی، ڕفاندنی کاتژمێر و جزدانەکەی بوو، بەڵام هیچ شتێك لە لای ئەو، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی کۆسپەکانی، ڕێگر نەبوو.

شەوێك کە لە ناوەندی شارەکە، بە شەقامێکی چەپەکدا دەسووڕایەوە، لە کەناری شۆستەکەوە دوو کۆمەڵ خەڵك وروژمیان هێنا، بەشێکیان لە ڕیستۆرانەکان هاتبوونە دەرەوە و بەرەو ماڵ دەبوونەوە بەڵام لەو ساتەدا، گەنجە سەرکێشەکە، جارێکی دی دڵی کەوتە خورپەوە.

وەکتر، ئەو لە دوکانێکی پیانۆ فرۆشیار بوو، ئەمە تاکە شتی ئاسایی بوو تیایدا، ئەگینا هیچ شتێکی لە کەس نەدەچوو، بۆ نموونە، بۆینباخەکەی دەرزیگرەی تایبەتی پێوە نەبوو، بەڵکو لە موستیلەیەکی هەڵکێشابوو.

هەر لە پیاسەی ئەو ڕۆژەیدا و لەگەڵ تێپەڕبوونی بە ناو خەڵکەکەدا، بەدەم ڕێوە، سەرنجی چووە سەر تابلۆیەکی ڕۆشن، لە بەردەم ڕیستۆرانێکدا بوو. لە یەکەم لێڕوانینیدا، وا پێدەچوو

تابلۆکە بانگەشەی ڕیستۆرانەکە بێت، بەڵام بە لێوردبوونەوەی دەردەکەوت کە تابلۆکە تایبەتە بە کلینیکێکی ددان لە هەمان بینادا. لە بەردەم دەروازەکەشیدا پیاوێکی ڕەشپێستی کەڵەگەتی پڕ خەیاڵ بە چاکەتێکی سوور و پانتۆڵی زەرد و کڵاوی شینەوە وەستا بوو، کارتی ڕیکلامی بەسەر ئەو پیادەڕۆیانەدا دابەش دەکرد، کە بەویادا تێپەڕ دەبوون. ماوەیەك بوو پزیشکەکان بەو شێوەیە بانگەشەیان بۆ خۆیان دەکرد. هاوڕێ گەنجەکەمان پێشتر زۆر تووشی ئەم شێوازی ڕیکلامانە هاتبوو، بەڵام بەبێ ئەوەی هیچ کاغەزێکیان لێوەربگرێت و بێ ئەوەی بهێڵێت هیچ دکتۆرێك بڕیار لەسەر هەڵکێشانی چەند دانێکی بدات، بە گورجی بە لایاندا ڕەت بووبوو. لێ ئەم ئێوارەیە، ئەم پیاوە ڕەنگ تێرە، هێند سەرسەخت و پێداگر، کارتی بانگەشەکەی بۆ درێژ کرد، ئەم نەیتوانی خۆی لە لێوەرگرتنی دەرباز بکات. ستاینەر چەند هەنگاوێك ڕۆشت و چاوێکی بە کارتەکەدا خشاند، پاش ئەمدیووئەودیوکردنی، جارێکی تر خوێندییەوە. دیوێکی کارتەکە خاڵی بوو، لە دیوەکەی تری نووسرابوو (دەرگا سەوزەکە). لە بەردەم (ڕۆدۆڵف)ەوە پیاوێك ئەو کارتەی خۆی فڕێ دا، کە لە کابرای دابەشکەری ڕیکلامەکەی وەرگرتبوو. ڕۆدۆڵف نووشتایەوە و کارتەکەی ئەوی هەڵگرتەوە، ئەو کارتە، ناو و ناونیشانی دکتۆری ددانەکەی لێنووسرابوو، هەروەها باسی دروستکردنی تاقم و ڕووپۆشی ددان و ڕێگاچارەسەری بێئازاری لەسەر کرابوو.

سەرکەشە پیانۆفرۆشەکەمان وەستا و هەندێك بیری کردەوە. لە چاوتروکانێکدا، سووڕایەوە و بە ئاڕاستەی پێچەوانەی لێشاوی خەڵکەکەوە، بەسەر شەقامەکەدا چووەوە لای دەروازەی بینای کلینیکی ددانەکە. کاتێك بۆ دووەمجار بە بەردەم کابرا ڕەشپێستەکەدا تێپەڕی، وا دەرنەکەوت کە پیاوەکە بیناسێتەوە، چونکە دووبارە کارتێکی پێشکەش کرد. هاوڕێکەمان چەند مەترێك دوورکەوتەوە و تەماشای کارتەکەی کرد، ئەمیش بە هەمان خەت لێی نووسرابوو "دەرگا سەوزەکە"، بەڵام ئەو کارتانەی پیادەکانی تر پاش وەرگرتنیان فڕێیان دابووە سەر شۆستەکە، هەموویان هەر بانگەشە بوون بۆ دکتۆری ددانەکە!

ڕۆدۆڵف گەڕایەوە و جارێکی دی بە بەردەم پیاوە ڕەشپێستە زەبەلاحەکەدا ڕۆشت، ئەمجارە کارتی وەرنەگرت بەڵام لە چاویدا هەستی بە تروسکەی بێڕێزی کرد. لاوەکە دوور لە شۆستەکە وەستا و ڕووانییە ڕووکاری بیناکە. لە بەردەم ئەو ڕووبینایەدا سەرکەشەکەمان لە خشتەبردرا. بیناکە باریك و پێنج نهۆم بوو، قاتی ژێرەوەی ڕیستۆران بوو، نهۆمی سەرتر کە





ئەو کات تاریك دەچووەوە، پێدەچوو وەرشە بێت و قاتی دوای ئەویش کلینیکی ددانەکە بوو. کۆمەڵێك تابلۆی تێکەڵوپێکەڵیش وەك قوتعەی بەختگرەوە و پزیشك و مۆسیقی و بەرگدروو، ئەوەی  پیشان دەدا، کە چ جۆرە کەسانێك نیشتەجێی قاتەکانی سەروو کلینیکەکەن. پەردەی پەنجەرەکانی دووا نهۆم و هەندێك ئینجانەی گوڵ و شووشە شیری سەر تاقەکانیش، وای دەگەیاند کە نهۆمی سەری سەرەوە شوقە وماڵی خەڵك بێت.

دوابەدوای تێڕامانەکەی، بە هەنگاوی دڵنیاوە، ڕۆدۆڵف چووە ناو بیناکە و بە پلیکانە بەردینەکانیدا چووە سەرەوە. ڕووپۆشێکی سوور تەواوی قادرمەکانی تا قاتی دوو داپۆشیبوو، بەڵام لە نهۆمەکانی سەرەووە پێپلیکانەکان گچکەتر دەبوونەوە. ڕێڕەوی قادرمەکان بە ڕووناکییەکی کز ڕۆشن بوو، ئەمە بە هۆی دوو گڵۆپەوە، کە لە لای چەپ و لای ڕاستەوە دەسووتان و لە پشت گڵۆپەکەی لای چەپەوە، تروسکەی دەرگایەکی سەوز دەردەکەوت.

ڕۆدۆڵف پاش کەمێك سڵکردنەوە، چوو لە دەرگا سەوزەکەی دا و لە چاوەڕوانیی وەڵامدانەوەیدا، هەناسەی سوار بوو. ئاخۆ چی لە پشت ئەم دەرگایەوە خۆی حەشار دابێت؟ بڵێی کونی تلیاکخۆرەکان بێت؟ یان پەناگەی چەتەکان؟ یاخود دەشێت ژنێکی جوانی ڕفێنراوی لێبێت و بەو شێوازە داوای بەدەنگەوەچوونی ئەم بکات؟

گوێی لێبوو کەسێك لە پشت دەرگاکەوە، بە هێواشی دەجووڵایەوە. لەگەڵ کردنەوەی دەرگاکەدا خانمێکی گەنج دەرکەوت، خانمێکی بێڕەنگ کە تەمەنی بیست ساڵیش نەدەبوو، هەمووو ئازای گیانی هەڵدەلەرزی.

کچەکەکە دەسکی دەرگاکەی بەردا، ساتمەی دەکرد، لەو ساتەدا ئەگەر ڕۆدۆڵف نەیگرتایە، دەکەوت و بەلادا دەهات.ستاینەر خانمەکەی بردە ژوور و لە سوچێکدا لەسەر کەرەویتەیەك داینا، پاشان چوو دەرگای دەرەوەی داخستەوە و چاوی بە ژوورەکەدا گێڕا، ژوورەکە خاوێن و ڕێکوپێك بوو، بەڵام کەلوپەلەکانی ساکار بوون.

خاتوونەکە وەك ئەوەی بێهۆش بێت، هیچ جووڵەی نەدەکرد. کوڕەکە بیری دەکردەوە چۆن یارمەتیی بدات، ئایا هەناسەدانی دەستکردی بۆ بکات؟ نا، ئەوە کاتێك دەکرێت، کە خەڵك خەریك بێت بخنکێت. چوو بە کڵاوەکەی دەستی کرد بە باوەشێنکردنی دەموچاوی. ئەم

شێوازەی کاریگەریی خۆی زوو دەرخست، لەسەر لێواری شەپقەکەوە بینیی کچەکە چاوەکانی کردەوە. کوڕەکە وەستا و لێی ڕاما، خانمەکە چاوەکانی ڕاستگۆ و خاکی بوون، لوتێکی بچکۆلەی هەبوو، قژیشی لوول و قاوەیی بوو. لە ڕاستیدا ئەمە جوانترین ماجەرا بوو، کە ڕۆدۆڵف خەونی پێوە بینیبوو.

کچەکە کە هاوکات تەماشای دەکرد، زەردەخەنەیەکی هێمنی کرد و وتی:

ـ من بوورامەوە، بەڵام ئەمە سەیر نییە بۆ کەسێك کە سێ ڕۆژ بێت، لەتێك نان چییە، نەیخواردبێت.

ڕۆدۆڵف حەپەسا و لەپڕ وتی:

ـ ئەوە چی دەڵێن؟ تکایە لێرەدا مەجوڵێن، هەر ئێستا دێمەوە.

پاش ئەمە، لاوەکە لە دەرگا سەوزەکەوە ڕای کردە دەرەوە و دوای چارەکێك بە باوەشێك نان و خواردنەوە هاتەوە، کە لە ڕێستۆرانەکەی خوارەوەی کڕیبوون. خۆراك و شتومەکەکان پێك هاتبوون لە نان و کەرە، گۆشت و پارچەیەك مریشك و ترشیات، هەروەها چۆرەك و پاکەتێك شیر و بتڵێك چای گەرم.

ستاینەر پاش دانانی بارەکەی لەسەر مێزەکە، بە توندی وتی:

ـ نانەخواردن بێبەرگریت دەکات، دەبێت پەیمانم پێبدەیت کە ئەمە دووبارە نەکەیتەوە. ئێستا فەرموو خواردنی ئێوارە ئامادەیە.

ڕۆدۆڵف یارمەتی کچەکەی دا تا چووە سەر کورسییەك و پرسی:

ـ کوپەکان لە کوێدان؟

ـ لە ڕەفەی ژێر پەنجەرەکەدا.




کە بە کوپەکانەوە هاتەوە، بینیی کچەکە خەریکە شووشەی ترشیاتەکە دەکاتەوە، ڕۆدۆڵف بە زەردەخەنەوە شووشەکەی لێوەرگرت، پەرداخێك شیری بۆ تێکرد و وتی:

ـ لە پێشدا شیر بخۆرەوە، پاشان هەوڵ بدە مریشك بخۆیت، ئەگەر گەدەت باش کاری خۆی کرد، ئەوا بەیانی ترشیاتەکە بخۆ. من دەتوانم میوانی ئێوە بم؟

بەدەم ئەم قسانەوە، کوڕەکە کورسییەکی بۆ خۆی هێنایە پێشەوە. چا گەرمەکە بریسکەی بۆ چاوەکانی کچەکە گەڕاندەوە و ڕوومەتەکانی ڕەنگیان



تێهاتەوە. ئەو وەك ئەوەی قەت تێر نەخوات، وەك گیاندارێکی کێوی دەیخوارد و دەیخواست بێگومان بێت لەوەی ئەو کوڕە گەنجە بۆ یارمەتیدانی ئەو لەوێیە.

وردەوردە خانمەکە دەستی کرد بە گێڕانەوەی بەسەرهاتی خۆی بۆ کوڕەکە. ئەگەرچی چیرۆکەکەی، وەك باسی کارکردنی کچێکی کارمەند لە فرۆشگایەك، بۆ موچەیەکی مەمرەومەژی و دەرکردنی لە ئیش، پاش نەخۆشکەوتنی، بەسەرهاتێکی زۆر سادە و گشتی بوو لە شارێکی گەورەی وەك نیویۆرکدا، بەڵام بۆ ڕۆدۆڵف، باسەکە لە داستانی ئۆدیس سەرنجڕاکێشتر بوو، بۆیە وتی:

ـ بیر لەوە دەکەمەوە بەسەر چیدا ڕۆشتوون و چەند زۆرتان چەشتووە.

ـ خۆم پێم وا نییە، ئەم شتانە ڕۆژانە زۆر ڕوو دەدەن.

ـ ئەی خزمتان نییە؟

ـ نا، لە هیچ کوێ.

ـ هەروەها منیش، لە دونیادا زۆر تەنیام.

ـ بیستنی ئەمە دڵخۆشم دەکات.

کە کچەکە ئەمەی وت، خۆشحاڵیی لە ڕوخساری رۆدۆڵفیشدا، بە هەر هۆیەك بێت، دەرکەوت.

خانمەکە تا دەهات، چاوەکانی قورس دەبوون و لەگەڵ هەڵکێشانی هەناسەیەکی قووڵدا وتی:

ـ زۆر تێرم و بێئەندازە خەوم دێت.

ڕۆدۆڵف هەستایە سەر پێ، شەپقەکەی گرت بە دەستییەوە و وتی:

ـ کەواتە من دەڵێم شەوشاد.

کە ئەمەی وت، لە سەیرکردنەکانی ئەودا وا تێگەشت کە بڵێت؛ ئێوە لە دەرەوە بنوون باشتر دەبێت، بۆیە ئەم بەردەوام بوو، وتی:

ـ باشە، من بەیانی دێمەوە تا بزانم چۆنن، تازە ئاسان نەجاتتان نابێت لێم.

کە ڕۆدۆڵف چووە لای دەرگاکە، کچەکە ڕایگرت و لێی پرسی:

ـ دەبێت پێم بڵێیت، تۆ چۆن بوو لە دەرگاکەی منت دا؟

ڕۆدۆڵف سەیرێکی کچەکەی کرد و کارتەکەی بیر کەوتەوە. بیری لەوە کردەوە ئەگەر کەسێکی تر ئەو کارتەی وەربگرتایە، چی ڕووی دەدا؟ هەستی بە غیرە کرد و لە دڵی خۆیدا وتی نا، ئەو نابێت قەت بەوە بزانێت کە برسێتی ئەوەندەی بۆ هێناوە، توانیوییەتی ... خەیاڵەکەی پچڕاند و وتی:

ـ یەکێك لە کۆککەری پیانۆکانمان لەم نهۆمە دەژی، بەختی من لەوەدا بوو کە لە دەرگایەکی هەڵەم دا، ئەمە هەموو شت بوو.

بەر لەوەی کوڕەکە دەرگاکە لە دوای خۆی دابخات، دوایین شت کە بینیی، زەردەخەنەی کچەکە بوو. پاشان لە ناو تاریکایی ڕێڕەوەی قادرمەکاندا، ڕۆدۆڵف ستاینەر-ی لاو سەرنجی دەرگاکانی تری ناو بیناکەی دا و بینیی کە دوابەیەکی دەرگاکان لە هەموو نهۆمەکان سەوزن!

بە ڕامانێکی قووڵەوە لە بیناکە هاتە دەرەوە، تەماشای کرد، پیاوە ڕەشپێستە کەڵەگەتەکە بە دوو دەستە کارتی جیاوازەوە هەر لەوێ ماوە، ئەم یەکڕاست چووە لای، کارتەکەی پیشان دا و وتی:

ـ ئەمە مانای چییە؟

پیاوەکە وەك جێبەجێکردنی ئەرکی کارەکەی، لە پێکەنینێکی پاندا، ددانە قەوی و سپییەکانی دەرخست و وتی:

ـ ئەم شەو یەکەمین نمایشێتی بەڵام تۆ فریای بینینی پەردەی یەکەمی ناکەویت.

لەگەڵ وتنی ئەمەدا، ڕەشپێستەکە، بە دەستە گەورەکانی، ئاماژەی بۆ هۆڵی شانۆگەرییەك کرد، لە شەقامەکەی ئەوبەرەوە، لەسەر تابلۆ بریسکەدارەکەی بەردەمی نووسرابوو: دەرگا سەوزەکە.



سەرنج:

کۆمەڵێك لە کارەکانی نووسەری ئەمریکی ئۆ هێنری زیاتر لە جارێك وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی سویدی و ئەوەندەی سەرنجم دابێت، وەك هەمیشە، وەرگێڕانەکان هەرگیز بۆ هەمان دەقیش تەواو هاوشێوە نەبوون، بەڵکو شێواز و زمانی وەرگێڕەکان جیاوازیی تێدا دروست کردوون. من دوای



وەرگێڕانی ئەم چیرۆکە لە سویدییەوە بۆ کوردی، لە بەراوردکردنیدا بە دەقە ئینگلیزییەکە، بۆم دەرکەوت کە هەندێك پەڕەگرافی کورت کراوەتەوە و ناوی پاڵەوانەکەش کراوە بە ریچارد، بە لای منەوە کورتکردنەوەکە لە دەقە سویدییەکەدا لە جوانیی چیرۆکەکەی کەم نەکردبووەوە، بەڵام پێم باشتر بوو لە وەرگێڕانە کوردییەکەدا، ناوی پاڵەوانەکە وەك دەقە سەرەکییەکە دابنێمەوە، کە رۆدۆڵف ـە.

سەرچاوە:

**Dast Magazine**

# چەند دیمەن یان ساتگەلێک لە جیهانی (کەنارگرتووەکان).

میران ئەبراهام

## خوانی سەرەتان

دوو ڕۆژێك بە سەر ڕۆژی لەدایکبوونی دایکمدا تێپەڕیبوو، بەیانییەکی خۆرەتاو خۆم بە ژوورەکەی دایکمدا کرد، تاکو پێی بڵێم کە بۆ هەفتەیەك دەچم بۆ وڵاتی میسر، پێش ئەوەی بگەمە ناو ژووری نووستنەکەی دایکم، لە ناو داڵانەکەوە، بانگم لێکرد:



- 'دایە... دایە من بۆ هەفتەیەك دەچم بۆ میسر.'

کاتێ گەیشتمە ناو ژوورەکەی و لە تەنیشتی جێگاکەیەوە وەستام، لێی ڕوانیم و هیچی تری نەگوت، منیش بەردەوام بووم و پێم گوت:

- 'مۆزەخانەی مێژوویی ئەمستردام لە پەیوەندی لەگەڵ مۆزەخانەی نەتەوەیی میسر لە قاهیرە، بە مەبەستی زانیاری گۆڕینەوە لە کاروباری مۆزەخانەدا، کارمەندێکی ئەوان ئەم هەفتەیە دەگاتە ئەمستردام، بانگهێشتەکە تەنها بۆ یەك کەسە، خۆت دەزانیت کە من چەند خەومە جارێك بچم بۆ میسر... ئەزانی دایکە... بەڕێوەبەری مۆزەخانە هێنری پراخ لە ناو هەموو هاوکارانمدا چی پێگوتم: 'مارتن تۆ هەفتەیەك دەچیت بۆ میسر و دەبیتە نوێنەری مۆزەخانەکەمان، من تۆ زۆر بە لێهاتوو دەزانم بۆ ئەم مەبەستە و دڵنیام لە توانای تۆ.'

دایکم بە سەرنجەوە سەیرێکی کردم و گوتی:

- 'کەیە سەفەرەکەت؟'

- 'هەفتەی داهاتوو... ڕۆژی دەی ئەم مانگە، یانی من لە نزیکەوە ئەهرامەکان دەبینم، کەلوپەل و پەیکەرەکانی فیرعەونەکان دەبینم، ئەزانیت دایکە... ئەو سەفەرە چەند گرنگە بۆ من؟!'

لەناکاو دایکم ڕووی لێوەرگێرام و بێدەنگ لە دیوارەکەی تەنیشتی دەڕوانی، من لێم پرسی:

- 'دایە چییە... بۆ وا بیدەنگ بوویت؟'

چەند جارێك بانگم کرد، بەڵام هیچ وەڵامێکی نەدامەوە، چووم لەسەر جێگاکەی لەلایەوە دانیشتم و باڵێکم لەسەر شانییەوە برد و لە ملیەوە ئاڵاندم، ڕوویم وەرگێڕا بە لای خۆمدا و سەرم دانەواند تاکو بتوانم لە چاوەکانی بڕوانم، بینیم چاوەکانی تەر بوون، لەوەدا بوون فرمێسکیان لێبرژێت، لێم پرسی:

- 'ئەوە چییە؟ ... هیچ شتێك ڕووی داوە کە من ئاگاداری نەبم؟ ... گوێت لێم بوو چیم گوت، یان بۆت دووبارە بکەمەوە؟!'

- 'گوێم لێت بوو ئازیزم، من تۆزێك بێزارم لە خۆم، بمبوورە... کێ ڕێی لێگرتوویت...





تۆ ئازادیت.'

توند نووساندم بە خۆمەوە و گوتم:

- 'مەبەستت چییە... من ئازادم؟!'

بە ساردییەکەوە لێی ڕوانیم و پێی گوتم:

- 'مەبەستم... تۆ خۆت ئازادیت بۆ کوێ دەچیت و چی دەکەیت.'

- 'بۆ هەفتەیەك دەچم بۆ میسر، بۆ قاهیرە تەنها هەفتەیەکم پێدەچێت.'

- 'هەر وەك پێم گوتیت، تۆ پێویستە خۆت بڕیار بدەیت.'

ماچێکی سەریم کرد و دوای تاوێك بێدەنگی، گوتم:

- 'ئەڵێم دایە... هاوڕێکەت... کارڵ چۆنە؟'

- 'کارڵ... ئەم هەفتەیە لە ئەمستردام نییە و خەریکی ساخکردنەوە و فرۆشتنی ئەو میراتییەیە، کە باوکی پاش مردنی بۆی بەجێ هێشتووە لە دوورگەی تێسڵ.'

- 'ئاخ... بەداخەوە بۆ کارڵ!'

- 'تۆزێك لەمەوپێش قسەم لەگەڵ کرد، ئێوارە داوەتی ئەوین.'

- 'یانی منیش؟'

- 'بەڵێ... تۆش... خۆشحاڵم دەکەیت ئەگەر ئامادەبیت!'



ئەو ڕۆژە، بۆ ئێوارەکەی لە چێشتخانەیەکی یۆنانی لە سەنتەری شاری ئەمستردام داوەتی کارڵ بووین، بێجگە لە خواردنەوەی دوو پەرداخی بچووك ئوزۆ، کە من یەکەمجارم بوو تامی بکەم، دایکم و کارڵ داوایان لە خزمەتچییەکە کرد کە شەرابی سوورمان بۆ بێنێت.

بە بیرم دێت دایکم بە دەنگێکی بەرز بە خزمەتچییەکەی گوت، 'تکایە شەرابی سوورمان بۆ بێنە، چونکە خەیاڵی من هیچ پەیوەندیەکی نییە لەگەڵ ئەم مەشروبەدا، ئەڵێی میز دەکەیتە ڕۆحمەوە.'

تاکو خواردنەکەمان بۆ هات، کە ماسی بوو، بە هەرسێکمان دوو شووشە شەرابمان خواردەوە، شەرابی یۆنانی... وشك، تامی وردەداری لێدەهات، ئەو



شەرابە نەبوو کە من و دایکم لە ماڵەوە هەمانبوو، کارڵ زۆر دڵخۆش دیار بوو... دەم بە پێکەنین و چاوە زیتەکانی لە من و دایکم نهدەتروکاندن.

لە کاتی نانخواردندا دایکم فرسەتی هێنا و شووشەیەك شەرابی تری داوا کرد، کە هێشتا زیاتر لە نیوەی ماسییەکان لە سەر قاپەکانمان مابوون. دیسان شووشەی شەرابەکەی بەرز کردەوە و گوتی:

- 'کوڕینە بۆ کێ شەراب تێکەم؟!'

لەگەڵ کارڵ بە کۆرس گوتمان:

- 'بۆ من.'

پاش ئەوەی هەرسێکمان دەستمان کرد بە پێکەنین، دایکم گوتی:

- 'مارتن... هاوڕێکانت چۆنن؟'

- 'هاوڕێکانم... ئەو پرسیارەت بۆ یەکەمجارە... دەزانیت؟!'

ڕاست لە چاوەکانیم ڕوانین و لێم پرسی:

- 'مەبەستم... تۆ هەرگیز بە لاتەوە گرنگ نەبووە من چی دەکەم و بۆ کوێ دەچم، یان لەگەڵ کێ هەڵسوکەت دەکەم.'

لەمەوە بێدەنگی کەوتە نێیوانمان، من و دایکم لهژێرەوە سەیری چاوی یەکتریمان دەکرد، دەستم خستە سەر دەستی دایکم و لە چاوەکانیم ڕوانین و گوتم:

- 'بمبوورە... کام لە هاوڕێکانمت مەبەستە؟! هاوڕێکانی ئەوسای قوتابخانەم، ئەوە ساڵانێکی دوورودرێژە هیچیانم نەدیوەتەوە، یان ئەو هاوڕێیانەم کە ساڵانێك پێکەوە ڕۆژانە لە ژێرزەمینێکی کۆفیشۆپێکدا خۆمان بەند دەکرد و تاوێك خەیاڵمان دادەبڕی لە هەموو شتێك؟! ئەوانیش یەك یەك خۆیان لێ ون کردم، هەست دەکەم هەموو هەر لەم شارەدان و ڕۆژانە بەریەکیش دەکەوین... بەڵام بە جۆرێك غەریب کەوتووین بە یەکتری، کە یەك نەناسینەوە.'

- 'باشتر... من ئەوکات زۆر خەمم بوو کە تۆ گیرۆدە بیت و خۆت ون بکەیت، من مەبەستم هاوڕێکانی شەوتن، وەکو خۆت ناویان دەنێیت.'





- 'ئاها، هاوڕێکانی شەوم... مرۆڤە غەریبەکانی ئەم شارە، ئەو بێدەرەتان و نابووتانەت مەبەستە، کە لە دەست زوڵم و زۆرداری لە کولانەی خۆیان ڕاونراون و بە ڕێکەوت لەم شارە گیرساونەتەوە.'

- 'ئەوانەن هاوڕێکانت؟ من وامزانی....'

- 'کە... هەر ئەوانەی جارانن؟! نەخێر.'

- 'گرنگ ئەوەیە کە تۆ هەست بە تەنیایی نەکەیت!'

- 'نەخێر... چەند کەسێکم بەڕێکەوت ناسیوون.'

- 'کاتیان هەیە بۆ تۆ؟ ... مەبەستم، کاتت لەگەڵدا بەسەر دەبەن؟!'

- 'بەڵێ!'

- 'یانی، بێجگە لە ئێمە پەیوەندیی ترت هەن.'

سەرێکم بۆ ڕاوەشاند و گوتم:

- 'بێگومان.'

هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا و بە هێواشی گوتی:

- 'پەیوەندی بۆ ئێمەی مرۆڤ زۆر گرنگە.'

پاش ئەوەی تاوێك بێدەنگ بووین، دووبارە دایکم گوتی:

- 'من نامەوێت ئەمشەو پەرداخەکەم بە بەتاڵی ببینم.'

کاتێك پەرداخەکەی منیشی نیوەپڕ کرد، بەرزم کردەوە و گوتم:

- 'بۆ ئێمە.'

کارڵ دەستی هەڵبڕی و پەرداخەکەی دا لە پەداخەکەی من و هیچی نەگوت، لەم کاتەدا دایکم سەری داخست و خۆی بێدەنگ کرد، من و کارڵ سەیرێکی یەکمان کرد، دوودڵی و بێئاگایی خۆمان لەو بێدەنگییەی دایکم لەچاوی یەکتردا خوێندەوە، دایکم هەردوو دەستی توند لە ملی بڵندی پەداخەکەی نا و هەڵیدا، بێئەوەی سەیرمان کات، بە کزۆڵەییەکەوە و بە دەنگێکی زۆر نزم، کە زیاتر لە نووزەنووز دەچوو، گوتی:

- 'من دوێنێ بۆ پشکنین لە نەخۆشخانە بووم!'





دەستبەجێ هەستم بە گەرمییەك كرد، گەرمییەك هەموو لەشمی داگرت و لە ماسولكەكانمەوە ئارەقێكی سارد ڕژایە سەر پێستم، وەكو بزانم چ بەڕێوەیە و دایكم دەیەوێت چ هەواڵێكمان پێبڵێت، بە هەڵەشەییەكەوە ڕووم لە دایكم كرد و پرسیم:

- 'ئێ... ئێ، گوتیان چی... دیسان سەرەتانەكەیە؟!'

- 'دەبێت بە زووترین كات پەیوەندی بە نەخۆشخانەوە بكەم... بۆ چارەسەر.'

بێدەنگی دایگرتین... بێجگە لە ورتەورتی چواردەورمان و دەنگی كەوچك و قاپی نانخۆران و لێكدانی پەرداخی شەراب و ئوزۆ، هیچی ترت نەدەبیست، ئەو هەواڵە لە بیری بردینەوە بۆچی هاتبووین بۆ ئەو جێگایە، پەرداخە نیوەپڕەكەی خۆمم لەسەر مێزەكە دانا و كورسیەكەم نیو مەترێك كێشایە دواوە، پاڵم لێدایەوە و بێوچان لە چاوەكانی دایكمم دەڕوانین، هێمنتر لە ڕەزمی قسەكانی پێشترم پرسیم:

ـ 'كەواتە من سەفەرەكەم نەكەم باشترە!'

ماسولكەكانی دەموچاوی گرژ كردن و بە توڕەییەكەوە گوتی:

ـ 'تۆ سەفەری خۆت دەكەیت... خەمی منت نەبێت، ئازیزم من بەتەمای مردن نیم... بە تایبەتی لە ئێستادا، كە بۆ یەكەمین جارمە چێژی خۆشەویستی دەكەم.'

چاوەكانی پڕ بوون لە فرمێسك و دەموچاوی ڕەنگێكی زەردیان بەسەردا ڕژابوو، تاوێك بوو بێدەنگ دانیشتبووین، دایكم هەستا و داوای لێكردین كە بڕۆین باشە، دیار بوو زیاتر بۆ شكاندنی ئەو بیدەنگییەی نێوانمان بوو. ملی ڕێمان گرتە بەر، تاریكیی شەو سێبەرێكی ڕەشی كێشابوو بەسەر زۆرینەی پارچەكانی لەشی شاردا، ئێمەش بێدەنگ چەندان هەنگاو لە دەرەوەی ڕووناكیی دارگڵۆپەكاندا و پاشان چەند هەنگاوێك لە ناو سنووری ڕووناكییاندا بەردەوام دەڕۆشتین، سەكۆی شەقامەكان وەكو پۆدیۆمێك، گڵۆپە ناوازەكان لەو دەوروناوە دیكۆرێكیان خوڵقاندبوو، پیادەڕەوەكانی شەویش وەكو ئەكتەرێك خۆیان تێدا نمایش دەكرد و دیسان لە تاریكیی دەرەوەی سنووری ڕووناكیی گڵۆپەكاندا یەك یەك ون دەبوون، ئەو خانووە كەڵەگەتە لاوازە چەند سەدە كۆنینانەی كە لە چڕیدا شانەكانیان لە یەك هەڵپێكابوون... بە ڕیز لە سەر كەناری ڕاستەجۆگاكانی





شاردا قنج ڕاوەستابوون، زۆربەیان ڕووناکیان لە خۆیان بڕی بوو... هەموو ڕەنگ دێز و ماندووی جەنجاڵی ڕۆژی شار بوون. پێکەوە دیمەنێکیان خوڵقاندبوو کە جێگا دەستی هونەری مرۆڤ و سروشتیان پیوەدیار بوون، ئەو خانوو سەکۆ و دار و دارگڵۆپە کۆنینانەی شار کە چەند سەدەیەك بوو هەزاران مرۆڤی وەك ئێمەیان بەڕێ کردبوون و خۆیان گیاندار و بێگیان بێڕەزامەندی خۆیان پارچەیەك بوون لە جەستەی شار.

من لە بەینی دایکم و کارڵ-دا ڕێم دەکرد، نازانم، نغرۆبوونی من بوو لە ناو خەیاڵەکانمدا ئەو بێدەنگییەی خوڵقاندبوو، یان سامان لە مردن و گرانی کەلیمەی سەرەتان بوو دەنگی لێ بڕیبووین و ڕۆحمانی تاساندبوو. دایکم کوتوپڕ خۆی کێشایە نێوان من و کارڵ-ەوە و گوتی:

- 'بەم قژەوە تاکو سەرەتان کەچەڵ و ناشرینی نەکردووم، با لە نێوانتاندا تاوێك ڕێ بکەم.'

توند باڵم لە باڵی هەڵپێکا و دەستم لەناو دەستی نا و گوتم:

- 'بەڵێ فەرموو خانم.'

- 'مارتن... ئازیز... تۆ دەمت داخە بە یارمەتیت... تاکو ئەم شەومان لێ تێك نەدەیت بە قسە ڕەقەکانت.'

بە پێکەنینێکەوە، گوتم:

- 'بەڵێ... باشە گەورەم.'

دایکم لەبەر خۆیەوە بە هێواشی دەستی کرد بە گۆرانیچڕین، سەرێکی با دا و پێی گوتین:

- 'کاتی گۆرانیچڕینە.....'

"بەسەر سەکۆکانی ئەم شارەدا
کە تەواوی دڵم پابەندە پێوەی
ئەم شارە هەست بە خەیاڵم دەکات
وەکو جوانترین شار لە وڵاتەکەمدا

هەموو خەڵکی ئەم شارە و
ئەو گڵۆپانەی لەم شارەدا دەگرێن



کەس نییە تەمەنای باشتری هەبێت
کە خەڵکی ئەم شارە بێت"

هەرسێکمان پێکەوە بە گۆرانیچڕین... بە کەناری ڕاستهجۆگاکانی شاردا دەڕۆشتین. کاتێك گەیشتینە ماڵەوە، دایکم هەرگیز نەیدەویست بێدەنگ بێت، بەردەوام هەمان گۆرانیی دەچڕی، سەیرێکی من و کارڵ-ی کرد و گوتی: 'کوڕینە بەردەوام بن... تکایە بێدەنگ مەبن و گۆرانی بچڕن، تاکو تەواو ڕۆحمان سەرمەست بکەین، مەستبونێك کە لە بیرمان چێتەوە لە چی ڕۆژێکداین، لە هەمان کاتدا خۆئامادەکردنتانە بۆ ڕۆژی من، کە لەوە دەچێت مانگی داهاتوو بێت یان ساڵی داهاتوو، شەرمە بۆ ئێوە لەو ڕۆژەدا بگرین بۆم و پێکەوە ئەم گۆرانییەم بۆ نەچڕن.'
تا درەنگانێك گۆرانیمان چڕی و ئاهەنگمان گێڕا، تاکو تاوێك وشەی سەرەتان لە بیر خۆمان بەرینەوە.

## ڕەنگ



ئەو ڕۆژەم باش بەبیر دێتەوە... تەمەنم پێنج ساڵان بوو، لە کاتێکدا دایکم سەرقاڵی نیگارکێشان بوو، منیش بە ماڵەکەدا ڕاوڕاوێنم بوو، سەرەتاتکێم لەگەڵ دایکمدا دەکرد، فرسەتم لێهێنا و بە سکەخشکێ خۆم گەیاندە ژێر ئەو مێزەی کە کەرەستەی نیگارکێشانەکەی لەسەر بوون، دایکم لەو دەمەدا لە بەردەمی ئەو مێزەدا وەستابوو... دەیان سەتڵی بۆیەی ڕەنگاوڕەنگی ئاکریڵی لەسەر بوون، بە مەبەستی ئەوەی لە ئاوڕدانەوەیدا بیترسێنم، تاوێك بوو چاوەڕوانی بووم خۆم و لێمەڵاس دابوو،

هەناسەم لە خۆم بڕیبوو، نەمزانی کە دایکم هەمان مەبەستی هەیە و بە قنگەچاوێك چاودێری کردبووم...
لەناکاوێك گوتی: 'ئەوەتا'
منیش لە عەزرەتاندا ڕاچڵەکیم و ڕاست هەستامە سەرپێ، لە ئەنجامدا هەموو سەتڵەبۆیەکان قلْپ بوونەوە بەسەر ئەرزی ژوورەکەدا.
لهتاو ئازاری سەرم و ترسی ئەو ڕووداوە چاوەڕواننەکراوە... چاوەکانم پڕبوون لە فرمێسك و دەستم کرد بە گریان... دایکم بهدەم پێکەنینەوە سەیرێکی کردم و تاوێك لە ڕەنگە ڕژاوەکانی ڕوانین، کە تاکو ئەوسەری ژوورەکە شەپۆلیان گەیشتبوون... چاوەڕوان بووم ئاخۆ کردەوەی دایکم چیبێت بەرانبەرم، دەستی بۆ ڕاکێشام و گوتی: 'بێنە دەستت'.
بە دوای خۆیدا ڕایکێشام و بە پێی پەتی بە ناو بویەکەدا چەند جارێك هاتین و چووین، دەستی کرد بە قاقای پێکەنین و بە لەپی بنی پێکانی شەپۆلی بە ڕەنگەکان دەدان. من هێشتا چاوەکانم پڕ بوون لە فرمێسك... دڵم خێرا لێی دەدا، دایکم تەماشایەکی کردم و گوتی، 'ئازیزەکەم، ئێمە ئێستا وەك دوو گیاندارین... با بڵێین من مەڕ و تۆش کارژەڵە، ئا... ئا... بێئاگاین لە یاسا و ڕێسای ژیان... چاك و خراپ، پاك و قێزەون، هەموو ڕووداوێك وەکو گەمەیەك دەبینین.'
من هێشتا نووزەنووزم بوو و ژیر نەبووبوومەوە، کاتێ ئەو لە ناو بۆیەکەدا لەسەر دەم پاڵ کەوت و دەستی کرد بە باڵەمەلەکردن، داواشی لە من کرد تاکو مەلە بکەم، 'دەی ئازیز وەرە.'



بە سەرسامییەوە لێم دەڕوانی، بە دەست و پەلی بۆیاوییەوە... بە پێکەنینەوە هەڵمەتی بۆ هێنام و لە باوەشی گرتم... دەستم کرد بە پێکەنین لەگەڵیدا و تاوێك تلاینەوە لە ناو بۆیەکەدا، بە چنگ بۆیەمان دەکرد بە سەروگوێلاکی یەکدیدا... بەوەشەوە نەوەستاین و بە ماڵەکەدا دەستمان کرد بە ڕاوڕواێن، ئاسەواری پێکانمان گەیشتنە هەموو جێگایەکی ماڵەکە، ساڵانێك دوای ئەو ڕۆژەش ڕەنگی ئاکریڵ بە کاشی و قادرمە و پێخەفی ژووری نووسنەکانیشەوە دیار بوون.
ڕۆژی دوای ئەو ڕووداوە، یەکەم ڕۆژی چونم بوو بۆ قوتابخانە... ساڵێك بوو لە خۆئامادەکردندا بووم بۆی، ڕۆژێك بوو... بۆ یەکەمین جار چەند کاتژمێرێك لە دایکم دابڕێم، ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژەش لە خانەی یادەوەرییەکانمدا باش تۆمارە و بە درێژایی ژیانم ئاسان دەستم پێیان ڕادەگات و دەتوانم



بیانگێڕمەوە.

پاش ئەوەی دایکم لە پۆلێکدا لە ناو زیاتر لە بیست قوتابیی تردا بەجێی هێشتم، مامۆستاکەمان گەنجێکی بالآبەرزی زەردەڵە بوو، من لە تەنیشت کچێکی قەڵەوی قژزەردەوە دانیشتبووم، کە لە پەسا خۆی لێ نزیك دەکرمەوە، مامۆستاکەمان خۆی پێناساندین و داوای لە ئێمەش کرد کە یەك یەك هەستینە سەرپێ و لە جێگای خۆمانەوە ناوی خۆمان و دایك و باوك و خوشك و برا و... ئەگەر گیانداری ماڵیشمان هەن، ناویان بڵێین، من لە ناوەڕاستی ئەو ڕیزەدا دانیشتبووم کە مامۆستاکەمان ئاماژەی پێکرد، کە لەوێوە دەست پێبکەین، چوار یان پێنج هاوپۆلم پێش من خۆیان ناساند، منیش هەستامە سەرپێ و زۆر بە خێرایی گوتم، 'من مارتن سەلەمۆ، دایکم ئەیفا سەلەمۆ.'

خێرا دانیشتمەوە، هەموو بە سەرنجەوە لێیان ڕوانیم، لە جێگای خۆیەوە مامۆستاکەم پرسی، 'مارتن تۆ... باوك و برا و خوشکت نییە؟!'

سەیرێکی مامۆستاکەم کرد و پاشان چاوێکم بەسەر هاوپۆلەکانمدا گێڕان و لەبەر خۆمەوە گوتم، 'نەخێر.'

لەپڕێکدا زەنگ لێی دا... دەنگی ئەو زەنگەی بۆ یەکەم جار بوو لە نزیکەوە گوێم لێی بێت... ئەو زەنگەی تاکو ئەو ڕۆژە لە ماڵی خۆمانەوە ڕۆژانە دوور گوێم لێی دەبوو، مامۆستاکەمان پێی گوتین، 'هەموو بچنە گۆڕەپانی قوتابخانە یاری بکەن، ئەگەر گوێتان لە دەنگی هەمان زەنگ بوو، دەبێت بگەڕێنەوە ئێرە و هەریەکە و لە جێگای خۆی دانیشێت.'





زۆر لە قوتابییەکان ئەوەندە پەلەیان بوو... پێش مامۆستاکەمان کەوتن و بە ڕاکردن بۆ گۆڕەپانی قوتابخانەکە چوون، من دوای هەموویان گەیشتمە دەرەوە، چاوێکم بە هەمواندا گێڕان... لەو دەوروناوە لە نزیك هاوپۆلەکانمەوە تاوێك هەڵوێستەم کرد و گوێم لێگرتن، بە نیازی ئەوەی یەکێکیان لێم بڕوانێت یان بانگم بکەن بۆ یاریکردن، زوو بێهیوا بووم لێیان و چووم لە ناوەڕاستی گۆڕەپانەکەدا دەباشیرەکانم لە گیرفانی پانتۆڵەکەم دەرهێنان و لەسەر کاشی گۆڕەپانەکە دەستم کرد بە نیگارکێشان.

قوتابییەکان هەموو بە چواردەورمدا ڕاوراوێنیان بوون، لە سەرەتاوە کەس سەرنجی نەدام، پاش ئەوەی نیگاری باخچەیەکی گیاندارانم کێشا و دەیان گیاندارم لە نێویدا وێنە کردن، نازانم چەندێك بوو لەسەر ئەژنۆکانم کەوتبووم و سەرم داخستبوو بەسەر کاشییە ڕەنگکراوەکاندا، کاتێك سەرنجم دا چەندان قووتابی لە دەورم وەستا بوون و لێیان دەڕوانیم، یەك دوانێکیش بەدەم یاریکردن و قاقای پێکەنینەوە بەسەر نیگارەکەمدا بازبازێنیان دەکرد، بێگوێدان پێیان خێراخێرا بە دەستی ڕاست و چەپم خەریکی هێڵکاری بووم... ویستم ئەو نیگاری باخی گیاندارانەی کە لە خەیاڵمدا بوو، لەسەر کاشییەکان بیکێشم، لەو دەمەدا زەنگ لێی دا، لەپڕێکدا چواردەورم چۆڵ بوون، منیش دوای قوتابییەکان کەوتم و گەڕامەوە بۆ پۆل و سەر جێگاکەی خۆم، دەرسی دووهەم... سەیرکردنی چەند کورتهفلیمێك بوو، هەموو دەربارەی یەکەم ڕۆژی قوتابخانە بوون، مامۆستاکەمان جارجار فلیمەکانی دەوەستاندن و لێدوانێکی لە بارەیانەوە دەدا.

لە پشووی دووەمدا... هەموو هاوپۆلەکانم چوونەوە بۆ گۆڕەپانی قوتابخانە، من بە تەنیا لە پۆلەکەدا مامەوە، تاوێك بە پۆلەکەدا گەڕام و چەند دەباشیرێکم بە ڕووی تەختەڕەشەکەدا هێنان، باش بە بیرم دێت... بیرۆکەی ئەوەم بۆ هات، ئەگەر لەسەر دیواری پۆلەکە گیاندارەکان بکێشم، لەوانەیە هاوپۆلەکانم و مامۆستاکەم زۆریان بە لاوە جوان بێت و ئەو دیوارە کاڵ و سپیانەش ڕەنگێکیان بێتەوە بەبەردا.

هەموو دەباشیر و قەڵەم بۆیەکانم لە جانتاکەم دەرهێنان و دەستم کرد بە وێنەکێشانی چەندان گیاندار، گەورە و بچووك، بۆ کێشانی گەورەکان دەچوومە سەر مێزەکان، چەند باڵندەیەکیشم لەسەر شوشەی پەنجەرەکان کێشان، لەسەر مێزێك وەستا بووم خەریکی کێشانی سەروگوێی ورچێك بووم... کاتێك گوێم لە دەنگی هاوپۆلەکانم بوو، بە لێشاو خۆیان کرد بە ژووردا، یەکێك لە قوتابییەکان زریکاندی:

- 'تۆ بۆت نییە!'

بە دوای ئەودا هەموو بە کۆرس:

- 'بۆت نییە... تۆ بۆت نییە!'

بێ ئەوەی ئاوڕیان لێبدەمەوە... بەدەم نیگارکێشانەوە لەبەر خۆمەوە گوتم:

- 'بە لاتانەوە جوانە؟'





دەنگێکی گڕ بە پەرۆشێکەوە پڕ پۆلەکە هاواری کرد:
- 'ئەوە خەریکی چیت؟... دابەزە... دابەزە خێرا.'
ئاوڕم دایەوە مامۆستاکەم بینی، خەریك بوو دەگەیشتە بەردەم ئەو مێزەی کە منی لەسەر وەستابووم، بە هەردوو دەستی هەڵیگرتم و لە ئەرزەکەدا دانام و گوتی:
- 'بۆت نییە لەسەر دیواری قوتابخانە بنووسیت!'
قوتابییەکان هەموو دیسان بە کۆرس گوتیان:
- 'بۆت نییە... بۆت نییە لەسەر دیوارەکان بنووسیت.'
مامۆستاکە بە تەوسێکەوە سەیرێکی کردم و پێی گوتم:
- 'بەڵێ... هەرگیز بۆی نییە.'
شانی گرتم و پێش خۆیی دام بۆلای تەختەڕەشەکە و ڕایوەشاندم و بە توڕەییەکەوە لە چاوەکانی ڕوانیم و گوتی:
- 'لێرە بۆستە، نەجوڵێی ئێستا دێمەوە، دەچم بە دوای بەڕێوەبەردا.'
مامۆستاکە هێشتا لە پۆلەکە دەرنەچووبوو... قوتابییەکان پەرتەوازە بوون بە ژوورەکەدا و هەریەکە و بە جۆرێك خەریکی کڕان و سڕینەوەی وێنەکانم بوون... فریا نەکەوتن زەرەر بدەن لە وێنەکان گوێیان لە دەنگی پێی مامۆستاکە بوو، خێرا هەریەکە و بە هەڵەداوان لە جێگای خۆی دانیشتەوە، بەڕێوەبەری قوتابخانە لە شانی مامۆستاکەوە بوو، کابرایەکی تۆکمەی بچووکی قژنی سوورکاری چاو و دەم و لوت زل، لە هاتنەژوورەوەیدا پاش ئەوەی چاوێکی بە ژوورەکەدا گێڕا، سوور بووبووەوە و چاوەکانی زەق داچڕابوون، ڕووی لە من کرد و بە توڕەییەکەوە گوتی:
- 'بۆت نییە... گوێڕووت... بۆت نییە!'
بە دوایدا مامۆستاکە و پاشان هاوپۆلەکانم دووبارەیان کردەوە:
- 'بۆی نییە، ئەو بۆی نییە.'
بەڕێوەبەر زیاتر لێم هاتە پێش... چاوەکانی خەریك بوون دەردەپەڕین و ئاگریان لێدەبارین، بە توڕەییەکەوە نەڕاندی:





- 'بۆت نییە لەسەر دیوارەکان بنووسیت، نیگار بکێشیت، ئەوەی تۆ کردوتە، جێگای قبووڵ نییە، تۆ چۆن بۆت نییە لەسەر دیوارەکانی ماڵەوەتان بنووسیت... ئاواش بۆت نییە لەسەر دیوارەکانی قوتابخانە بنووسیت و نیگار بکێشیت، تێگەیشتی لێم... ئەبەد بۆت نییە.'

لە چاوە زەقەکانی بەڕێوەبەرم ڕوانین و گوتم:

- 'بەڵێ... لە ماڵەوە بۆم هەیە، بەڵام دیوارەکانی ماڵی ئێمە جێگای بەتاڵییان تێدا نەماوەتەوە... تەنانەت بۆ بەشی نیگاری مشکێکیش!'

دەستەکانی لە پشتی هەڵپێکان و خۆی بەسەرمدا نوشتاندەوە و گوتی:

- 'ناچێت بە ئەقڵمدا... ڕاست ناکەیت... دەی گوێڕووت جانتاکەت هەڵگرە و پێشم کەوە، پێویستە پەیوەندی بە باوکت یان دایکتەوە بکەم، لەگەڵ تۆ سودی نییە.'

پێشی خۆی دام و بردمی بۆ ژوورەکەی خۆی، لە دەرگاکەدا وەستا بووم کاتێك لە دەفتەرێك دەگەڕا و وەکو شتێکی بیر کەوتبێتەوە، ئاوڕێکی خێرای لێدامەوە و لێی پرسیم:

- 'دەبێت دایك و باوکت لە ماڵ بن؟'

لەژێر لێوەوە و بەتوڕەییەکەوە گوتم:

- 'نازانم.'



پاش تاوێك گەڕان بە دەفتەرەکەدا، دەستی دایە تەلەفۆنی سەر مێزەکە و زۆری پێنەچوو، دەستی کرد بە لێدوان لەگەڵ دایکمدا، بەڕێوەبەر زۆر بە کورتی:

- 'پێویستە هەر ئێستا بەڕێزت بگەیتە ئێرە و کوڕەکەت مارتن، زەرەرێکی گەورەی لە قوتابخانەکەمان داوە'

تەلەفۆنەکەی داخستەوە و بێدەنگ بە ژوورەکەدا لە ڕاستەوە دەچوو بۆ چەپ... منیش بەردەوام لێم دەڕوانی. پاش چەند خولەکێك دایکم بە شپرزەییەکەوە خۆی کرد بە ژووردا... لە ڕێوە بێ سڵاوکردن ڕووی لە من کرد و لێی پرسیم:

- 'چی بووە ئازیز؟ چیی ڕووی داوە؟'

پێڕانەگەیشتم وەڵامی دایکم بدەمەوە... بەڕێوەبەر خۆی هاویشتە نێوانمان



و ڕووی لە دایکم کردو و گوتی:
- 'ئەیفا سەلەمۆ... تۆ ئەیفا سەلەمۆ ی شێوەکاریت... وانییە؟!'
دایکم بە ساردییەکەوە:
- 'بەڵێ خۆیەتی.'
بەڕێوەبەر ڕووی لە من کرد و گوتی:
- 'کوڕی جوان تۆ بڕۆ لە گۆڕەپانی قوتابخانە چاوەڕوانی دایکت بە.'
سەیرێکی دایکمم کرد... چاوم لە چاوەکانی بڕی... پێی گوتم:
- 'بڕۆ... ئازیزەکەم چاوەڕوانم بە هەر ئێستا دێم بۆ لات.'
گۆڕەپانی قوتابخانەکە بێدەنگ بوو، کەسی پێوەنەبوو، باخی ئاژەڵەکانم شیوێندرابوو... بەڵام بە چواردەوریدا دەیان وێنەی ئاژەڵی ڕەنگاوڕەنگ تر کێشرابوون، بەبێ وەستان دووبارە دەستم کرد بە کێشانەوەی باخەکە و یەك یەك ئاژەڵەکانم تۆخ کردنەوە. کاتێ دایکم دەستێکی هێنا بە قژما و لە لامەوە وەستا و گوتی:
- 'ئەمەشیان زۆر جوانە... تەواو بووە؟ ئەگەر تەواو بوویت... لەگەڵم وەرە با بڕۆینەوە بۆماڵەوە.'
تاوێك بە دەوری کاشییە ڕەنگکراوەکاندا سووڕایەوە و لێی ڕوانین... لە ڕێگا گوتی:
- 'ئەو نەزانانە تێناگەن لە مانای ڕەنگ، با بزانیت ئەزیزەکەم، تۆ هیچ کارێکت نەکردووە هەڵە بێت، من لە مەبەستی تۆ تێدەگەم... تۆ ویستوتە پۆلەکە بڕازێنیتەوە و لە ژووری گەورەوە بیکەیت بە پۆلێکی پڕ ڕەنگ بۆ منداڵانی هاوتەمەنی خۆت... ئەوە قوتابخانە نییە، بەڵکو فەقیرخانەیە، ئەو کاولەیە جێگای تۆ نییە... دایکت لە سبەینێوە دەگەڕێت بە دوای قوتابخانەیەکی گونجاودا بۆت، ئەمستردام پڕە لە قوتابخانە، هەڵوێستەیەکی کرد و گوتی: 'پێشبڕکێیەك بکەین تاکو ماڵەوە، بزانم کاممان خێراین لە ڕاکردندا.'
لە شانی یەکەوە وەستاین و منیش تا سێم بژارد و هەردووکمان بەڕاکردن بەرەو ماڵەوە ڕامان کرد.





پەڕینەوە بە مەرزەکاندا، سەفەرنامەیەکی هونەری دانا ڕەوفی هونەرمەندە، باس لە سەفەرەکانی بۆ وڵات و کلتووره جیاوازەکان ئەکات، جگە لە ناساندنی وڵاتەکان زیاتر جەختکردنەوەیە لە پیشاندانی ئەزمونە شانۆییەکانی ئەو وڵاتانە و مێژووی شانۆ تیایاندا. ئەم سەفەرنامە هونەرییە یەکێکە لە کتێبە دانسقەکان کە ئەکرێت بڵێین چەند کتێبێکە لە ناو کتێبێکدا، هەم سەفەر وەك پرۆسەیەکی ناساندن و بەریەك کەوتنی کلتورەکان، ناسینی وڵاتەکان، بە تایبەتیش پرۆژە دانسقە و جیاوازەکانی بواری شانۆ لەو وڵاتانەدا پیشان ئەدات. ئەم کتێبە شایستەی خویندنەوەیە هەم بۆ کەسانی شارەزای بواری شانۆ و هەم بۆ خوێنەرانێك لە کونجکوڵن بەرامبەر کلتورەکان و وڵاتانی جیهان.






محەمەد رەئوف

# پاکیزەکانی ئەنفال

## لێکۆڵینەوەیەک لە سەر کچە فرۆشراوەکانی ئەنفال

لەیادی ٢٦ساڵەی تاوانی ئەنفالدا



# تاریکخانەی تارماییەکان

**پەیمان وەهابزادە**
**و. لە فارسییەوە: شادی عەبدوڵڵا**

"خەونی وریا" ناوی کۆمەڵە چێرۆکێکی پەیمان وەهابزادەیە، کە ساڵی ٢٠١٣ لە شاری ڤەنکۆڤێر چاپ و بڵاو کراوەتەوە. ئەم کتێبە کە بە یادی "وریا مەزهەر" شاعیر و چیرۆکنووسی کۆچکردوو و هاوڕێی نزیکی نووسەر؛ ناو نراوە، پێك هاتووە لە هەشت کورتە چیرۆك، کە "تاریکخانەی تارماییەکان" یەکێك لەو چیرۆکانەیە.

پەیمان وەهابزادە، دوکتۆرای کۆمەڵناسییە و ئێستا لە زانکۆی ویکتۆریای پارێزگەی بریتیشی کۆڵۆمبیا مامۆستای کۆمەڵناسییە.
تا ئێستا لە پەیمان وەهابزادەوە چەند کۆمەڵەچیرۆك و کۆمەڵەشیعر و چەندین وتار لە بواری ئەدەبیات و دیاردەناسیی شیعردا بە زمانی فارسی بڵاو کراونەتەوە.
بڕیارە بەرهەمە ئینگلیزییەکانیشی لە بواری توێژینەوە و کۆمەڵناسیدا و هەروەها کتێبی "ئۆدیسەی چریکی" وەربگێڕدرێن بۆ سەر زمانی فارسی.





زۆر لەمەوبەر، کاتێك کە سادە بووم "هەڵبەت ئێستا ئیتر سادە نیم، لێکدراوم ـ ڕەش ـ لە ناو لێکدراوەکاندا" پێم وابوو ناکرێ ڕۆژی هەشتەم بە حەوتە زیاد بکرێت. دەبێ حەوت ـ ـەکەی تەواو بکات تا دیسان حەوتە سەرلەنوێ دەست پێبێتەوە و دەست پێبکاتەوە. بەهەرحاڵ چ ـە ن د ە لە هەڵەدا بووم.
لەو ژوورە سەیرەدا شەو و ڕۆژی یەکەمم بە هیوای کۆتایی هەفتەوە بردە سەر و شەوی دووهەم و شەوی سێهەم و چوارەمیش. بەو هیوایە کە گوایە "کۆتایی شەوی ڕەش سپێدەیە"، بەردەوام بووم.
خۆیان بەو ژوورەیان دەوت تاریکخانەی تارماییەکان و ئەڵبەت بە گاڵتەوە. بە ڕواڵەت خەریك بوون سۆز و مەرحەمەتیان دەنواند بەرامبەر نووسەرێك، کە زەمانێکیش دیلی ئەوان بووە. دژوار بوو، بەڵام تەحەمولکردنی دژوارییەکەشی بە هیچ شێوەیەك دەرەقەتی دژوارییەکەی نەدەهات. باسی شتێك دەکەم، کە شایانی باسکردن نییە. گەیشتمە حەوتی حەوتە بە هیوای کۆتایی، یان بە هیوای تەواوکردن کە لە خۆیدا کۆتاییترینی کۆتاییەکانە؛ بەڵام دەرکەوت کە هەموو دەستپێکەکان لەم کۆتاییەوە دەهاتن.
دواتر حەوتە گەیشتە هەشت و لەوەش تێپەڕی و ژماردنی بە تەواوی لە دەستم دەرچوو. سەرەنجام کاتێك دوای چەندین مانگ لە تاریکخانەکە هاتمە دەرەوە، نەخشی گرمۆڵەی خۆم بینی، کە ڕەش

بۆتەوە بە مەرەکەبی بێویژدانی ڕۆژنامەیەك کە ون دەبوو لە ژێرپێی ئەو وەهمانەدا، کە خولیایان گەیشتن بە حەوتی حەوتە بوو بۆ ئەوەی بە تەواوکردنی، سەرلەنوێ دەست بکەنەوە بە حسێب و کتێبە هیچوپووچەکانیان و.. ئەڵبەت ئەمە چیرۆکی زۆر لەمەوبەرە.

زۆر لەمەوبەر، کاتێك کە سادە بووم، وامدەزانی بۆ هەر دەستپێکێك کۆتاییەك هەیە. واتە لە شوێنێکدا کۆتاییەك هەیە کە دەستپێکەکەی خۆی هەڵدەپێچێ و دەیداتە دەست فەرامۆشی. لە لێپرسینەوەدا گیرۆدە ببووم و لەم گیرۆدەییەمدا بەم هیوایەوە خۆڕاگریم دەکرد. پرسیاریان دەکرد و دەیانوت وەڵامەکە بە تێروتەسەلی بنووسم. نووسینەکەمیان دەخوێندەوە سەرپێی و دوایی دەردەکەوت کە ڕازی نین. وەڵامەکانمیان دەدڕاند. پاشان دووبارە پرسیاریان دەکرد و دەمنووسی و دەیاندڕاندەوە. هەر پرسیارێکیان پانزدە جار دەپرسییەوە، ئەوەندەی کە لە ژیانی خۆت تێر ببی. ڕۆژانی دواتر بۆ هەر پرسیارێکی کەرانە، کە وەڵامەکەی پتر لە دوو دێڕ نەبوو، شەست هەفتا لاپەڕەم دەنووسی. خۆیان وتەنی دەیانویست دژوازی [و قسە گۆڕین] لە قسەکانمدا بدۆزنەوە.
هەر ئەوانەی کە ژیانیان، بوونیان، قەڵافەتیان، وتار و کرداریان هەموو پڕ بوون لە دژوازی، ئەیانویست دژوازی لە من وەربگرن. سەیری گاڵتە و جەفەنگی زەمانە بکە! دەیانوت ناوی "لێ پرسین ـەوە"یە ئیتر، تۆ گومانلێکراوی و ئەوەندە بە گومانلێکراوی دەمێنیتەوە هەتا ئاشکرا ببی. جەفەنگەکەی لەوەدا بوو کە من ئاشکرا بووم و بە ڕای خۆم چونکە نهێنییەکم نەبوو، کەواتە هیچیشم نەبوو بۆ شاردنەوە؛ بەڵام ئەوانە بە دوای کەشف و دەرخستنی مرۆڤێکەوە بوون لە مندا، کە گوایە من خۆم هێشتا پاش ئەو هەموو ساڵە نەمدەناسی. ئەوە بوو کە دەیانوت تۆ بنووسە با ئێمە دوبارە بیدڕێنین و بیپرسینەوە.
گیرم خواردبوو لەو لێپرسینەوەیەدا. لێپرسینەوەیەکی کەرانەی پانزدەخولەکی و چوارلاپەڕەیی، شەش مانگ و دووهەزار لاپەڕەی بردبوو. لە حەوتە و مانگ تێپەڕیبوو و حسێبەکەی بە تەواوی لە دەستم دەرچووبوو. ئەوەندەم نوسیبوو و دڕاندبوویان، کە پەنجەی ئاماژە و پەنجەی ناوەڕاستم لاروگێڕ ببوون و لوویان لێ دەرهاتبوو، بەڵام بەسەرهاتەکە ئیتر لەوەش دەرچووبوو. ئیتر هەر نەمدەزانی چی دەنووسم، هەر هەڵمدەبەستن.







کەمێکم لە خۆم و زانیاری و ئەزموونەکانم دادەنا و ئەوی تری هەڵبەستنی گلۆڵەیەکی ئاڵۆزکاو بوو بەو هیوایەی کە ئەو نووسینە بێسەروبنانە کۆتاییان پێبێ. من نەمدەدی کە چۆن لەژێر ئەم لێپرسینەوە بە ڕاستی کەرانەیەدا خەریك بووم ژیانی شەست و چەند ساڵەی خۆم سەرلەنوێ دەنووسییەوە. ئەو کاتە بوو کە زانیم کۆی ئەم باسی دەستپێك و کۆتاییە چەن گەمژانەیە.

ئەم بەسەرهاتە هەر سەرەتا و بنەتای نەبوو، کە من دڵی پێ خۆش بکەم و لەبەر ئەوەی هیچ لە سەرەتا و بنەتای دیار نەبوو، بیرۆکەی ڕزگاربوون لەم زیندانەی کە تێیدا گیرۆدە ببووم و ئێستا بیریشم لەوێدا یەخسیر بووبوو، بیرۆکەیەکی کەرانە بوو. وەهم بوو و..

ئەڵبەت ئەمە بەسەرهاتی زۆر لەمەوبەرە.

زۆر لەمەوبەر، کاتێك کە کەسێکی سادە بووم، وامدەزانی خۆڕاگری بۆ هاوارکردن و لەقاودان ئەشێ یان وردتر بیڵێم سەبارەت بە خۆم و سەبارەت بەم گرفتە بێسەروبن و بە ڕواڵەت بێکۆتاییەی من، بۆ هاوارکردن ناشێ؛ واتە وامدەزانی لە گیرۆدەییەکی ئاوەهادا من دەبێ بە بێدەنگی هاواری خۆڕاگری بەرز بکەمەوە. چونکە لێم ڕوون بوو کە ڕۆژێك دێنە سەروەختم و من بە ڕەچاوکردنی بنەماکانی خۆڕاگریی شارستانییانە، پاش پرسوجۆیەکی کورت و بێکەڵك "کە خۆیشم لە سەرەتاوە ئەمزانی فۆرمالیتەیە" سەبارەت بە ڕەوابوون و یاساییبوونی ئەو لایەنەی دەستگیری کردووم، بە حەیای خۆمەوە و لە ڕووی ناچارییەوە لەگەڵیان ئەڕۆم. پێش گیرانم بەڵێنم بە خۆم دابوو، کە لەژێر ئەشکەنجەدا هاوار نەکەم و قورسیی خۆم و ئیعتباری چل و چەند ساڵەی خەبات بە بێدەنگیی خۆم بپارێزم. هەروەك لەو دەسەڵاتەکەی تردا وام کردبوو. چوار پێنج ڕۆژ پێش دەستگیرکرانم کە بۆیان دەرکەوت لێپرسینەوەی شەوانە و هەڕەشەوگوڕەشە و ئامۆژگاریی برایانە و لاواندنی سەرەتایی بۆ "ئیعترافوەرگرتن" کەڵکی نییە، بەم تەمەنەوە، بە چاوی بەستراوەوە، ئەیانبەستم بە قەرەوێڵەیەکی ئاسنەوە و پاش خولەکێك بە ڕواڵەت ڕاوێژکردن بۆ دیاریکردنی پلەی ئەستووریی

کێبڵەکە "کە لە ئەنجامدا پاش لێکدانەوەیەکی کارناسانە کێبڵی کیانووری(*) هەڵبژێردرا، کە ئێستاش نازانم پلەی ئەستوورییەکەی چەن بوو" برووسکەیەکم لە بنی پێمدا هەست پێکرد و بێئەختیار هاوارێکم کرد کە خۆم لە ئاوازە پڕناڵە و حەیوانییەکەی سەرم سوورِ ما. بەڵێنەکەم کە هەر لەو ساتەدا هاتبووەوە بیرم، لەگەڵ لێدانی دووهەمدا بە تەواوی لەبیرم چووەوە. باسی هەشت ڕۆژە بوونی حەوتە و بێکۆتاییبوونی ئەم گیرۆدەییە هەر لێرەوە دەستی پێکردبوو. شەلوپەل گەڕاندمیانەوە بۆ تاریکخانەکە. ئازار و بێخەوی لە لایەکەوە و بیرهێنانەوە و زایەڵەی دەروونیی هاوارە زەبوونانە و سەیروسەمەرەکانم لە لایەکی ترەوە. لە هەموو دانیشتنەکانی ڕۆژانی دواتری ئیعترافوەرگرتندا، بەبێ بواردن هاوارم کرد و قیژاندم. لە قیڕاندندا تەنانەت زۆر بە سەخاوەتیش بووم. شەوێکی ئێرە بە تەنیا، دژوارتر بوو لە هەموو ئەو شەوانەی کە لە بەندیخانەکانی دەسەڵاتی پێشوودا بەسەرم بردبوو. بەهەرحاڵ، پاش شەوانێکی زۆر کە بە ڕاستی هەرکامیان وەك "شەوی غەدر" هەزار شەو بوون و پاش هاوار و ئازاری زۆر، زانیم بەڵێنەکەم چەن کەرانە بووە. پاش تەمەنێك خەبات هێشتا ئەوەندە سادە بووم کە ئەمویست جەستەم لە ئەقڵم جیا بکەمەوە، بۆ ئەوەی ئەو قەمچیی لێبدرێ و ئەم خۆڕاگری بکات. بۆ ئەوەی دواتر ئەم ئەقڵە لەخۆبایی و شانازیخوازە بتوانێ بە قوربانیکردنی ئەو جەستە کوتراو و دەستدرێژیکراوەسەرە، ببێتە ئەستێرەی پیشانگەکانی خۆڕاگریی وڵاتی داهاتوو.

لە ڕۆژانی دواترەوە بە ئاگاییەوە هاوارم ئەکرد و لە قیڕاندندا دواوزەم بەکار ئەهێنا.

چەندین مانگ دوای ئازادی لەو بەندیخانە بچووکە و هاتنەناو ئەم بەندیخانە گەورەترە، کاتێك کە بە مەراقێکی نامۆوە ئەو قەمچیخواردنانەم دەهاتەوە یاد، ئاواتم ئەخواست کە بریا زووتر فێری هاوارکردن دەبووم. زانیم کە ئێمە دەبێ منداڵەکانمان فێری هاوارکردن بکەین و..

هەڵبەت ئەمە بەسەرهاتی زۆر لەمەوبەرە.



زۆر لەمەوبەر، کاتێك کە سادەتر بووم، باش نەمئەزانی کە بۆچ ئەبێ کەسێك بتوانێ کەسێك بداتە بەر شەق و لێدان و سووکایەتی، ئەویش لە کاتێکدا کە هیچ ناکۆکییەکی تاکەکەسی لە نێوان ئەو دوو کەسەدا نییە. لێپرسێکم هەبوو، کە بە دڵ و گیان دەیوەشاند. بە ئینسافەوە بڵێم زۆر بە



وردی دەیوەشاند. بە دڵ و گیان کارەکەیی ئەکرد. جارێك نەبوو دەست دابێنێتەوە و نەیپێکێ و لەگەڵ هەر لێدانێکیشدا بۆ تامی زیاتر، بە ناوی ئیمامەکانەوە نیەتی دەکرد و داوای سەوابی دەکرد. ئەرکناسی و بەڵێندەریی بۆ کارەکەی بە ڕاستی بێوێنە بوو. جارێکیان لە کۆتایی ئەشکەنجەیەکی حەسابیدا کە تەواو شەلوپەل ببووم، پاش ئەوەی ئەوانی تر لە ژوورەکە چوونە دەرەوە، لەوپەڕی کەنەفتیدا و بە ترسێکی زۆرەوە پێم وت: «زۆر خراپ ئەوەشێنێ... بیرێك لەوە ناکەیتەوە کە ئەوەی  کە لە ژێردەستتدایە و لێی دەدەی، ئەویش مرۆڤە؟» زۆر بە خوێنساردییەوە وتی: «من مووچەکەم لە بەیتولماڵی خەڵکەوە دەگرم، تۆ ئەڵێی مووچەکەم حەڵاڵ نەکەم؟ لە ئایینی تۆدا خوا بەوە ڕازییە؟ ئیتر پێویست نییە سەبارەت بە سەوابەکەی و "**قربتا الا الله**"کەی هیچ بە تۆی کافری منافق بڵێم.»

پاشان قاچەکانمی برینپێچ کرد کە بتوانم هەستمەوە و بە دڵسۆزییەوە یارمەتیی دام کە هەنگاو بنێم با قاچم خوێنی تێنەزێ و دواتر گورچیلەم تووشی ئازار و کێشە نەبێ. پێش ئەوەی خۆی دووبارە و ئەمجارە بە وردی قاچەکانم تیمار بکات، بە سەرنج و بەرپرسایەتیی تەواوەوە پەرداخێك شەکراوی پێدام نەبا زەختم دابەزێ و هەڵبەت ئەوەشی بیر هێنامەوە کە ئەستێرەی بەختم بەرز بووە، چونکە لەبەر ئەوەی تەنیا موعانید "سەرهەڵداو و ناتەبا" بووم، نەك موحاریب "شەڕکەر ـ لێرەدا شەڕکەر بە دژی خودا" ـ هەروەها لەبەر لەسەرەوەبوونی تەمەن ـ لێپرسە ئازیزەکان لە سەرەتاوە بڕیاریان دابوو کە لەکاتی کێبڵێلێداندا بەتانی نەخنن بەناو دەممدا، کە دەبووە هۆی خنکان و هەناسەتوندی. دوایی کاتێك کە سەرانسەری شەوەکە لەتاو ئازار پێچم دەخواردەوە و جنێوم بە بەخت و ناوچاوی خۆم دەدا، کە بۆچی لەم سووچەی دونیادا لەدایك بووم نەك لە شوێنێکی تردا، بیرم لەوە کردەوە کە مرۆڤگەلێکی چەن ڕاستگۆ خزمەت بەم وڵاتە ئەکەن. ئاواتم خواست کە ئەم وڵاتە پڕ ببێ لەم جۆرە مرۆڤە ڕاستگۆ و بەویژدانانە. بیرم کردەوە کە گەر ڕۆژێك هەموو کاروباری ئەم وڵاتە بکەوێتە ئەستۆی کەسانی وا بەویژدان، ئەوسا لە چ بەهەشتێکدا دەژیین! بەڵام ساتێك دواتر لەو ئاواتەی خۆم تووشی سەرسووڕمان بووم و بێئەختیار فرمێسك بە چاومدا هاتە خوارەوە و..

هەڵبەت ئەمە بەسەرهاتی زۆر لەمەوبەرە.

زۆرلەمەوبەر، کاتێك کە سادە بووم، بڕوایەکی چەن پتەوم هەبوو بە ژیانی ئەخلاقیی خۆم. بەڵام لێپرسینەوە، بوو بە سەرەتای گومان بۆ هەموو شەست و چەند ساڵی ژیانم. پاش ماوەیەك ئەوە دەرکەوت کە ئیتر مەسەلەی ئیعترافوەرگرتن بۆ دروستکردنی دۆسیە لە بەرنامەدا نەبوو. قۆناغی تێهەڵدانم تێپەڕاندبوو و گوشار تۆزێك کەم ببووەوە.

ئەو لێپرسینەوە بێکۆتاییانەی کە هەمیشە لە نیوەی شەودا دەستیان پێدەکرد و دەمەوبەیان بە ئەنجامێکی بێئەنجام دەگەیشتن، زیاتر و زیاتر ڕەهەندی بەسەرهاتنامەی گرتبووە خۆ، ئەویش لەژێر چاودێریی "کارناسی دۆسیە"کەدا، کە هەڵەچنێکی ورد و زۆر هۆگری ئەو چیرۆکانە بوو، کە بەندییەکان دەیاننووسی و هەڵبەت ئەمە بە هیچ شێوەیەك مایەی دڵخۆشی نەبوو. هیچ ڕێگایەکم نەبوو بۆ ئەوەی لەوە تێبگەم کە کەمبوونەوەی گوشارەکان بۆ ئیعترافوەرگرتن لەبەر ئەوە بوو، کە هەر چاوپۆشییان لێکردووە یان خۆیان دۆسیەیان بۆ دروست کردووم (ڕەنگە بەپێی دانپێدانانی کەسانی تر) و ئیتر بە کردەوە پێویستیان بە دانپێدانانی من نییە.

بە درێژایی ئەو نووسینانەی شەوان زانیم، کە بەسەرهاتەکەم زۆر بەربڵاوتر بووە لە ژیانی ڕاستەقینەم. بۆ ئەمەش منەتباری کارناسی دۆسیەکەمم، ئەو کەسەی کە ئێستا ئیتر ببوو بە کارناسی ژیانی من. شتی وای لە ژیانمدا بۆ ئاشکرا ئەکردم، کە شاراوە مابوو لە خۆم. خاڵی پرسی هەشت ڕۆژە بوونی حەوتە لێرەدایە، کاتێك کە لە سایەی کارناسان و هەڵەچنە ورد و فیداکارەکانەوە مرۆڤ بەوە دەزانێ کە زیاتر لە تەمەنی خۆی ژیاوە.

من هێشتا هەروا هەڵوێستم دەگرت، سەرپێچیم نەدەکرد بەڵام هاوکاریشم نەدەکرد. زیاتر هەوڵم ئەدا لەژێر شتەکان و تۆمەتەکان دەربچم. هەر بۆیە لەو لێپرسینەوانەدا بەرەبەرە کار گەیشت بە پشکنینی دەروونی و سایکۆلۆژییانە بۆ من.

کارناسەکەم دەوری پزیشکێکی دەروونیی قبوڵ کردبوو، کە دەبوو لە





هەزارتوێی ناخۆوریای مندا پشکینین بکات. زۆر دواتر زانیم کە منیش بۆ لابردنی گوشار، بۆ ئەوەی کە نەگەڕێمەوە بۆ قەمچی و لێدان، بێئەوەی ئاگام لێبێ، دەوری نەخۆشم قبوڵ کردبوو، هەرچەند لە دڵەوە دەمزانی نەخۆش ئەوانن، کە نەخۆشسازی دەکەن.

ئەنجام ئەوە بوو کە پاش ئەوەی تاکنووسینەکانم لەژێر چاودێریی لێپرسەکان و کارناسی بەرێزدا بە ڕواڵەت تەواو بوو، ژیانی نائەخلاقییانەی خۆمم بۆ ئاشکرا بوو.

تازە زانیم کە چۆن بۆ لابردنی گوشارەکان و بۆ ئەوەی دانپێدانانی من کێشە بۆ هاوڕێیان و هاوبیرانم نەنێتەوە، چۆن لە دووتۆی ئەو لێپرسینەوانەدا گەیشتبوومە دانپێدانانی تایبەت لەسەر خۆم و کەسایەتیم. منێک کە تەمەنێکم بە ڕەچاوکردن و پێڕەوکردنی ئەخلاق و پەروەردەی ئەخلاقی بەسەر بردبوو، لە کۆتایی لێپرسینەوەکاندا ببووم بە کەسێک، کە موعتاد بووە بە مادە هۆشبەرەکان و کردەوەی بێڕەوشتانە و گەندەڵیی ئەخلاقی، ئەویش بە شێوەیەکی ئاژەڵییانە.

پێیان ئەوتم بۆ ئەوەی کەسایەتییەکی دڵخواز بۆ خۆم وێنا بکەم، بە شێوەی ناخۆوریا لادانە ئەخلاقییەکانی خۆم لە یادەوەریم سڕیوەتەوە.

دوبارە و چەندبارە نووسینەوەی ژیانم، بە بڕوای ئەوان، توێژەکانی فەرامۆشی لادەدات و من بەئاگا دەکاتەوە لە خودی ڕاستەقینەم. لەم ڕووەوە لێپرسەکەم دەیوت من دەبێ منەتباری زیندان بم.

ئێستا کە بەسەرهاتە بێکۆتاییەکانی ئەو کاتە دێنمەوە بیرم، دەکەومە گومانەوە لەوەی کە ئایا بە ڕاستی لە ژیاندا هەمان ئەو مرۆڤە ئەخلاقییە بووم کە وامزانیبوو؟ تارمایی دێوەزمەیەکی سامناک کە لە لێپرسینەوەکانمەوە سەریهەڵدابوو، ئیتر لە هەموو شوێنێک لەگەڵمدا بوو. ئەم گومانانە دەورگەلێک بوون کە تەنیا لە ناخی ئەو تاریکخانەوە دەردەکەوتن و..

ئەڵبەت ئەمە بەسەرهاتی زۆر لەمەوبەرە.

زۆر لەمەوبەر، کاتێك کە سادەتر بووم، وامدەزانی کە ڕۆشنبیر و خەباتکار، ئابڕووی نەتەوەیەکە. کەوایە لە ڕاستیدا لە هەمبەر دەسەڵات و لە خۆڕاگری لەپێناو بڕواکانمدا، جۆرێك ئەرك و بەرپرسایەتیم بەدی دەکرد. خۆم بە نوێنەری خەڵکانێك دەزانی، کە بەبێ بوونی من کەس نییە بەرگری لە مافەکانیان بکات. زۆر لەمەوبەر کاتێك کە سادە بووم، وامدەزانی ئەرکی خەباتکار پاسەوانیکردنە لە ویژدانی بەئاگای گەل.

چەندین مانگ دوای ئەم گیرۆدەییە، کاتێك کە لە زیندان ئازاد بووم و گەڕامەوە بۆ ناو کۆمەڵ، دەستم کرد بە خوێندنەوەی ڕۆژنامە کۆنەکان، کە هاوڕێیان و بنەماڵەم بۆیان کۆ کردبوومەوە. ئەو ڕۆژنامە بێشەرمانەی کە چل و چەند ساڵ خەبات و مافخوازی و هۆگریم بۆ دادپەروەرییان لە لاپەڕە هەرزانەکانیاندا بە پێچەوانە پیشان دابوو، ئەو ڕۆژنامانەی کە سپێتیی شانازییەکانی ژیانمیان بە بەرەکەتی مەرەکەبی بوختان ڕەش کردبووەوە. دوایی زانیم کە لەم سەردەمە نامۆیەدا بوختانیان ناو ناوە دانپێدانان. کاتێك کە بەرەبەرە بە ئازادی ڕاهاتم و لە خەمساردیی ئەو خەڵکانە گەیشتم، کە لە شەقام و ناوماڵەکاندا بێئاگا لەوانەی کە لە زیندانەکاندا هەر لەبەر خۆشەویستیی ئەم خەڵکە و دواڕۆژی ئەوان، لە مەینەتیدان، بە توندی کەوتمە گومان لەوەی کە کاری ڕۆشنبیر بەرگریکردن لە ویژدانی گەلەکەیەتی. ئەوە فێر بووم کە جارێ دەبێ شتێك ببێ بۆ بەرگریلێکردن تا خەباتکار بتوانێ بەرگریی لێبکات و..

هەڵبەت ئەمە بەسەرهاتی زۆر لەمەوبەرە.

زۆر لەمەوبەر.. ئەو کاتەی کە دەمزانی کێم و بۆچی خەبات ئەکەم و بۆ کام کەسانە دڵم لێدەدات...؛ ئەمە چیرۆکی زەمەنێکی ڕابردوو و تەمەنێکی بەسەرچووە...

١٠ی فێڤریوەری ٢٠٠٣ تا ژوئەنی ٢٠٠٧



- نوورەدین کیانووری سکرتێری یەکەمی حیزبی توودەی ئێران بوو کە ساڵی ١٣٦٢ی هەتاوی دەستگیر کرا و لە زیندانەکانی کۆماری ئیسلامیدا لە ژێر ئەشکەنجەیەکی زۆر دڕندانەدا ناچار کرا لەسەر شاشەی



تەلەفزیۆنی ڕەسمیی ئێران، دان بەوەدا بنێ کە حیزبەکەی هەر لە سەرەتاوە بۆ مەبەستی جاسووسی و خیانەت دامەزراوە و چالاکیی کردووە. بەڵام دواتر لە نامەیەکی ئاوەڵادا بۆ خامنەیی، وتی بە گوشار و ئەشکەنجە ناچار کراوە بەو لێدوانە.

لەو کاتەوە بە شێوازە زۆر توندەکانی ئەشکەنجە لە زیندانەکانی ئێراندا ئەوترێ ئەشکەنجەی کیانووری و کێبڵی کیانووریش لەو نموونەیەیە.



قسەیەک بۆ دیوان

نوخشە عەبدول

لێکۆڵینەوە

ئەدەبی

سەردەم




# قسەیەك بۆ دیوان

## خوێندنەوەیەك بۆ "دیوان"ی هیوا قادر

**نوخشە عەبدول**

کاتێك بەرکەوتنمان لەگەڵ کۆبەرهەم یا دیوانە شیعری شاعیرێکدا دەبێت، ڕەوانتر ئەو گۆڕانکارییە بابەتی و تەکنیکییانە دەبینین، کە لە قۆناغە جیاوازەکاندا شاعیر پێی گەیشتووە، خوێندنەوەی پێکەوەیی ئەوەمان باشتر لا گەڵاڵە دەکات شاعیر لە ماوە جیاوازەکاندا چۆن گەشەی بە نووسینی خۆی داوە و ئەو گۆڕانانە چین جار لە دوای جار شاعیر توانیویەتی دروستیان بکات. لە (دیوان)ی هیواقادر ـ دا بە ڕوونی ئەوە هەست پێدەکەین، چونکە شیعرەکان لە ماوەی سالانی ( 1984 ـ 2009) لەم دیوانەدا کۆ کراونەتەوە، خوێنەر بە سانایی دەکارێ هەست بەو گەشە شیعریە بکات، کە قۆناغ قۆناغ دروست بووە لە ڕووی بابەت و تەکنیکەوە.

پێویستە شیکردنەوە و ناساندنەکان تەکنیك و بابەتی شیعرەکان بگرێتەوە، بەڵام ئەمە بۆ دیوانێك بەشی زۆری

کارنامەی شاعیرێکی لەخۆ گرتبێت کارێکی ئاسان نییە، بۆیە لێرەدا زۆرتر لەسەر بابەتی شیعرەکان دەوەستین جگە لە پۆلێنبەندییەك بۆ کارئاسانیی تێگەیشتن لە بابەتەکە. شیعرەکان لای ئێمە بوونەتە سێ قۆناغ، وەك سێ قۆناغی ئەزموونی شاعیر، ئەم بەشکارییە تەنها بریتییە لە تێگەیشتنی ئێمە بۆ بابەتەکە، چونکە جیاکردنەوە و ناساندنی قۆناغی نووسین لای هەر نووسەرێك دەشێت خودی نووسەرەکە باشتر بیزانێت یاخود بە کارێکی ئەکادیمی بڕیار لە جیاکردنەوەی قۆناغەکان بدرێت، پشتبەستن بەم دابەشکردنە بۆ پەرتنەبوونی بابەتەکەمانە.
بە پێی خوێندنەوەی ئێمە شیعرەکان دەبنە ئەم سێ قۆناغە:

## قۆناغی یەکەم

هەردوو کۆمەڵەی "چاوە زەردەکان، کڵاوەکەم پڕ پڕە لە باران و گوڵ" دەگرێتەوە، لە دیوانەکەدا لاپەرە "**7** تا **88**"ـە. هەرچەندە لە کۆمەڵەی "کڵاوەکەم پڕ پڕە لە باران و گوڵ" گۆڕانێك لە بابەت و فۆرمی شیعرەکاندا دەبینرێت، بەڵام بە تەواوی خۆی جیا ناکاتەوە لەوانی تر و بە بڕوای ئێمە زۆرتر دەچێتەوە سەر ئەوانی تر و گۆڕانکارییەکە بە جۆرێك نییە خۆی لەوانی پێشوتر جیا بکاتەوە، بەڵکو هێڵێکی تەنکە ناتوانێت وەك بەشێکی سەربەخۆ و جیاواز خۆی بەیان بکات، بۆیە جیامان نەکردۆتەوە.

شیعرەکانی ئەم قۆناغە لە ڕووی فۆرمەوە دوو جۆرن، هەندێکیان کورتن و لە ناویاندا هەیە تەنها لە یەك وێنە پێك دێت، هەندێکیشیان درێژ. بەشێك لە شیعرەکان بە ڕوونی ئەوەیان پێوە دیارە، کە کارکردنی سەرەتای شاعیرن، بەتایبەت لە کۆمەڵەی چاوە زەردەکاندا، سادەیی تەواویان پێوە دیارە و ناونیشانی شیعرەکان سادەن و زۆرینەیان کورتن و لە تەنها وشەیەك پێك دێن، لەوانە: "تکا، وەك، ماچ، سەگ، بۆشای ڕامان، سێبەر، تابلۆ و..." ئەوانەش لە بڕگە یان ڕستەیەك پێك هاتوون "سرودی ڕەنگەکان، پێشبینی کردنێك پێش کوژران، گەشتی هەشتەمی سەندیباد و..." بە هەمان شێوە سادەن و ڕۆچوون و قوڵبوونەوەیەکی وایان تێدا نییە هەڵگری ناوەڕۆکی شیعرەکە بێت، وێنە شیعرییەکانیش





سادە و ڕوونن، بۆ نموونە:

"مانگ نینۆکێکی پەڕیوە ل**41**، شەپۆلێك خەست لە پۆلە ڕیشۆڵەی تەڕبوو، بە بێدەنگی مرواری فرمێسکەکانت هەڵڕێژە سەر کۆشی سروشت، ...)".

ئەوەی لێرەدا بۆتە کەرەستەی دروستبوونی وێنەکان، سەرجەمیان وێنە دیتراوەکانن، هەمان ئەو خوازە باوانەن، کە هەمیشە لەبەرچاوانن و شاعیر بەکاری هێناون. لێرەدا خوێنەر بەوە دەگات ئەم شیعرانە بریتین لەو خۆنووسینەوەیەی هەمووان لە سەرەتای کاری نوسیندا دەیکەن، ڕوون نییە شیعرەکان دەچنە چ ڕیزبەندییەکەوە و دەیانەوێ چی بڵێن؟ وەك سەرەتای ڕێگەیەك دەردەکەون، بە جۆرێك کە شاعیر بیەوێت شێواز و تایبەتمەندیی خۆی بدۆزێتەوە.

جگە لەوەی لە ڕووی بابەتەوە بە تەواوی کاریگەریی ئەو قۆناغەی ژیانی شاعیریان پێوە دیارە، چ لە ڕووی سیاسییەوە چ لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە. هەرچەندە بڕێك لایەنی سۆزداری بابەتی زاڵی شیعرەکانە، ناوەڕۆکی شیعرەکان لە بابەتدا سەربەخۆن و هیچ بابەتێك بە تەواوی زاڵ نییە بەسەر شیعرەکاندا، بەو واتایەی ببێتە سەنتەر بۆ شیعرەکان ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بابەتانەی دەبنە شیعر، دەکرێت بڵێین تا ڕادەیەك جیاوازن لە شیعری ئەو سەردەمە و دوورن لە شیعار و تەنها پەسن نین، وەك لەم شیعرەدا دەیبینین:

هەڵەبجە

لە شارێکی گچکەدا

لە قەبرێکی گەورەدا

پێنج هەزار کورد

زمناکۆ بوو بە کێلی

ئاسمان بە چەتری سەری

ئەم شیعرە بە تەواوی دوورە لە هەموو دروشم و پێداگوتن و گریان و شیوەنێك بۆ ئەو کارەساتە و بە وێنەیەکی شیعریی کورت توانراوە تەواوی ئازارەکە پیشان بدرێت و گوزارشتی

لێبکرێت، هەر ئەمەیە وا دەکات بڵێین شیعرەکانی ئەم قۆناغە هەوڵی شاعیرن بۆ دۆزینەوەی ڕێگە و تایبەتمەندیی شیعری خۆی. جگە لەوەی هەر لێرەدا بەر پارچە شیعری زۆر جوان و تایبەت دەکەوین، لەوانە شیعری "تکا، سێبەر، مەغریبستان و..." ئەمەش ئەو خامەیە کە شیعری هیوا قادری لەسەر دروست دەبێت و لە قۆناغەکانی دواتردا بە شێوازی خۆی دەردەکەوێت.

## قۆناغی دووەم

بە پێی ئەو پۆلێنەی ئێمە کردوومانە، هەردوو کۆمەڵە شیعری "کیشوەرێك لە خەون و سێوی سوور" ل**91ـ 188** دەگرێتەوە. لێرەوە خوێنەر بەر گۆڕانکارییەك دەکەوێت، کە لە پێکهاتەی شیعرەکاندا لە ڕووی تەکنیك و بابەتەوە، بە تەواوی ئەوە ڕوون دەبێتەوە لە بەشی پێشوودا ئاماژەمان پێدا، ئەو بەشە بە تەواوی سەرەتای ڕێگەکەیە و لێرەوە ڕێگەکە دۆزراوەتەوە و شاعیر تەواو ڕوونە لە تێکستەکاندا، خوێنەر لێرەوە هیوا قادری شاعیر دەناسێت و دەتوانێت شوناسی شیعرەکانی بناسێت و جیای بکاتەوە. لێرەوە شیعرەکان دەبنە خاوەنی فۆرمێکی تایبەت کە بە تەواوی لە بەشی پێشوو جیاوازن و جۆرێك لە کامڵبوونیان پێوە دیارە، لە ڕووی بابەتییەوە گۆڕانێکی گەورە دەردەکەوێت. لێرەوە بابەتەکان سادە و ڕووکەش نین، بەڵکو هەڵگری شوناسن چ بۆ شیعرەکان و چ بۆ شاعیر، تەنها هەڵگری خەسڵەتی شیعریی نین، بەڵکو زیاتر مامەڵەیە لەگەڵ کۆمەڵێك ئازاری ناوەوەی ئینسان و خۆنووسینەوە، دنیابینییەکی فراوانتریان لە پشتەوەیە و بە تەواوی لە ساتی هەستی و بینینی شاعیرانەی ڕووت بۆ شتەکان دەرچوون، بە نێو ئازار و درککردنی بوون بە هەموو پێکهاتەکانییەوە ڕۆ چوون. لێرەدا زۆرتر هەست بە ئامادەیی شاعیر دەکەی، بەو مانایەی دەقەکان دەبنە کۆمەڵێ دەقی خودیی، جوانیی ئەم خودبوونە لەوەدایە خوێنەر ئەتوانێت وابەستەی بێت، لە کاتی خوێندنەوەدا ئەو هەستەت ناداتێ، کە ئەوەی لە دەقەکەدایە، تەنها هی ئەوە، تۆش دەتوانی ئەوەت هەبێت، بە ئارامی دەستمان دەگرێت و دەمانبات بۆ ناو خودێتیی خۆی، ئەمە بە



تەواوەتی لە شیعری "ئێواران شوعلەی مۆمێك بەسە بۆ حونجەکردنی غەریبی"دا دەبینرێت:
هەموو نیشتنەوەیەك دۆڕاندنە دۆڕاندن
گەر نیشتنەوەی باڵدارەکان نەبووایە،
مرۆڤ بە ئاسانی لە فێڵەکانی ڕاو نەدەگەشت.
گەر دۆڕاندنی باڵەکان نەبووایە،
ئێستا هەموومان شەقەی باڵمان دەهات، کچەکەم.
ئەوەی ئەم تێکستە بەیانی دەکات، چەندە پەیوەستە بەو دۆخەی لە غەریبیدا شاعیر وەك تاك هەستی پێکردووە، هێندەش توانیویەتی بیکات بە ئازارێکی قوڵتر لە ناو غەریبیدا، کە دۆڕاندن و لەدەستدانە، ئازارەکە وا دەخاتە ڕوو لە دەرەوەی غەریبیش هەمان سوێی هەبێت، یان گەر غەریبیش نەبین، دۆڕان و لەدەستدان دەبنە ئازار بۆمان، ئەمە وای کردووە تێکستەکان ئەنانی نەبن لە ئاست خوێنەردا و خوێنەر دەتوانێت وابەستەیان بێت.
ئەوەی لەم بەشەدا هەستی پێدەکەین، دەرکەوتنی سروشتە وەك بابەت لە تێکستەکاندا، بە جۆرێك شێواز و تایبەتمەندیی پێدەدات، ناوەڕۆك و فۆرمی شیعرەکان دەگرێتەوە و ئەوەی دەیبینین، تەنها وێناندن یان پەسن و بەکارهێنان نییە، بەڵکو جۆرێکە لە ئافراندن، بەردەوام لە تێکستەکاندا ئامادەیی هەیە و دەبێتە بابەت. ئەمەش وای کردووە وەك جۆرێك لە شوناس و سیمای تێکستەکانی لێبێت و بەوەدا بیانناسینەوە، ئامادەیی سروشت لێرەدا تەنها بریتی نییە لە دەرکەوتن و قووڵبوونەوە، بەڵکو بە تەواوی کامڵ دەبێت، بە جۆرێك، لە بەشی دواتردا درێژەپێدەری ئەم بابەتە نییە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ شاعیر ئەوەی ویستویەتی، لێرەدا پێی گەیشتووە، خۆی بەئاگا بووە لەوەی درێژەدان بەو بابەتە جوینەوە و دووبارەکردنەوە دەبێت، بۆیە لە بەشی داهاتوودا کەمتر بەر ئەم بابەتە دەکەوین.
مامەڵەکردنی هیوا قادر لەگەڵ سروشت کۆپیکردنی سروشت نییە، بەڵکو پێدانی واتایە بە بوونی هەریەك لەو شتانەی سروشت، کە بەکاری دێنێت، "بەسمە بەم پیریەوە بە جانتایەك

پەیڤەوە باسی جوانیی هەرمێ بکەم" ل118، تەواوی قورسایی دێڕەکە دراوە بە هەرمێ. هێنانی پیری و جانتایەك پەیڤ بۆ قورسایی بەخشینە بە هەرمێ، چونکە هەریەك لە پیری و پەیڤ تایبەتمەندی و پیرۆزیی خۆیان هەیە، لێرەدا ئەو حیکمەتی پیری و جانتا پەیڤە بەرامبەر جوانیی هەرمێیەکە، گەر هەرمێ نەبێت حیکمەتی پیر و جانتا پەیڤەکە بێسوود دەبن، بوونی هەرمێ تەواوکەری بەکارهێنراوەکانی تری دێڕەکەیە، ئەمە ئەو بوونەیە شاعیر دەیبەخشێ بە سروشت و وەك بەشێك لە بوون هەژماری دەکات نەك تەنها وەك جوانی. "بە گوڵێ بڵێ، تا ناوی تۆ بنێت لە هەڵاڵەیەکی نەپیتراو پێش گواستنەوەی بە باڵی هەنگ" لێرەدا هیچ جیاکارییەك نییە لە نێوان بوونی ئەو و گوڵدا. ئەم یەکسانکردنەوەیە بینینی جەوهەری سروشتە لە دیدی شاعیرەوە. لە هەردوو شیعری "دوعایەك بۆ تەنهایی و سێوی سور" سروشت دەگاتە ئاستێکی زۆر باڵا و دەبێتە هەبوویێکی پیرۆز و باڵا، "خودایە ڕێم بدە سیمات وەك دەنکێ قۆخ ببینم" ل 155. دەنکێك قۆخ دەگاتە ئاستی سیمای خودا، پیشاندانی ئەم وێنەیە جگە لەوەی دۆخێکی عاریفانەیە، بە دیوێکی تردا بەرزکردنەوەی سروشتە بۆ ئەو ئاستە باڵایە، کە شاعیر دەیەوێت بە جۆرێکی تر خودا ببینێت و وێنای بکات، ئەویش لە ڕێگەی سروشتەوە، لێرەدا هەردووکیان دەبنە دوو هەبووی باڵا، کە شایستەی ئەوەن سیما و جەوهەری یەکتر دەرخەن، قۆخ سیمای خودا دەردەخات و خوداش جەوهەری قۆخ!

جگە لەوەی لەم بەشەدا سروشت بابەتی سەرەکیی زۆربەی شیعرەکانە، بابەتی تریش دەبینرێن، وەك خودا، تەنیایی، مەنفا، ئەو ئازارانەی هەریەکەمان وەك ئینسان هەستی پێدەکەین، باسکردن لە مردن، باسکردن لە خود و لەو پرسیارە وجودییانەی شاعیر هەیەتی و زۆریتر، کە ناکرێت یەکەیەکە هەموویان باس بکرێن.

ئەوەی جێی سەرنجە لێرەدا، ناونیشانی شیعرەکانە، جۆرێك لە تایبەتمەندیی دەبەخشێتە تێکستەکانی ئەم بەشە، کە لە بەشی پێشتر و دوای خۆیشی جیای دەکاتەوە. لە کۆی ناونیشانەکان تەنها شەش ناونیشانی کورت دەبینرێن. ئەوانیش "سیگار، مەحاڵ، چاوەکانمان، من وام هاورێ، دوعایەك بۆ تەنهایی و سێوی سوور" ئەوەی دەمێنێتەوە هەموو ناونیشانەکان وێنەیەکی شیعرین "لەپی دەستم





بۆی شەممەی خاکێکی لێدێ لەوپەڕی دونیا، پۆرتریتێك کاڵ کاڵ وەك شەبەنگ، گوڵنارێك لە سنگمدایە هەنارێك دەگرێت..." ئەم ناونیشانە ڕستەیەکە وێنەیەکی شیعرییت لەلا دروست دەکات، کە شیعرەکەی لە ناودا نییە، بەو مانایەی شیعرەکان هەڵنەپێچراونەتە ناونیشانەکەوە. وێنەکان لە ناونیشانەکەوە دروست نابن، ئەوەی لە تێکستەکەدایە لە "گێڕانەوە و وێنە و بابەتەوە" هاوپێچی ناونیشانەکەی نییە، گەر بڕوانینە شیعری "گوڵنارێك لە سنگمدایە هەنارێك دەگرێت" ئەوەی دەیبینین، هیچی پەیوەست نییە بە ناونیشانەکەوە، نەباسی هەنار نە باسی گوڵنار! هەموو تکا و تەمەننا بچووکەکانی شاعیر دۆخێکی ڕۆحیی ناسکی دروست کردووە، کاتێك شیعرەکە دەخوێنینەوە، هەست بە گوڵنارەکە دەکەین، کە چۆن هەناری گرتووە! لە کاتێکدا ئەوەی لە شیعرەکەدا ڕوو دەدا، لە ناونیشاندا بەیان نەکراوە، بە پێچەوانەی بەشی دواتر کە کۆمەڵەی "یار لە باخە" هەندێك لە ناونیشانەکان ئەمە دروست دەکەن. ئەوەی لە شیعرەکەدا ڕوو دەدات، بە تەواوی پەیوەستە بە ناونیشانەوە "تەرمیناڵ، یۆتۆپیا، یار لە باخە، پاسە شینەکە..." لە شیعری یار لە باخەدا کە بە "تۆ کە ئەچیتە باخ" ل**231** دەست پێدەکات، ڕاستەوخۆ درك بەوە دەکەی تا یار نەچێتە باخ، هیچ دروست نابێت و ڕوو نادات، بە هەمان شێوە لە شیعری پاسە شینەکەدا "من سواری پاسە شینەکە ئەبم و"**247** هەموو شتێك لە دوای ئەوە دەست پێدەکات، ئەم ناونیشانە وا لە خوێنەر دەکات دڵنیا بێت لەوەی هەموو شتێك پەیوەستە بە پاسە شینەکەوە، کە وەستا یا ئەو دابەزی، خاڵێك بۆ کۆتایی شیعرەکە هەیە، بەڵام لەوی پێشتردا ناونیشان ناتوانێت ئەو هەستە بداتە خوێنەر، بەکارهێنانی ئەم دوو جۆرە لە ناونیشان هەردووکیان دوو تەکنیکی تایبەتمەندن بۆ دانانی ناونیشان و بەستنەوە و ڕەهاکردنی تێکست لە ناونیشاندا وا دەکات فۆرمێکی جوان لە نێوان تێکست و ناونیشاندا دروست ببێت.

## قۆناغی سێیەم

کۆمەڵە شیعری یار لە باخە کە بەپێی ئەم پۆلێنبەندییە دەبێتە بەشی سێهەم، ئەم کۆمەڵەیە جیاوازە لەوانی تر لە ڕووی بابەت و فۆرمەوە، دەکرێت بڵێین دیوێکی تری شاعیرە لە دنیابینی و ڕوانینی بۆ شتەکان، بۆیە ئەوەی پێشتر دەبووە بابەتی سەرەکی، لێرەوە کەم دەردەکەوێت. بۆ نموونە ئەم بەشە وەك بەشی پێشتر نەتەنراوە بە بەکارهێنانی سروشت، وەك ئاماژەمان پێدا، شاعیر لە بەشی پێشتردا ئەو بابەتە دەگەیەنێنە کەماڵ و لێرەشدا بەئاگایە لەوەی پێویست بە دووبارەکردنەوە و جوویینەوە ناکات، بەو مانایە نا بە تەواوی ڕەتی بکاتەوە، بەڵکو لە شوێنی خۆی دایدەنێت و کە دێتە ناو شیعرەکانەوە، بە سیما و خەسڵەتێکی ترەوە دێت و ڕەنگی ئەم بەشەی بەسەریدا زاڵ دەبێت، جیاواز لە بەشی پێشتر، واتا سروشتیش دەکەوێتە دۆخێکی ترەوە و بۆ جۆرێکی تر بەکار دێت. لێرەدا شاعیر مامەڵە لەگەڵ کۆمەڵ بابەتی تر دەکات، لەو زاڵبوونە زۆرەی سروشت دێتە دەرێ کە لە بەشی پێشتردا دەبینرا، خۆی لە دووبارەیی و جوویینەوەی بابەتەکانی پێشتر بەدوور دەگرێت، بە وریاییەوە ڕوو دەکاتە نۆرمێکی تر لە نووسینی شیعر، جیاواز لە پێشوو. هەرچەندە ناتوانین بڵێین ئەم تێکستانە بەدەرن لە شێواز و فۆرم و بابەتی هیوا قادر، بەڵام ئەم کۆمەڵە شیعرە هێزیکیان پێیە، بە تەواوی وەك کۆمەڵەیەکی جیاواز دەردەکەون.

ئەوەی لێرەدا زاڵە، چاوی موسافیرێکە کە هەموو شتێك دەگێڕێتەوە، بە تەواوی هەست بەوە دەکەین ئەو چاوە وێنەکان و گێڕانەوەکان دێنێتە ناو تێکستەکانەوە، لە شیعری تەرمیناڵەوە دەمانبات بۆ یۆتۆپیا دواتر یار لە باخە و دوای ئەوانیش پاسە سوورەکە و پاسە شینەکە و پاسە سپییەکە دێن و دواتریش ئەمانسپێرێ بە فریشتەیەکی سپی. هەریەك لە ناونیشانەکان بەسن بۆ ئەوەی ئێمە موسافیری پشت تێکستەکان بناسین، جگە لەوەی هەریەك لەو وێنانەی شیعرەکان دروستی دەکەن، ئەوەمان لا ڕوونتر دەکەنەوە.

شەمەندەفەرێکی ئێکسپرێس
بە چواردەوری گۆی زەویدا دەڕوات و
لە هەموو ئەو شارانە لادەدات
کە لە ناو کتێبەکاندان. ل191





لە شیعری یۆتۆپیادا هەر لە سەرەتاوە خۆی وەك موسافیرێك پێمان دەناسێنێت، هەرچەند وەك خەیاڵیش بێت، ئەیەوێت لە مناڵییەوە دەسپێکردنەوەکەی وەك موسافیرێك بێت.

من دەڕۆم کەس پێم نەڵێت بۆ کوێ،
کەس دوام نەکەوێت، کەس لێم تووڕە نەبێت ل**211**

هەموو وێنانەکان لە یار لە باخە دا وا دەردەکەون موسافیرێك بیانگێڕێتەوە،
کە یار سەیری ئاسمان ئەکات، باخ ئەچێتە ئاسمان،
کە پیاسە ئەکات، درەخت لەگەڵی ئەڕوات،
باڵدار لەگەڵی ئەفڕێت، کە دڵی پڕ ئەبێت لە ئیشتیاق،
با دەست ئەگرێ بە بۆنی زوڵفی یارەوە،
نەبا سەر چلە شۆڕەبییەکی سەرخۆش مەحتەلیکات
بە خۆیەوە. ل**235_234**

هەریەك لەم وێنانە ئەوە لای خوێنەر دروست دەکەن ئەو چاوەی ئەمانەی بینیووە موسافیرێکە بۆ پشووێك لە باخە، چونکە هیچ کام لە وێنەکان ڕەها نین و پێمان ناڵێن کە هەموو ڕۆژێك یا هەموو ساتێك یار لە باخە، تەواوی تێکستەکە ساتی هاتن و لەوێبوونی یار بەیان دەکات، کە چی لە باخ دێت ئەو کاتەی یار لە باخە.

هەریەك لە تێکستەکانی "پاسە سوورەکە و پاسە شینەکە و پاسە سپیەکە" ڕەنگە پێویستیان بە ڕاڤە نەبێت جگە لەوەی لە پاسە سوورەکەدا ئاماژە بەوە دراوە "ناوپاسەکەی نێوان سکانسن و سەنتەری شاری ستۆکهۆڵم"، لەگەڵ ئەوەشدا تەواوی وێنەکان لەو چاوەوە دەگەنە ناو تێکستەکە.

ئاسمانەکە شین بوو
زەویش سەوز
تۆ پاڵت بە درەختێکەوە دابوو
کە گوڵی سپی داپۆشیبوو،
من خۆم لەچاوی تۆدا ئەبینی

بەڵام من لەوێ نەبووم. ل**241**

هەر لەم تێکستانەدا تەنها چاوی موسافیرەکە کار ناکات، بەڵکو خەیاڵ و یادەوەریی ڕۆڵی خۆیان دەبێت، موسافیرەکە بە هۆی درێژیی ڕێگەکان یا هەر شتێکی ترەوە بێت، دەرفەتی بیرکردنەوە و هێنانەوەیادی یادەوەرییەکانی هەیە و ئەمانە دەبنە وێنەی شیعری.

تۆ خۆت ووتت
کە جامە ئاوەکەت بەدوامدا
ڕشتبوو
بۆنی دوای باران لە خۆڵەکە هەستابوو،
ئەو کاتە خۆزگەت خواردبوو
نەبۆنی خۆڵی دوای بارانت بکردایە و
نە ئاویشت بڕشتایە،
بەس تەنها من نەڕۆیشتمایە.ل**242**

ئەوەی وێنەکان دروست دەکات، هیچی نەبینراوە، ئەوە یادەوەرییەکە لە ڕێگەی گێڕانەوەوە بۆی دروست بووە، لەو کاتەدا ئەو یادەوەرییە کارا دەبێت و وێنەیەك دروست دەکات، کە تەواوی دەلالەتەکانی موسافیربوونە، ڕەنگە بەمەش شاعیر بیەوێت بە تەواوەتی کارەکتەری ئەو موسافیرە لە شیعرەکانیدا بەرجەستە بکات.

یەکێکی تر لەوانەی لێرەدا جێی سەرنجە، زاڵبوونی خەیاڵە، بە جۆرێك زیادەڕەویی نییە، گەر بڵێین لەم بەشەدا خەیاڵ دەبێتە سەنتەر و قورساییەکی زۆری هەیە، ئەو گۆڕانە بەرچاوەی لەم بەشەدا دەبینرێت، بە کاریگەریی ئەو زاڵبوونەی خەیاڵی دەزانین، بەو مانایە نا پێشتر خەیاڵ کاری خۆی نەکردبێت، بە پێچەوانەوە، هەمیشە خەیاڵ لە شیعری هیوا قادردا ئامادەیی هەبووە، بەڵام لەم بەشەدا دەگاتە کەماڵ، توانیوویەتی



شێوەیەکی تر بدات بە شیعرەکان، بە جۆرێك، وای کردووە شاعیر لە هەندێك بابەت دوور بکەوێتەوە و بیپارێزێت لە دووبارەیی.
تۆ لەناو خۆمدا دائەنیشێنم
بۆ ئەوەی بەلاتا تێپەڕیم بانگم بکەیت، ل**208**

بەگشتی، شیعری هیوا قادر کەشێکی عیرفانی هەیە، هەڵە نین گەر بڵێین جۆرێك لە سۆفییەتی یا عیرفانیەتی تایبەتە، لە چوارچێوەی شیعر و ئەو هەستانەوە دروست دەبێت، کە شاعیر هەیەتی، نەك سەر بە تایپێکی دیاریکراو، بەو واتایەی شتێکە لە دەوری هێزێکی ناوەکیی شاعیر دەسووڕێتەوە، نەك لە دەرەوەی ئەو، یان ئەکرێت بڵێین بینینی ئەوە بۆ شتەکان. لەم نێوەدا خوداش دەبێتە شتێکی تر، ناتوانین لێرەدا درێژە بەم باسە بدەین، تەنها ئەمەوێت باسێکی کورتی خودا بکەم.
ئەو خوایەی لای هیوا قادر دەبینرێت، خوایەکی شاعیرانەیە، یان دەتوانین بڵێین خوای هیوا قادر خۆیەتی. نایەوێت مامەڵەیەکی بڵند یا پیرۆز لەگەڵ خوادا بکات، ناشیەوێت لە بەرزیدا دایبنێت، مامەڵەیەکی ئاسایی لەگەڵ دەکات،
خودایە خودای من..
ڕێم بدە بتبینم،
ڕووت و قووت.ل**154**
وەك ئەوەی بۆ دیوێکی تری خودا بگەڕێت و لەو ئاستە گشتییە بێتە دەر، کە تەنها گەورەیی و پیرۆزی خودا دەبینن،
ڕێم بدە هێندە عاشقی گەورەیت نەبم و بچوکیتم
خۆشبوێت؟
دوور لە ترس گەورەیی تۆ بپەرستم.ل**154**
نایهەوێت تەنها لە شتی بەبەها و گەورە یا پیرۆز بۆ خوا بگەڕێت و ئەیەوێت لە هەموو جێگە و

شوێنێك هەبێت و بیبینێت،
ڕێم بدە سیمات وەك دەنكێك قۆغ،
وەك تاڵێك ئاوریشم سادە ببینم. ل**155**
وەزیفەیەكی پێدەدات لە زەوی و دایدەبڕێت لە ئاسمان، لە شێوە گشتیەكەدا خودا دەبێتە بوونێك بێ پیرۆزی و بڵندی و مامەڵەكردنیشی وەك هەبووێك دەبێت، كە دەشێت ئیشی بچووكی هەبێت و پێوەی سەرقاڵ بێت.
بە پارەی ڕۆژانەكەم هەموو ئەو شتانەی دنیا دەكڕم
كە بۆ فرۆشتن نین،
پێش هەر شت خودا دەكڕم و ئەیخەمە ژێر مریشكێكی كڕ كەوتووەوە و
پێی ئەڵێم گەر بێدەنگ نەبیت بەو مریشكە دەڵێم تۆ دەنكێك گەنمیت تا بتخوات. ل**213**
دەیهێنێتە ئاستی خۆی و قسەی لەگەڵ دەكات، بە تەواوەتی وەك خۆی دەیبینێت یان وەك یارییەك بە شوێنی خۆی و خودا بكات، بە تەواوی ڕوون نییە ئەمە خوددۆزینەوەیە یاخود پێدانی مەقامی خودایە بە خۆی،
لە سادەییدا من هەر هاواری خوا ئەكەم،

ا
خۆمدا ئەگەڕێم ل **185**
ئەمانەشدا خودا بێبەری ناكات لە جوانی و لە هەندیك
دا وەك پێویستییەكی ڕۆحی دەیبینێت. ئەمەش بازنەی ئەو
فانیەتە تەواو دەكات، كە لە شیعرەكاندا هەن،
دایە نوری خۆت ببەخشە بە هەموو عاشقێك تا تەنهایی
مانكوژێت. ل**155**



# میلان کوندێرا

# ژیان وا لە شوێنێکی دیکە

لە ئینگلیزییەوە **شێرزاد حەسەن**






میلان کوندێرا
ژیان وا لە شوێنێکی دیکە
شێرزاد حەسەن

# سیستێمەکەی ستانیسلاڤسکی و کارکردنی ئەکتەر لەسەر ڕۆڵ

دانا ڕەئووف

شانۆکاری گەورەی ڕووسی (کۆنستانتین ستانیسلاڤسکی) ١٨٦٣-١٩٣٨ لە سەرەتاکانی سەدەی ڕابردوودا، بنەما تیۆری و پراکتیکییەکانی بۆ هونەری نواندنێکی مۆدێرن ڕۆنا و مێتودی کارکردنی ئەکتەری، بە شێوەیەك بەرەو پێشەوە برد، کە لەگەڵ هەموو جیهاندا بگونجێت.

ستانیسلاڤسکی تا دوا ڕۆژەکانی ژیانی خەریکی ڕاڤە و شیکردنەوە و بەرەوپێشەوەبردنی سیستێم و مێتودەکانی کاری ئەکتەر دەبێت، لە دوای مردنیشی سامانێکی گەورەی بەجێ هێشتووە. ئەم هونەرمەندە هەر لە سەرەتای ژیانی هونەرییەوە، بە بەردەوامی یاداشت و تێبینی و بۆچوون و بەرئەنجامەکانی سەبارەت بە کارەکەی تۆمار کردووە؛ لەو یاداشتانەیدا هەنگاوە بەراییەکانی خۆئامادەکردن، تاقیکردنەوە، بەرجەستەکردن و تێرامانی ئامادەکردنی ڕۆڵی ئەکتەری خستۆتە ڕوو. کتێبی (کارکردنی ئەکتەر لەسەر ڕۆڵ) لەسەر بەشێك لەو سامان و یاداشت و نامە و یادەوەرییانەوە ئامادە کراوە، کە ستانیسلاڤسکی نوسیوونی. کتێبەکە ناونیشانێکی لاوەکییشی هەیە (چەند بابەتی کتێبێك) بۆ ئەوەی دووپاتی ئەوە بکاتەوە، کە ئەمە تەنها هەڵبژاردەیەکە لەو باسانەی نووسەر بە درێژایی ژیانی هونەریی خۆی نوسیوونی. هەموو ئەو کتێبانەی کە ستانیسلاڤسکی نوسیوونی و ئەوانەیشی لەسەر ئەو نووسراون، گوزارشت لە ژیانێکی چڕ و دەوڵەمەندی هونەری مرۆڤێك لە نیو سەدەدا دەکەن؛ کە باسی ستانیسلاڤسکییش دەکەین، دەبێت بزانین قسە لەسەر چ ستانیسلاڤسکییەك دەکەین: ریژیسۆر، ئەکتەر، پێداگۆگ، ستانیسلاڤسکی سەرەتا یان کۆتایی. زۆربەی لێکۆڵەرەوەکانی ئەم بوارە، سەرەتاکانی کار و چالاکی و بەرهەمەکانی ستانیسلاڤسکی دەگەڕێننەوە بۆ سالانی ١٩٠٩-١٩٢٥، لەم قۆناخەدا زیاتر کاری لەسەر مەسەلەکانی ڕاستگۆیی لە هەست و هۆشدا کردووە، قۆناخەکانی دواتریش دەگەڕێتەوە بۆ سالانی ١٩٢٩-١٩٣٨، لەم قۆناخەیشدا توانیویەتی مێتودەکانی، بەتایبەتیش سەبارەت بە کردارە فیزیکییەکان (جووڵە جەستەییەکان) بەرەو پێشەوە بەرێت. مێتودە فیزیکییەکانیش بریتی بوون لەوەی، کە پێویستە ئەکتەر دەستبەجێ و ڕاستەوخۆ لەسەر تەختەی شانۆ (بە یارمەتیی کردارە فیزیکییەکان) بە جەستە و بیرکردنەوە، لە شانۆنامە و ڕۆڵەکەی بکۆڵێتەوە.

کە (ئەلێکساندەر بلۆك) لە ساڵی ١٩١٢دا شانۆنامەی (لاشەیەکی زیندوو) لەسەر شانۆی هونەریی مۆسکۆ دەبینێت، لە یاداشتەکانیدا دەنووسێت: (هەموو ئەکتەرەکان زۆر باش و بێهاوتا بوون، بەڵام ئەوان ئەکتەر بوون، تەنها ستانیسلاڤسکی سەرلەنوێ ئەکتەر و مرۆڤیش بوو، تێکهەڵکێشکردنێکی ئەفسوونی ژیان و هونەر.) ئەو قوتابخانەیەی ستانیسلاڤسکی بۆ ڕاهێنان و دروستکردنی ئەکتەر و گەشەی سیستێمەکەی دایمەزراندبوو، تەنها هەر





بۆ ئەوە نەبوو، کە خۆی لە بەرەوپێشچوونێکی بەردەوامدا بێت و شتی نوێ فێر بێت، بەڵکو بە شێوەیەکی گشتی بۆ ئەوەیش بوو، کە قوتابی و ئەکتەرەکانی فێری ئەوە بکات، بە چ شێوەیەك ئەو تێکهەڵکێشکردنە ئەفسونییەی ژیان و هونەر فێر بن. لە ساڵی ١٨٨٩دا لە یەکێك لە یاداشتەکانیدا نووسیویەتی، دەبێت هەموو ڕێگایەك بگرین، کە لە حەقیقەت و ژیان نزیکمان دەکەنەوە. (بۆ ئەوەی بگەینە ئەو شوێنەیش، دەبێت بزانین مەبەستمان لە حەقیقەت و لە ژیان چییە. ئەمەیش کاری منە، کە لەم دوو شتە بکۆڵمەوە.) هەروەها ستانیسلاڤسکی بە پێداگرییەوە ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە، کە (مرۆڤ دەبێت لە پێناوی گەیشتن بە ڕاستی سنوورەکان بترازێنێت) ئەمە داوای ستانیسلاڤسکی نەبووە تەنها لە ئەکتەرەکانی ئەوێ ڕۆژێ، بەڵکو پرەنسیپێکی کۆنکرێتیی هەمیشەییە بۆ ئەکتەر. کاتێك ستانیسلاڤسکی لە پێناوی گەیشتن بە ڕاستی و حەقیقەت، داوای بەزاندن و لێکترازانی سنوورەکان دەکات، هاوکات پرسێکی زۆر گرینگی هونەری نواندن دەورووژێنێت. ئەویش ڕۆڵی ئەکتەر و بوون بە ڕۆڵە. بۆ ستانیسلاڤسکی ڕاستی و حەقیقەت لە هونەردا پەیوەست بووە بە چەمکەکانی دیمۆکراسی، بە هاوڵاتیبوونەوە، بە بڕوابوون بە هێز و وزەی شانۆوە، بڕوابوون بە کاری شانۆ لە کۆمەڵگا و لە بوونی مرۆڤدا. ستانیسلاڤسکی لە کتێبە دانسقەکەیشیدا (ژیانم لە هونەردا) باسی ڕەوتی هونەری خۆی بەم شێوەیە دەکات و دەڵێت: (دۆزینەوەی ڕێگایەك لە سروشتگەراییەکی دەرەکی و ڕواڵەتئامێزەوە بۆ ڕیالیزمێکی قووڵ و ناوەکی.)

ستانیسلاڤسکی، هەمیشە داوای لە ئەکتەرەکانی کردووە، کە لە ئێستادا بژین. ئەکتەر دەبێت لە ژیانی ئێستای خۆیەوە کار لەسەر ڕۆڵەکانی بکات، بنەما سەرەتاییەکانی کاری ئەکتەر لەگەڵ ڕۆڵەکانی ئەوەیە، کە شتە هەنووکەییەکان، ئەوانەی لە چاوتروکانێکدا ڕوو دەدەن، بکاتە کردار و خۆی لە هەموو ڕۆڵێکدا، کە دەیبینێت، بدۆزێتەوە. ئەم هونەرمەندە، کە لە ساڵی ١٩١٢دا خەریکی ئامادەکردنی شانۆنامەی (تەرتوف)ی مۆلێیر دەبێت، گرینگترین بنەمای ڕووکارەکانی دەرەوە

و ناوەوەی کارەکتەر شی دەکاتەوە و مێتودەکەی هەنگاوێکی تر بەرەوپێشەوە دەبات. لەم ڕووەوە دەڵێت: "بۆ ئامادەکردن و کارکردن لە ڕۆڵدا، لە خودی خۆتەوە دەست پێدەکەیت، مرۆڤ تەنها ئەو شتانە بەکار ناهێنێت، کە وەك ئەکتەر لە خۆیدا هەن، بەڵکو نابێت فەنتازیا و بنەما و مانا فرەڕەهەندەکانی نمایشەکە لە یاد بکات."

هەموو ئەو شتانەی ئەمڕۆ بۆ ئێمە بەڵگەنەویستن، بۆ ئەو سەردەمەی ستانیسلاڤسکی تیا دەژیا، جودا بوون. ئەو سەردەمە سەردەمی ناتوراليزم بوو، (ئەمیل زۆلا) لە ساڵی ١٨٨١دا مانیڤێستی (شانۆی ناتوارالیزم)ی بڵاو کردبووەوە، بزووتنەوەکەیش لە ساڵی ١٨٨٧دا، بە کردنەوەی شانۆکەی (ئەندرییە ئەنتوان) (شانۆی سەربەست) یان لیبراڵ لە پاریس، دەبێت بە خاوەنی پێگە و شانۆی خۆی. لەم کاتانەدا ستانیسلاڤسکی و دانچینکۆ، لە ساڵی ١٨٩٨دا شانۆی هونەریی مۆسکۆ دادەمەزرێنن، هەر لە ڕێگای ئەم شانۆیەشەوە ستانیسلاڤسکی سیستێمە بەناوبانگەکەی بۆ هونەری نواندن دەخوڵقێنێت و کاری لەسەر دەکات. شانۆنامەکانی چێخەف، کە هەر لە سەرەتاوە لەم شانۆیەدا نمایش کراون، پێویستییان بە کارێکی قووڵتری ئەکتەر، هێزێکی تری مۆتیڤە ناوەکییەکان، ڕاستگۆییەکی گەورەتری نواندن دەکرد، کە لەوەوپێش بە هیچ شێوەیەك کاری تیا نەکرابوو. هەوڵە سەرەتاییەکانی تەوژمی ناتورالیزم لەسەر شانۆ و لە لای ئەکتەرەکانی ستانیسلاڤسکی، بەتایبەتی لە بەرجەستەکردنی دەقەکانی چێخەفدا گەیشتبوونە ئاستێکی چەقبەستوو و نمایشەکانیش بە وردەکارییە ڕواڵەتئامێزەکان بارگراوی کرابوون. چێخەف ئەو فۆرمە ناتورالیزمییەی بەدڵ نەبوو، کە ستانیسلاڤسکی شانۆنامەکانی ئەوی پێ پێشکەش دەکرد، ستانیسلاڤسکی خۆیشی لە بەرئەنجامەکان قایل نابێت، بەمەیش تووشی قەیرانێکی هونەری قووڵ دەبێتەوە. ئەم قەیرانە، کە لە ساڵەکانی ١٩٠٥دا ڕوو ئەدات، دەبێتە هۆی کێشە و ململانێیەکی گەورە، هەر لەم قەیرانیشەوە سیستێمەکەی ستانیسلاڤسکی چەکەرە دەکات و هەنگاوی دروست دەنێت و مێتودێکی تر بۆ هونەری نواندن دەدۆزێتەوە. ستانیسلاڤسکی ددان بەوەدا دەنێت، کە لە ساڵی ١٩٠٩دا وەك ئەکتەر و ریژیسۆر کاری لە شانۆنامەی (مانگێك لە لادێ)ی (تۆرگنێڤ) کردووە، گەیشتۆتە بەرئەنجامێکی تر و توانیویەتی چارەسەر بۆ تەنگەژەی سیکۆلۆژی و سیکۆلۆژی ڕیالیزم بدۆزێتەوە. ئەو تەنگەژانەی دەمێك بوون بە دوای چارەسەرەکانیاندا دەگەڕا





و بۆی نەدەدۆزرانەوە، کە خۆی لە خوڵقاندنی تەکنیکێکی ناوەکی، سیستێمێك بۆ ئەکتەر تا بتوانێت بە فەنتازیا و هەست و هۆشی خۆی لە ڕۆڵەکەی نزیك بێتەوە و بتوانێت مامەڵە لەگەڵ فۆرم بکات و ناوەڕۆکێکی رۆحیی بدۆزێتەوە.

ستانیسلاڤسکی بنەمای سیستێمەکەی، لە کاتی پرۆڤە و کارکردن لەگەڵ ئەکتەرەکانی و ئەو دەقە شانۆیانەدا، کە لە شانۆی هونەریی مۆسکۆ کاریان تیادا دەکرد، ڕۆناوە. ئەو ڕاستگۆییەی، کە چێخەف داوای لە ئەکتەرەکان دەکرد، بووە بنەمایەکی پتەوی کارەکانی ستانیسلاڤسکی: ڕاستگۆیی تەنها بریتی نییە لە کۆپیکردنی واقیعییەتی ژیانی ڕۆژانە، بەڵکو ڕاستگۆیی دیمەنەکان و نواندنی ئەکتەر شتێکی جیاوازە لەو ڕاستگۆییەی لە واقیعی ژیانی ڕۆژانەماندا دەیبینین. ڕاستگۆیی لەسەر شانۆ، ئەوشتەیە، کە لە ڕاستی بچێت، کە تۆ بڕوات پێیەتی، بەڵام لە واقیعی ژیانی ڕۆژانەدا، ڕاستگۆیی شتگەلێکە بە ڕاستی بوونی هەیە.

بنەما سەرەکییەکانی سیستێمەکەی ستانیسلاڤسکییش لەسەر سێ ڕەهەندی پتەو داڕێژراون: کردار، نەست هەروەها مێتود. مەبەست لە کردار جووڵەی ئەکتەرە و نەستیش ئەو عەقڵە شاراوەیەیە، کە چەندین زانیاریی تیدا هەڵگیراوە و ئەکتەر وەکو بەشێك لە دروستکردنی ڕۆڵەکەیدا پەنای بۆ دەبات. مێتودەکەیش لەسەر بنەماکانی کردار ڕۆ دەنرێت. هەموو جووڵەیەکی جەستە لە دیوی دەرەوە، هاوتەریبە لەگەڵ جووڵەیەکی دیوی ناوەوەی (ناوەکی) ئەکتەرەکە. (تۆڤستۆنۆگۆڤ) کە یەکێکە لە قوتابی و هەوادارانی ستانیسلاڤسکی و نوێکەرەوەی سیستێمەکەی، بەم شێوەیە بنەماکانی سیستێمەکەی ستانیسلاڤسکی ڕوون دەکاتەوە و دەڵێت: (گرینگترین پرنسیپەکان ئەوەیە، کە لە ڕێگای پرۆسەی درکپێکردنەوە وێنەکانی ناو نەست لە لای ئەکتەر بەئاگا بێنیتەوە. ئەی درکپێکردن لە پرۆسەی ژیانی مرۆڤدا چییە؟ کردار و بیرکردنەوەیە. ئەی نەست چییە؟ هەست و سۆز و کاریگەرییەکانیەتی. ئەمەیش مانای وایە، کە هەموو پرۆسەی مەشقەکانمان بریتییە لەوەی، کە لە ڕێگای کردار و بیرکردنەوەوە هەست و سۆزەکانمان بەئاگا

بێنینەوە.)

ئەکتەر، بەرلەوەی بێتە سەر تەختەی شانۆ پێویستە لە هەستی ڕاستەقینەی کارەکتەرەکە بگات، چونکە ئەمە جووڵەی ئەندامەکانی جەستە و تۆنی دەنگ و سیمای گوزارشتئامێز و ئاماژە پێویستەکانی کارەکتەرەکە دەردەخەن، کە دواتر ئەکتەر لە ڕۆڵەکەیدا بەکاریان دەهێنێت و تەنانەت دوای ئەوەی سەر شانۆکەیش چۆڵ دەکات، دەبێت بەمە بزانێت. بۆ ستانیسلاڤسکی نهێنییەکانی خوڵقاندنی فیگوری ڕۆڵێك لەگەڵ بەئاگاهێنانەوەی نەستدا یەك دەگرێتەوە، هەر لەبەر ئەوەیشە ئەم گرفتەی ئەکتەر و مامەڵەی ڕۆڵ لەم گۆشەنیگایەوە بەهایەکی ئێجگار گەورەی هەیە. ستانیسلاڤسکی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە بنەماکانی هونەر و سەرچاوە گرینگەکانی ئەفراندن لە قووڵایی ڕۆحی و نەستی مرۆڤدا خۆی حەشار داوە. بەڵام بەبێ مەشق و پرۆڤەیەکی بەردەوام، بەبێ گەشە و ئاگاییەکی وردی تەکنیکیی ناوەوە، بەبێ دیقەت و دیسپلین و ئارەزوویەکی بەهێز، هەرگیز ئەکتەر ناگاتە ئاستەکانی نەست. مەبەست لە سیستێمەکەیشی تەنها ئەوەیە، کە ئەکتەر بگەیەنێتە ئاستە قووڵ و نهێنییەکانی نەست.

ستانیسلاڤسکی لەو بڕوایەدا بووە، کە گرینگە ئەکتەر وردەکاریی فاکتەکانی دەقەکە، هەروەها هەموو ڕابردوو و داهاتووی ڕۆڵەکەیشی بزانێت بۆ ئەوەی بە باشی لە ئێستای بگات. دوای ئەوەی، کە هەموو فاکتەکانمان زانی، دەبێت ڕووداوەکانی دەقەکە تێبگەین و بۆ هەڵسوکەوتی ڕۆڵەکەیش، ئاڕاستە و هێڵێك بۆ ڕەوتی کردارەکان دیاری بکرێت. هەروەها ستانیسلاڤسکی پێگەی ئەکتەر بەرز دەکاتەوە و لەگەڵ پێگەی نووسەری شانۆنامەکە بەراوردی دەکات؛ هەردووکیان نووسەری شانۆنامەکەن و ئەکتەریش، وەکو نووسەر کار لەسەر توێژە قووڵەکانی ژیان دەکات، بەڵام هەردوولا نهێنییەکانی ژیانی مرۆڤیان بە شێواز و فۆرمی تایبەتمەندی خۆیان بۆ دەردەکەوێت.

ستانیسلاڤسکی دەیەوێت ئەکتەر خۆی و بەبێ کاریگەری و ڕێنمایکردنی هیچ کەسێك بگاتە ئەو ئاستەی، کە لە چ دید و دیمایەکەوە سەیری دەقە شانۆییەکە دەکات. ئەو دید و دیمایەی، کە نووسەری شانۆنامەکە مەبەستییەتی. هەر لێرەیشەوە باسی ئەوە دەکات، کە چۆن ئەکتەر و نووسەری شانۆنامەکە لە یەکتر نیزیك بکرێنەوە؟ چۆن وا لە ئەکتەر






بکات لە باری سایکۆلۆژییەوە لە ڕۆحی ڕۆڵەکەی بگات؟ ئەمەیش بەشێکە لەو پرسیارانەی ستانیسلاڤسکی لەگەڵ ئەکتەرەکانی کاری لەسەر کردوون. هەر لەبەر ئەوە ستانیسلاڤسکی بە لایەوە گرینگە شرۆڤەی فاکتەکانی دەقەکە، بەتایبەتی ئێستا و ڕابردوو و ئایندەی ڕۆڵەکە، لە دووتوێی ڕووداوەکاندا بکرێت. ئەکتەر بۆ ئەوەی بە باشی لە ئێستا بگات، دەبێت ڕابردوو و ئایندەی ڕۆڵەکەی و هەلومەرجەکانی بە باشی بزانێت. کە ڕووداوەکانی دەقەکەیش شی دەکەینەوە، گرینگە هێڵێکی گشتی بۆ هەڵسوکەوت و وردەکارییەکانی جێبەجێکردنی ڕۆڵەکە بکێشرێت، لەوەیش بگات کە پێویستە ئەم پرۆسەیە بە فەنتازیا و خەون و جەستە و ڕۆحی ئەکتەر دەوڵەمەند بکرێت. ستانیسلاڤسکی دەستی ئەکتەرەکانی دەگرێت و ئەو دەروازانەیان بۆ دەکاتەوە تا لە هەموو ڕوویەکەوە لە دەقە شانۆییەکە بگەن: لێکۆڵینەوە لە سەردەمەکە، واقیعی ژیانی ڕۆژانەی نووسەر و ئەو ڕۆژگارەی تێدا ژیاوە، پاشخانە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکانی کارەکتەرەکان و ئەو ڕەوشەی تیا ژیاون و بارودۆخە سیکۆلۆژییەکان... هتد. هەروەها ئاماژەیش بۆ ئەوە دەکات، کە هەموو بنەما ئێستاتیکی، کۆمەڵایەتی، سیکۆلۆژی و مۆتیڤەکانی تری دەقەکە، بە هیچ شێوەیەك لە یەك جیا ناکرێنەوە و هەموویان پێکەوە یەکەیەکی یەکگرتوون. بەم شێوەیەیش ڕووداوەکانی شانۆنامەکە و کرداری ئەکتەرەکان پێکەوە دەبەستێتەوە. ستانیسلاڤسکی ئاگاداری ئەکتەرەکانی دەکاتەوە، کە تەنها لە ڕێگای ڕەخنەیەکی شیکاریی وشکەوە هەوڵ بدەن لە فاکت و ڕووداوەکانی دەقەکە بگەن. ئەکتەر دەبێت بە دوای مانا شاراوەکاندا بگەڕێت و بنەما سیکۆلۆژی و ڕۆحییەکانی بدۆزێتەوە. ستانیسلاڤسکی هانی ئەکتەرەکانی دەدات، کە لە ڕواڵەتە ساکارەکەی ڕووداوەکاندا قووڵ بنەوە و بە وردییەوە جومگەکانی بپشکنن، چونکە لەوێدا، لە قووڵاویی شتە ڕواڵەتییەکاندا، شتێکی گرینگتر، ڕۆحی ڕووداوە شاراوەکە دەدۆزێتەوە، کە لەوانەیە کلیلی کرداره ڕواڵەتییەکان بێت. دیارە دۆزینەوەی نهێنییەکانی ئەم ڕووداو و فاکتانەی نێو دەقەکە بە شێوەیەکی تەواو

و گشتگر، تەنها بە پشتبەستن بە ئەزموونی ئەکتەرێکی پیشەییەوە جێبەجێ نابێت، بەڵکو دەبێت ئەکتەر لە ڕووی هۆش و ئاستی درکپێکردن و ڕۆشنبیری و خۆپێگەیاندنەوە گەشەی کردبێت. گەرنا، بینەر هەست دەکات ئەوەی کە نووسەری شانۆنامەکە لە ڕێگای دەقەکەوە پێشکەشی دەکات، زیاتر لە ڕاستی دەچێت لەوەی ئەکتەرەکان بە جووڵە بەرجەستەی دەکەن. بۆیە ناکرێت دەقی نووسەر لە بیرکردنەوە و لۆژیکی کردارەکانی ئەکتەر و بەرئەنجامەکانی جیا بکرێتەوە. نابێت ئەکتەر بەرلەوەی بنەما و نەخشەی ڕۆڵەکەی بە شێوەیەکی تۆکمە تەواو بووبێت و هزر و کردارەکانی بۆ ڕوون بووبێتەوە، دەیالۆگی ڕۆڵەکەی لەبەر بکات.

ستانیسلاڤسکی لە بەشی (چیرۆکی ڕۆنانی نمایشێك)ی ئەم کتێبەدا باسی ریژیسۆر دەکات: جیاوازییەکان لە نێوان ریژیسۆرێکی دیکتاتۆر، کە هەستی پڕ لە داهێنانی ئەکتەرەکان دەکوژێت و سەربەستیی جووڵە و هەڵسوکەوتەکانیان سنودار دەکات، لەگەڵ ئەو ریژیسۆرەیشی، کە هونەرمەندە، پێداگۆگە، سیکۆلۆژە و لە ڕێگای هونەر و ئەزموونەوە خزمەتی ئەکتەرەکانی دەکات و سروشتی پڕ لە داهێنانیان تیا دەبووژێنێتەوە و بەرەو ئامانجەکانیان دەبات، دەخاتە ڕوو. ئەم ریژیسۆرە، واتە ریژیسۆرە هونەرمەندەکە، پەیوەندییەکی دروست و هونەری بە ئەکتەرەکانییەوە دەبەستێتەوە و ئەم جۆرە هاوکاری و پەیوەندییەیش ژیانێکی زیندوو و ڕاستگۆیەکی قووڵ دەبەخشێت بە پرۆسە شانۆییەکە و بە کاری ئەکتەر لەگەڵ ڕۆڵەکەی. ستانیسلاڤسکی، بەتایبەتی لەم بەشەدا، بە توندی پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت، کە هیچ جیاوازییەك لە نێوان کاری ئەکتەر لەگەڵ خۆی و لەگەڵ ڕۆڵەکەیدا نییە. ئەکتەر چەندە خاوەنی بەهرە و توانایەکی سروشتی گەورە بێت، هێندە و زیاتریش پێویستی بە مەشق و کاری بەردەوام و دۆزینەوەی تەکنیکە.



ستانیسلاڤسکی بە شێوەیەکی سەراپاگیری و سیستێماتیك لە یەکەم ڕووبەڕووبوونەوەی ناوەوەی ڕەوشی ئەکتەر لەگەڵ ڕۆڵەکەی دەکۆڵێتەوە. بۆ ئەوەی لە دیوی ناوەوەی ئەکتەریش بکۆڵێتەوە و بیبەستێتەوە بە ڕۆڵەکەیەوە، لە سەرەتادا تەنها بەر چەند بەشێکی بچووکی دەرەوەی مۆتیڤەکانی دەقەکە دەکەوێت و بە قووڵی لێیان دەکۆڵێتەوە. پاشان لێکۆڵینەوەکە هەموو بەشەکانی دەقەکە دەگرێتەوە و مۆتیڤەکان، وەك پریشکی ڕووناکی لە تاریکیدا گەورە دەبن و بڵاو دەبنەوە و هەموو بەشەکان



پێکەوە دەبەستێتەوە، تا هەموو دەقەکە و ڕۆڵەکەیش دەگرێتەوە. ئەم قووڵبوونەوەیەیش بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ و لە نەستی ئەکتەرەکاندا بە دوای بنەما فراوان و هەستە قووڵەکاندا دەگەڕێت، کە چاو ناتوانێت بیانبینێت، گوێ ناتوانێت بیانبیستێت و هزریش ناتوانێت تێیانبگات، بەڵکو زیاتر وەکو هەستێکی کراوەی هونەریی دەردەکەوێت.
ستانیسلاڤسکی لە ساڵی ١٩٣٠دا پلانێکی وردی ریژی بۆ شانۆنامەی (ئۆتێللۆ) دادەڕێژێت و لەبەر نەخۆشیی خۆی، دەینێرێت بۆ شانۆی هونەریی مۆسکۆ تا کاری تیا بکەن، بەڵام ئەو پرۆژەیە هەرگیز ناچێتە بواری جێبەجێکردنەوە. دواتر هەموو پلانە ریژییەکە، کە بۆ وانەگوتنەوە و کاری پێداگۆگی لەگەڵ ئەکتەر و قوتابییەکانیدا بەکاری دەهێنیت، دەبێتە یەکێك لە شاکارە گەورەکانی هونەری ریژی و خوێندنەوەیەکی پراکتیکی بۆ شەکسپیر و لە دووتوێی کتێبێکیشدا چاپ دەکرێت. ئەم کتێبەیش (کارکردنی ئەکتەر لەسەر ڕۆڵ) بەشێك لەم پلانە، وەك دیدێکی ریژی و تێروانینێکی کردەیی و بەرئەنجامەکانی هەوڵە تیۆری و پراکتیکییەکان، بڵاو کراوەتەوە. لەم بەشەدا، وەك هەموو هەوڵەکانی تری پێشووتری ستانیسلاڤسکی، گرینگییەکی زۆر داوە بە یەکەم ڕووبەڕووبوونەوەکانی ئەکتەر لەگەڵ ڕۆڵەکەیدا. هەر لەم دەروازەیەوە، یەکێك لە گرینگترین خاڵەکانی بۆ قوتابییەکانی ڕوون دەکاتەوە، کە چۆن بە شێوەیەکی ڕاست و دروست دەقە شانۆییەکە بخوێننەوە؛ ستانیسلاڤسکی بڕوایەکی پتەو و تەواوی بەوە هەبووە، کە یەکەم خوێندنەوەی دەقەکە و بە شێوەیەکی ڕاست و تێگەیشتنێکی دروستەوە، یارمەتیی ئەکتەر دەدات، کە "هەر لە سەرەتاوە لە ڕۆحی ڕۆڵەکەدا، بەشێك لە خۆی و ڕۆحی خۆی و ڕۆحی ڕۆڵەکە بدۆزێتەوە." ستانیسلاڤسکی بەردەوام لە شیکردنەوە و تاقیکرنەوە و سەرلەنوێ خوێندنەوەی کارەکانی خۆیدا دەبێت، هەمیشە دەگاتە بەرئەنجامی نوێ و گۆڕانکاری لە مەشق و ئامادەکردنی ئەکتەرەکانیدا دەکات. هەندێك لەو بەرئەنجامانەی لەوەوبەر شتێکی بەڵگەنەویست بوون، دواتر سەرلەبەری گۆڕانکارییان بەسەردا دێت و لە هەندێك لە دیما و ڕاهێنان

و بەرئەنجامەکان پەشیمان دەبێتەوە و بەمەیش سیستێمەکەی ڕێچکەیەکی تر وەردەگرێت، بۆ نموونە لە خوێندنەوە و شیکردنەوەی چەندین ڕۆژەی دەق لەسەر مێز و کورسی و لەگەڵ ئەکتەر و قوتابییەکانیدا، بەر لە دەستکردن بە پرۆڤەکردن پەشیمان دەبێتەوە. لە کۆتایی سییەکانی سەدەی ڕابردوودا، کە خەریکی پرۆڤەی شانۆنامەی پشکنەر (جەنابی موفەتیش)ی گۆگۆل دەبن، دەڵێت: "ئێمە وەك جاران ناکەین، کە لەسەر مێزەکان بە کتێبەکەی دەستمانەوە دادەنیشتین تا بە قەڵەم شانۆنامەکە پارچەپارچە بکەین و دابەشی بکەین بەسەر چەندین بەشدا، بەڵکو لەبری ئەوە دەچینە سەر شانۆ و بە جەستە و بە شێوەیەکی پراکتیکی دەکەوینە لێکۆڵینەوەکانمان." لە سەرەتای ساڵانی ١٩٠٠ەکانیشدا، دوای ئەوەی سیستێمەکەی بە چەندین گۆڕانکاریدا دەڕوات، دەڵێت (دەبێت ریژیسۆر هەموو ڕۆڵەکان و تێکڕای نمایشەکە بە هاوکاری و لەگەڵ ئەکتەرەکانیدا ڕۆ بنێت.) هەر لەم قۆناخەدا ستانیسلاڤسکی زیاتر ئەوە دووپات دەکاتەوە، کە ئەکتەر دەبێت لە خودی خۆیەوە، لە ڕۆح و جەستە و تێڕوانینی خۆیەوە کار لەگەڵ ڕۆڵەکەی بکات. "ئەگەر لە خۆتەوە دەست پێبکەیت و خۆت بکەیتە دەروازە، ئەوە تۆ لە ڕۆڵەکەتدا دەژیت، ئەگەر لە کەسێکی تر و لە شوێنێکی ترەوە کار لە ڕۆڵەکەتدا بکەیت، ئەوا لەگەڵیدا دەبێت بە گەمەیەکی دەرەکی."

ستانیسلاڤسکی بۆ ئامادەییەکی بەردەوام و ڕاستەقینە لەسەر شانۆ، داوای پەیوەندییەکی بەهێز لە نێوان ئەکتەرەکانیدا دەکات، لە دواڕۆژەکانی تەمەنیشیدا ئەم چەمکی پەیوەندیکردنە، کە بە ناوی (کردارە فیزیکییەکان)ەوە ئاماژەی بۆ دەکات، گۆڕانکاری و پێشکەوتنێکی بەرفراوان لەخۆ دەگرێت و پێگەیەکی پتەوی لە سیستێمەکەیدا دەبێت. ئەو پەیوەندییە تەنها ئەکتەرەکانی ناگرێتەوە، بەڵکو خوڵقاندنی پەیوەندییەکی بەهێزیشە لەگەڵ ستراکتور و ژینگەی دیمەن و ئەتمۆسفێری شانۆنامەکەیشدا. پەیوەندییەکی ڕاستەقینە هەموو بەش و مۆتیڤەکانی سیستێمەکە، لە پرۆسە چڕەکەی کاری ئەکتەر لەگەڵ ڕۆڵەکەیدا دەبەستێتەوە بەیەکەوە و ئەکتەرەکان لە ڕۆڵەکانیاندا دەبن بە بەشێکی ڕاستەقینە و جیانەکراوەی نمایشەکە. ئەوەی لە کردارە فیزیکییەکاندا (جەستەییەکان) مانایەکی زۆری هەیە و میتود و کاری ئەکتەر لە پرۆسە هونەرییەکەدا قووڵ دەکاتەوە، پەیوەندیکردنە؛ پەیوەندیی ئەکتەرەکان بە یەکتر و بە ژینگەی هەموو دیمەن و پانتایی شانۆکەوە.






پەیوەندییەکی ڕاستەقینە هەموو بەشەکانی سیستێمەکە لە نێو کارەکەدا دەبەستێتەوە بە یەکترییەوە و دەبێتە پەرژینێکی بەهێز بۆ گروپەکە و بۆ بنەما گشتگرەکانی یەك لە دوای یەکی نمایشەکە. تەنها پەیوەندییش دەستەبەری ئەو پێگەیشتنە ناکات، بەڵکو دەبێت شتێك لەو پەیوەندییەوە وەربگیرێت: "پێویستە مرۆڤ شتەکان لە نێو چاودا ببینێت، تێڕوانینەکانی ئەو تێکهەڵکێشی ڕۆحی خۆی بکات و بزانێت هەست بە چی دەکات."
هەموو ڕۆژێکی نوێ، شتێکی تازە لەگەڵ خۆی بۆ مرۆڤ دەهێنێت، ئەم شتە تازەیە، دەبێت لە هەموو وانەیەکی نواندن و پرۆڤەکردنێکدا بەرجەستە بێت و لە کۆتایشدا لە هەموو نمایشێکدا فۆرمی گوزارشتئاسا لەخۆ بگرێت. ستانیسلاڤسکی ئەوەیش دووپات دەکاتەوە، کە ئەکتەر دەبێت لە ڕۆڵەکەیدا، ڕەوشی ئەو ڕۆژەی ئەکتەرەکەی هاوڕێی بەکار بهێنێت و هەرگیز خۆی دووبارە نەکاتەوە. ژیان هەمیشە لە جووڵانێکی بەردەوام دایە و هەموو ڕۆژێك شتێکی نوێ لە مرۆڤدا دەدۆزێتەوە، هەر لەبەر ئەوە گرینگە ئەو شتە نوێیە ڕۆژانەیەی ژیانیش بخرێتە سەر شانۆ و لە کاری ئەکتەر لەگەڵ ڕۆڵەکەیدا بەکار بهێنرێت و لە هەموو ڕۆژێکی نمایشەکەدا بەرجەستە بکرێت. لە ژیانی واقیعی ڕۆژانەی ژیانماندا، شتە ڕاستەقینەییەکان لە واقیعدا بوونیان هەیە، بەڵام لەسەر شانۆ شتە ڕاستەقینەکان ئەوانەن، کە تۆ بە یارمەتیی (ئەگەری ئەفسووناوی) بڕوات پێیەتی.
ستانیسلاڤسکی لە ساڵەکانی ١٩٠٠ەکانیشەوە دەگاتە دوابەرئەنجامی بەشێکی زۆر لە بیروبۆچوونە تێوری و پراکتیکییەکانی، هاوکات ڕووبەڕووی جۆرێکی تر لە هونەری نواندن و ڕیژی دەبێتەوە، بەتایبەتی لە لای مایرهۆڵد، کە هەموو سیستێمەکەی ستانیسلاڤسکی دەخاتە ژێر پرسیارەوە. بەڵام ستانیسلاڤسکی وەك هونەرمەندێکی گەورە، مامۆستایەکی بەپەرۆش و کراوە، بەوپەڕی ڕاستگۆییەوە بەپیر هەوڵە نوێیەکانی مایرهۆڵدەوە دەچێت، کە شانۆکەیشی دادەخرێت و ناوی دەچێتە لیستی ڕەشەوە، ستانیسلاڤسکی دەرگای شانۆکەی خۆی بۆ دەکاتەوە

تا بتوانێت لەسەر ئەزموونەکانی بەردەوام بێت. ستانیسلاڤسکی هەر لەم بارودۆخە ڕەشە نادیار و نالەبارەدا، داوا لە مایرهۆڵد دەکات، کە وانەی بیۆمیکانیك بە قوتابییەکانی بڵێتەوە و بەم شێوەیەیش هەردووکیان پێکەوە وەڵامی پرسیارەکانی کاری خوڵقاندنی ئەکتەر بدۆزنەوە. ئەمە بۆ ستانیسلاڤسکی تەنها هەڵوێستێکی مۆراڵی و ڕووبەرووبوونەوەیەکی ئازایانەی دەسەڵات نابێت، بەڵکو تێڕوانینێکی قووڵی سیاسەتی شانۆیی و هەڵوێستی هونەری ئەو دەبێت.

ستانیسلاڤسکی هەرگیز کۆتایی بە لێکۆڵینەوەکانی سەبارەت بە هونەری شانۆ نەهێنا و بەردەوام لەو پرسانەی دەکۆڵییەوە، کە پەیوەست بوون بە بنەما سەرەکییەکانی خوڵقاندنی هونەری نواندنەوە. ئەزموونە پراکتیکی و بیرکردنەوە قووڵ و خوڵقاندنە بەردەوامەکەیشی زۆر لەوە خێراتر دەڕۆیشت تا ئەو بتوانێت و فریای ئەوە بکەوێت تۆماریان بکات.

ئەم هونەرمەندە لە نێو شانۆدا بە دوای مرۆڤدا دەگەڕا، بەو هیوایە بوو ئەکتەرەکانی لەسەر شانۆ و لە کاتی کارەکانیاندا، لە فۆرمەکانی شانۆدا مرۆڤبوونی خۆیان بپارێزن.



سەرچاوە:

**K.S. Stanislavskij. Arbetet med rollen, oversettning fron ryskan.**

**Martin Kurten, Sahlgrens Forlag Ab 1997**

اكرم بهرامی




# پەیامی زەردەشت

وەرگێڕانی لەفارسییەوە: وریا قانیع



ڕەووف بێگەرد

# دوو چیرۆک

# دوو چیرۆک نووسەی سەردەمی



# شار

**ڕەووف بێگەرد**

ئەو بەیانییەی ڕۆژی هەینی، کە خەڵکی لە خەوی قورسی شەوی ڕابردوویان بەئاگا هاتن و سەری دیواری کۆڵان و شەقامەکانیان بە نووسینی ئەو وتەیەوە بینی، زانییان کە دەستێك خۆی داوەتە بەر سکڵی ڕق و داخی بەرودوای شاری ڕشتووە، وتەکە هێندە بە خەتێکی درشت و جوان نوسرابوو، کە کۆلکەخوێنەرێکیش لە هەقی خۆیندنەوەی دەهات، شار کە چاوی بەو نووسینە کەوت، وەك بارێکی لاسەنگی لێهات و ڕیتمی شتەکانی گۆڕا. ئیتر هەر ئەو ڕۆژە- ئەگەرچی ڕۆژی هەینی لە سەرانسەری وڵاتدا ڕۆژی دەستگرتنەوەیە لە کار و پشووی هەفتەیە- بەڵام ئەنجومەنی

وەزیران بەپەلە کۆبونەوەیەکی نائاسایی کرد، دوای بڕیارێکی خێرا هەموو وەزیر و لێپرسراوانی گەورەی وڵات بەرەو کۆشکە گەورەکەی قەراخ شار چوون، وەك لە پێشبڕکێی ڕاکردنێکدا بن، خۆیان تێخزاند، دەرگایان لەسەر خۆیان داخست، سێبەری ترسەکەی سەرشانیان ئەوەندە گران بوو، تەواو بە دیواری ناو ژوورەکانەوە نووسان، ئیتر شار نە فڕکەفڕکی ماشێنی لێدەهات و نە ژاوەژاوی دەزگا و کارگەکان، نە تەقە و دەستڕێژی ناوەختی چەك و نە بگرەوبکوژەی پۆلیس و ئاسایش، هەواڵەکەش وەك ڕەشەبا هێنابێتی، لە ماوەیەکی زۆر کەمدا هەموو پێچوپەنای شاری گرتەوە ، خەڵکی شار لە سەرەتاوە کاس بوون و بڕوایان نەکرد، پاشان کردیانە چرپەچرپ و کۆبونەوەی بچووك، لە دڵەوە پێدەکەنین و یەکەم جاریان بوو هەست بەوە بکەن، کە سەریان سووکە و ترسێکی مۆتەکەئامێزیان لە کۆڵ بۆتەوە، تەنانەت منداڵێکی تەمەن دە دوانزە ساڵەی قوت و قسەزان لە دایکی پرسیبوو:

-دایە ئەوەکێ مردووە؟ دایکی وەڵامی دابوەوە کوڕم مەبەستت چییە؟ منداڵەکە وتبووی: ئەی ئەوە نییە شار لە ڕۆژانی تری ناچێت و زۆر بێدنگە!

دایکی وتبووی : کوڕم حکومەت مردووە.

منداڵ: حکومەت یانی چی؟

دایك: حکومەت یانی ئەو کەسانەی شەڕ هەڵدەگیرسێنن، خەڵکی لە یەکتری بەرئەدەن، نانی میللەت ئەبڕن و خۆشیان لە هەموو کەس بە گەورەتر ئەزانن.

منداڵ: ئا! ... خۆیان بە گەورەی خەڵك ئەزانن! ئەی حەز لە چی ئەکەن؟

دایکی دوای کەمێك بیرکردنەوە پێی ووتبوو: ئەی تۆ حەز لە چی ئەکەیت؟ منداڵەکەیش دوای کەمێك بیرکردنەوە وتبووی: حەز ئەکەم گەورە ببم و بفڕم و گۆشتی برژاویش بخۆم.

دایکی وتبووی: ئا! گۆشتی بەشیشەوەکراوت مەبەستە! زۆڵ! ئیتر چەپۆکێکی پیا کێشابوو.

منداڵەکە کەوتبووە دوای لێکدانەوە و قسە و چەپۆکەکەی دایکی و لە شوێنێکدا مت ببوو، جارجارەش وێنەی گەورەیی حکومەت و شیشەگۆشتێکی دەهاتە بەرچاو، لەتاوا ناوگەڵی خۆی دەخوراند و دەستیشی بەسەر ورگیا دەهێنا، لەبەر خۆشیەوە دەیگوت: جاکێ حەز لەو شیشە گۆشتە ناکات، کە کەفوکوڵی هەموو گیانت دادەمرکێنێتەوە.






هونەرمەندە شانۆکارەکانی ناو شار لە وتەی نوسراوی سەر دیوار و بڕیارە ترسنۆکەکەی حکومەت سەرسام بوون. وتیان ئەم وتەیە قسەی سەدان ساڵ لەمەوبەرە، (کریۆن) لە تراژیدیای کۆنی ئۆدیبدا وتوویەتی و پەیوەندی بە ئێستاوە نییە، ئیتر حکومەت بۆ لەرزی لێهاتووە و ڕای کردووە؟

ئەم قسانەی هونەرمەندان زوو بڵاوبووەوە، سیخوڕەکانی دەوڵەتیش کە بە جلی ژنانەوە خۆیان لە پەناوپاسارەکاندا گرتبوو، گەیاندیانە گوێی حکومەتی ترساوی ناو کۆشك، بەڵام لێپرسراو و فەرمانڕەواکان لەوە عاقڵتربوون کە بەم قسانە تەفرە بخۆن و بڕیارەکەیان بشکێنن، ڕاستە وتەکە هی سەدان ساڵ لەوەوبەرە، بەڵام بۆ هەموو کات و شوێنێك دەشێت و کاری جگەربڕانەی خۆی دەکات، خۆڕایی نییە کە تەنانەت لە سەنتەری شار و لەسەر دیواری بارەگای سەرەکی‌ی دەوڵەت و ساختمانی ئاسایشی گشتیشەوە نووسراوە، دیارە ئەمە مانای ڕقێکە ئاقڵ درکی پێبکات و قسەی زانایەکە، کە بە ئاسانی خۆی بە دەستەوە نادات، بۆیە لێپرسراوانی شار لەگەڵ هەر دەنگێکی بەرزی دەرەوەدا ڕائەچڵەکێن و پاشان دەچوونەوە یەك، زیاتر خۆیان بە دیوارەکەوە دەنوساند، حەزیان لێبوو کەلێنێك لە دیوارەکە بکەن و بچنە ناوی. کەچی کە ناواخنی وتەکەیان دەهێنایە بەرچاو، چێژێکی سەیر لەشی دادەگرتن، لەبەرچاویاندا شار دەبووە ژنێکی باڵابەرزی گۆشتنی سوروسپی، قژ لە کەمەری چاو سەوزی پڕ لە هەوەس، هەر لەو ماینە ناوچاو مارۆیانە دەچوو، کە لە بەهاری بەتەڵەبیاندا لمۆز دەخەنە سەر دیواری حەوشەی ماڵەکان و دەحیلێنن، یان لە دەشت و چیادا چەپۆکانیانە و ئەستێرە لە عەرد دەدەن، هاوار و پڕمەیان بۆ ئەسپێکی کەحیلەی بەدەماخە کە بێت و بۆن بە ناوگەڵیانەوە بکات و دایانمرکێنێت، لێپرسراو و فەرمانڕەواکان پڕبەدڵ حەزیان لەو ژنە بۆندارانە بوو، لە دوورەوە دەمیان پڕ دەبوو لە ئاو و لەشیان ئاڵۆشی تێدەکەوت، بۆ کەمێك چاویان دەنایە سەریەك بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە سەر ئەو دیمەنە ونبوانەی کە لافاوی ئارەزوویان تیا سەری دەکرد و وەك ئەسپە کەحێلەکانی بەهار شەڕیان بە داروبەرد دەفرۆشت، تامی یەکبەیەکی

دیمەنی لە ئامێزگرتنی ژنی شاریان دەچێشت و دەتوانەوە، کە چاویان دەکردەوە، سامێك دایدەگرتن، سامەکەش هەر لە وتەی سەر دیوارەکانەوە سەرچاوەی گرتبوو، ئەگینا لە حاڵەتی ئاساییدا ژن هەر ئەو گۆشتە بەشیشەکراوە برژاوەیە، کە منداڵێکی تازە داندەرکردوویش بە تاسەوە دەیجوێت و تا نەیکاتە تڵپە، دەستبەرداری نابێت، شکاندنی تەلیسمی شار هەروا ئاسان نییە.. لێپرسراوەکان ئەمەیان لە دڵی خۆیاندا دەوت: ڕاستە شار بۆ فەرمانڕەوا پێدەکەنێت، خۆی بۆ شل دەکات و دەچێتە ئامێزی، بەڵام ئەمە بۆ خەڵەتاندنی ئەوانەیە، کە مێژووی شاریان نەخوێندۆتەوە، ئەگینا هەر شارە دەتوانێت کەلاکی نەیارەکانی بەسەر یەکدا کەڵەکە بکات و عەزیاش بخنکێنێت. لێپرسراوەکان ئەمەیان هەر لە دڵی خۆیاندا ئەوت:

- ڕاستە ئەوەی لەسەر دیوارەکانی ناو شار نووسراوە، قسەی کریونە کە دەڵێت: (شار ژنی شەرعیی فەرمانڕەواکانیەتی).. بەڵام شار نهێنیەکیشە بە سەد ڕەنگ خۆی دەگۆڕێت و سەری پڕ لە ئاشووبی بە هەزار ماڵدا دەکات. وەك دەبێتە ژنی ملکەچ، دەشبێتە خەمێکی سەخت -ئەمە هەر قسەی دڵی لێپرسراوان بوو- کەواتە فەرمانڕەواکانی شار ناهەقیان نییە بەبێ ورتە خۆ لە کۆشك بخزێنن، دەست لە پلەوپایە هەڵبگرن و ترسێکی بە ئەندازەی کێوێك بکەوێتە ئەستۆیان. خەڵکی شار کە لە هەڵاتنی حکومەت تەواو دڵنیا بوون، سامی وڕبوونەکەیان تێك شکاند و ڕژانە سەر شەقامەکان، چرپە بوو بە هاوار و هەنگاوی سستی گومانیان ڕەوی، پاچ و خاکەناز و کوڵنگیان لەدەست گرت، سەرەتا پەیکەرەکانی پیاوانی دەوڵەتیان ڕوخاند، پاشان باخیان ئاگر تێ بەردا، قوتابخانە و خەستەخانە و بانکیان تاڵان کرد، بە هەزاران وێنەی قوتابیانی وردیلەی دوێنێ و پیاوانی سیاسەتمەداری ئەمڕۆیان دایە بەرشەق، درەختیان بڕیەوە، گڵۆپی سەر شەقام و کۆڵانەکانیان شکاند، وتیان: ئەوەی لە دوای ئەوان بەجێ ماوە، پێویستە بێ شوێنەوار بێت، بۆ ئەوەی لەبەرچاوی ئێمە و لە یادەوەری منداڵەکانماندا نەمێنێت، تەنانەت وا کەوتنە هەڵکەندنی قیری سەر جادەکان، کە تا سەر خاکی سوور دەستبەرداری نەبوون، نە پۆلیسێك گرۆی خۆدەرخستنی هەبوو، نە سەربازێك تاسەی شەقام بینینی دەشکا.

منداڵەکە جارێکی تر بە دایکی وتەوە:

- ئەوە دایکە شار بۆ وا خرۆشاوە؟

دایکی وتی: پێم نەوتی حکومەت مردووە.







منداڵ: باشە کە حکومەت دەمرێت کێ زیندوو دەبێتەوە؟

دایك: خەڵکی

منداڵ: خەڵکی پیاوی چاکن؟

دایك: ئەدی.

منداڵ: ئەی بۆ گڵۆپی بەر ماڵەکەیان شکاندین؟

دایك: ئەوەیان کاری منداڵانەیە.

منداڵ: بۆ منداڵ بێعەقڵە؟

دایك: ئەی چۆن!

منداڵ: ئەی منداڵ دەبێت بە حکومەت؟

دایك: تۆ حەز لە شیشەگۆشت دەکەیت؟

منداڵەکە بێدەنگ بوو، جارێکی تر شیشە گۆشتە سوورەکانی هاتنەوە بەرچاو.

***      ***      ***      ***

پیاوە عاقڵ و زاناکانی شار کە وتەی سەر دیوارەکان بە فیتی ئەوان نوسرابوو، لە بەردەم عەقڵی خۆیان و ڕەفتاری خەڵکیدا بوونە دەستێکی شکاوی لەئەستۆدا هەڵواسراو، ئەیانزانی ئەوەی کردوویانە، ڕاستە و جێگای ئافەرینە، هەر دەبێت حکومەت زیندانی بێت و خەڵك ئازاد، دەبێت جڵەوی دەسەلاَت لە دەستی ئەماندا بێت و گوێی لێپرسراوەکانیش وەك میزەڵانی دەستی منداڵ بە فووی ئەمان هەڵئاوسێ و فش بێتەوە، کەچی حکومەت جێی خۆی گرتووە و خەڵکیش ئەگەر وا بمێننەوە، دەبێ ئەمانیش یان سەری عەقڵی خۆیان ببڕن و بکەونە دوای کاروانی سەرگەردانی، یان سەری عەقڵیان هەڵبگرن و وڵات بەجێ بێڵن، هەمووش لەوەدا یەك قسە بوون، کە سەرهەڵگرتن کاری پیاوی ترسنۆکە و مەڕ ئامادەکردنە بۆ گورگ، بۆیە لەناو خۆیاندا وا کەوتنە ڕاوێژ.

- ئێمە نەمان وت شار بمرێت، وتمان ئەوانە بڕوخێنن، کە شاریان کردۆتە ژنی شەرعیی خۆیان.

- حکومەت جینایەتکارە، لەوە دەچێت ئەو خەڵکانەش توخمی جیناتی ئەویان

هەڵگرتبێت.

- ئەی چار؟

- پێویستمان بە قارەمانێکە.

- جا کەی باوی قارەمان ماوە؟

- ئەی خۆمان چین؟ ئێمە کە توانیمان ئەو هەموو فەرمانڕەوا زاڵمانە لە کون بخەین، دەتوانین چارێکیش بۆ ئەم کارەساتە بدۆزینەوە.

- ناتوانین، چونکە ئەو پیاوە نین، کە هەوەسی شار تێر بکەین.

- ڕاستە، هەوەسی شار هەوەسێکی دڕندانەیە، بە ئێمە سەرکوت ناکرێت.

-با سەرەتا وتەکەی کریون لەسەر دیوارەکان بسڕینەوە.

منداڵەکە لە دایکی پرسی:

- دایکە حکومەت مردووە؟

دایکی وتی:

- ئەڵێن مردووە.

- منداڵ: ئەی بۆ هێشتا هەر برسیمانە و شەوانیش دەرگا دائەخەین و ئارام ناخەوین؟

- بڵێم چی، پیاوە ئاقڵەکان وایاندەوت.

- منداڵ: ئەگەر حکومەت زیندوو بێتەوە، وەزیرە سمێڵزلەکە دێتەوە سەر تەلەفزیۆن قسە بکات؟

- دایک: ئەی چۆن؟

- منداڵ: ڕۆژێك ئەو وەزیرە بە پێ بە بەردەم قوتابخانەکەماندا تێپەڕی، دایە ورگی زۆر زلە!

- دایک: وایە زۆر زلە.

- منداڵ: ئەوە کە دەچێتە سەرئاو، بە چی خۆی پاك دەکاتەوە؟

- دایک: بە ئاو.

- منداڵ: ئەزانم بە ئاو، بەڵام چۆن دەستی دەگاتە دواوەی خۆی؟







- دایك: حکومەت دەستی درێژە کوڕم، ئەگەر دەستی خۆشی نەگەیشتێ، بە دەستی یەکێکی تر پاکی دەکاتەوە.
- منداڵ: دایکە حکومەت زۆر گۆشت ئەخوات؟
- دایك: زۆر، بە کاڵی و بە کوڵاوی و بە برژاوی.
- منداڵ: بۆ؟
- دایك: هێزی پێ پەیدا ئەکات، خروی لەشی ئەشکێت و بەئیسراحەت خەوی لێدەکەوێت.
- منداڵ: بۆ حکومەت لەشی ئەخورێت؟
- دایك: بەردەوام کوڕم.
- منداڵ: بۆ؟
- دایك: لە باوکت بپرسە.
- منداڵ: بۆ هەر پیاو ئەوە ئەزانێت؟
- دایك: زۆرتری لێئەزانێت.. ئا..
- منداڵ: حکومەت پیاوێکی زلە، وانییە؟
- دایك: زۆر.
- منداڵ: ژنی هێناوە؟

دایك: ئەی چۆن؟
- منداڵ: باشە ژنەکەی ناوی چییە؟
- دایك: ناوی شارە.
- منداڵ: جا شار کەی ناوی ژنە؟
- دایك: تۆ لەوە تێناگەیت.
- منداڵ: ئەی باوکم تێئەگات؟
- دایك: ئەی چۆن، خۆی شارە.
- منداڵ: یەعنی باوکم ژنی حکومەتە؟

- دایك: بەڵێ
- منداڵ: ئەی تۆ ژنی باوکم نیت؟
- دایك: با، ئەوە من هەر هیچ، باوکیشت وەکو من وایە.
منداڵەکە تەواو سەرسام بوو، هێزی قسەی تری نەما، دەستی بۆ ناوگەڵی برد و قامیشە بچوکەکەی خۆی خوراند، بە دایکی وت:
ـ شیشەگۆشت بۆ کاڵێ باشە دایکە؟
دایکی سەیری ناوچاوی کوڕەکەی کرد و وتی:
ـ بۆ حکومەت.
منداڵەکە لە ناوچاوی دایکی ڕاما و لەبەر خۆیەوە وتی:
ـ خۆزگەم بە حکومەت.

***

ئەو بەیانییەی لەگەڵ خۆر و بان گەرمبووندا پەڵە هەورەکان بەدەم کزەباکەوە کۆچیان دەکرد، خەڵکی شار لەشی خاویان بەرەو پەنا دیوارو چایخانە چۆڵ و بێ چاکان بەکێش دەکرد، ڕەنگیان زەرد و دڕدۆنگ بوون، تەنانەت تاقەتی ڕۆژباشلێکردنی یەکتریشیان نەبوو، لە چاویانا هەستی پەشیمانییەك دەدرەوشایەوە، وایش کەوتنە هەواڵ و گەیاندنی ڕووداوەکان:



-ئاژاوەیەکی گەورەیە و کەس نامەی ئەوی تر ناخوێنێتەوە.
-شار پاسەوانی خۆی بۆ ناکرێت.
-بۆگەنی ئاوەڕۆ شکاوەکان هەمووومانی کاس کردووە.
-کێ دەتوانێت بەبێ سەر بڕوات.
-ئەم زانا و عاقڵانەی شار هەقی لەناوبردنیان هەیە، ئێمەیان پیاوخراپ کرد و خۆشیان ڕەگی پیاوەتیان تیا نییە.
هەر کە وتە کوژاوەکانی سەر دیوارەکانیشیان بینی، ئیتر ئاگری هەڵچوون لە



جەستەیان بەربوو، کەوتنە گەڕان بە ناو دوکانە تاڵانکراوەکانی خۆشنووسیدا، ژووره وێرانکراوەکانی قوتابخانەدا، گەڕان، زۆر گەڕان، تا لای شێوەکارێکی نەخۆش چەند فلچە و ڕەنگێکی تۆزلەسەرنیشتوویان دۆزییەوە، هەر لەسەر هەمان شوێنی کوژاوەی وتەکەی کرێوندا دەستیان بە نووسین کردەوە، لە پێشدا دوودڵ بوون چی بنووسن، تا پیاوێکی مێزەرلەسەری عەباڵەشانی پۆشتەوپەرداخ و بەویقاریان لێ پەیدا بوو، وتی هەر لەو شوێنانەدا بنووسن، : (بەڵێ شار ژنی شەرعیی فەرمانڕەواکانێتی) ئیتر لەچاوتروکانێکا دوای نووسینەوەی وتەکەی کرێون لەسەر دیوار و شەقامەکان خەڵکی ڕژانەوە سەر جادە سەرەکییەکان و دەستیان کردەوە بە هوتافکێشان، ئەگەرچی زۆربەی جادەکان هەڵکەنرابوون و خەڵکەکە سەرسمیان ئەدا و ئەکەوتنە چاڵەکانەوە، بەڵام شەکەتی و ئارەقەی سەرسنگ و لاملیان لە هاوار و هوتافی نەدەکردن.
هەموو بەرەو ئەو کۆشکە ڕێچکەیان، بەست کە حکومەت خۆی تیا حەشار دابوو، لە بەردەم ئاگری خۆر و دەرگای داخراوی کۆشکا بەچۆکدا هاتن، پاڕانەوە، پاڕانەوەی کۆیلەیەك لە سەردارەکەیء گوناهبارێك لە خواکەی، وەك بەشداریی سرودێکی کڵێسە بن، دەنگی سروود و درودیان بەرزبووەوە، هەموو بە ئیقاعێکی گونجاو وتەکەیان دەوتەوە:
(بەڵێ شار ژنی شەرعیی فەرمانڕەواکانیەتی).
هاوار و پاڕانەوە گەیشتە گوێی لێپرسراو و سەرکردەکانی ناو کۆشك، ئەگەرچی لە سەرەتاوە دوودڵ بوون، بەڵام بێجگە لە سیخوڕەکانی خۆیان، چەند کەسێکی ناو خەڵکەکەش پێدزەیان کردە ناو کۆشك و بەدەم ئارەقەی پاکانەڕشتنی خۆیانەوە ڕاستیی هەواڵەکانیشیان گەیاند، لێپرسراوان گومانیان لە خۆ تەراند، خۆیان لە دیوارەکان دوور خستەوە، کە ئاسەواری شوێنپشتیان سپی سپی ببوو، دەرگای ناوەوەیان کردەوە، کە هوتافەکان زیاتر بوون و دەنگەکان لەبەر گوێیاندا بووە دەنگی ژنێك، هاتنە ناو حەوشەکە و دەرگای دەرەوەیان بۆ کرایەوە، خەڵکەکە لەرزین و لەسەر ئەژنۆ کەوتن، لە دوایانەوە کۆمەڵێکی زنجیر لە دەستوملکراو هەر بە پێوە

وەستابوون و تەماشای دیمەنەکەیان دەکرد، ئەو پیاوانە بوون، کە بە فیتی ئەوان بۆ یەکەمجار وتەی سەر دیوارەکان نووسران و خەڵکی ئازاد بوون، هەموو سەرومل و ناوشانیان ئارەقەی بەر خۆر و بەکێشکردنی زنجیرەکانیان بوو، هەر بە پێوە و لە بەردەمی خەڵکیدا ئەنجومەنی وەزیران کۆبوونەوەیەکی ئاسایی کرد، تیایدا بڕیار درا کۆشکەکە بکرێتە بەندیخانە بۆ ئەو زانا و نووسەرانەی کە دەستیان هەبووە لەو فیتنەیەدا، سەرەکانیان لە سێدارە بدرێت و ئەوانی تریش بە حوکمی هەتاهەتایی و کاری قورس فەرمانیان بەسەردا درا.

خەڵکەکە هاوار و دەستخۆشی و دەمخۆشیان لە حکومەت کرد، لە خۆشیاندا لەسەر پشت کەوتن، شار ئەو ماینە ناوچاو مارۆ بەتەڵەبە بوو، کە بە دوای ئەسپێکی کەحیلەدا دەگەڕا بۆن بە ناوگەڵیەوە بکات، هەفتەیەك بۆ شار سەدەیەك بوو، چۆن لاشەیەك دەتوانێت بەبێ سەر بژی (ئەمە قسەی دڵی خەڵکەکە بوو). فەرمانڕەواکان بە چەکمەی ئاوزەنگی دار و داردەستی نووکتیژەوە لە ناو خەڵکیدا هەنگاویان نا، منداڵەکەش لەگەڵ دایکیا و لە پەنایەکدا وەستا بوو تەماشای دیمەنەکەی دەکرد، لەبەر خەیاڵیا دیمەنێکی دڵگیر و سەرنجڕاکێش بوو، ئارەزوویەکی گەورە شەپۆلی فڕینی دابوو، وایدەزانی ئەویش فەرمانڕەواکەیە و خەڵکەکە لەسەر پشت بۆی کەوتوون، بە پەنجەکانیشی هەر یاری بە قامیشە چکۆڵەکەی ناوگەڵی دەکرد، لەو کاتەدا کە تەواو مەستی دیمەنەکە بووبوو، بە دایکی ووت:

-دایکە منیش حەز ئەکەم ببمە حکومەت.

-بۆ؟

منداڵەکە وتی:

-زۆر خۆشە.

دایکی وتی: چۆن ئەزانی؟

منداڵەکە وتی: دوێنێ لە خەوما هەموو پیاوە گەورەکانی حکومەت بەیەکەوە باڵیان گرتبووەوە و بەسەر شاردا دەڕۆیشتن، هەریەکەیان باڵندەیەکی گەورەی چنگتیژ بوو، لە هەر جێگایەکدا ئارەزوویان بکردایە، پۆل پۆل دەهاتنە خوارێ، هەر یەکەیان شیشێکی گۆشتبرژاندنی نووکتیژی پێبوو، شیشەکەیان وەك شمشێر هەڵدەسوڕاند و وەك گۆچانیش بە ڕێگادا پێی دەڕۆیشتن، حەزیان لە هەرکەسێك بکردایە یان ڕقیان لێهەستایە، پارچەی گۆشتیان لێدەکردەوە و لە شیشیان دەدا، دووکەڵی






گۆشتبرژاندنەکەیان هەر لە تەمی سپی و کەفی دەریا دەچوو، منیش وەك ئەوان باڵم لێڕوابوو، دوایان کەوتبووم، لە هەر شوێنێك لایان دایە، منیش دادەهاتمەوە و لە دوورەوە تەماشام دەکردن، بەڵام ڕووی ئەوەم نەبوو بچمە ناویان، من بچووك و ئەوان گەورە، کە پێیان زانیم ،سەرۆکەکەیان تێگەیاند، بانگی کردمە لای خۆیەوە و شیشێکی نووکتیژی دامێ، پێی وتم:
- ئەگەر چی منداڵی، بەڵام دوامان کەوە، دەبێت لە تاقیکردنەوەیەکیشدا سەربکەویت، ئەگینا نابیتە حکومەت، من دوایان کەوتم، نازانم چەندم پێچوو، بەڵام هەستم کرد لەگەڵیاندا زۆر گەورە بووم و ڕیشوسمێڵم لێڕوا.
منداڵەکە بێدەنگ بوو، دایکی تەماشای کرد، سەیری لێهات کە کوڕەکەی دەستی لە ناوگەڵی ناکاتەوە، دایکی ویستی ئاگاداری بکاتەوە، یان بیترسێنێ کەچی کە لە ناوچاوی ڕوانی، خۆی زۆر ترسا، لەبەرچاویا کوڕەکەی گەورە زۆر گەورە بوو، وەك چاوی فەرمانڕەواکان ئاگری ڕق و ئارەزوو لە ناوچاویا هە وەك ئەوانیش سامی گرتبوو، دایکی هیچی نەوت، لە بەردەم بێدەنگی و س کوڕەکەیدا خۆی بۆ نەگیرا، هەستا و ڕای کرد، کوڕەکەی کەوتە دوای، چەندە دای ئاوڕی ئەدایەوە ،کوڕەکەی هەر دەست لە ناوگەڵ و چاویشی گڕکانە پڕ لە ئ دایکەکە زۆر ماندوو بوو، لە پەنای خانوویەکی ڕووخاودا کەوت و نەیتوانی کوڕەکەی گەیشتە سەری و پێی وت: ئەی نازانیت منیش بە تاقیکردنەوەی حکومەت. دایکی ویستی هاوار بکات، وەك ئەفسوونی لێکرابێت، یان خۆشی ڕ بێت، دەنگی دەرنەهات و شل بوو، شلبوونی ماینێك بۆ جوانوو ئەسپێکی دو خۆی، کوڕە یەکەم نەوەی تازەی حکومەت بوو، کە نێچیرەکەی بە زەلیلی بب بە ویستی ئارەزووەکەی تام لە گۆشتی دایکی بچێژێت و کەفوکوڵە ئاگراو جەستە و ڕۆحی خۆشی بە تەواوی دابمرکێنێت.

تەمووزی
**1997**

# چیرۆکی (لەڕێگادا) بۆ؟

لە بواری نووسینی کورتەچیرۆکدا، چیخۆف بۆ من قوتابخانەیەکی تازە بوو، کە لای مۆباسان و ئالان پۆ و ئۆهێنری نەمدیبوو. ڕاستە ئەم پێشەنگانە بنەمای ئەم هونەرەیان چەسپاند، بەڵام کەسیان وەك چیخۆف نەیانکرد بە تەوەری کێشە کۆمەڵایەتییەکان و گیروگرفتە هەنووکەییەکانی مرۆڤی ئەو سەردەمە. لە چیرۆکی چیخۆفدا ژیان بە هەموو چەمکەکانییەوە دەبینیت. هەست بە خەون و ختورەکانی مرۆڤی سەدەی نۆزدەی ڕووسیا دەکەیت، کە لە هەمان کاتدا خەون و کێشەی هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵگەکانی ترە. ئەو ناخی ئەو مووچەخۆرە داماوە

دەخوێنێتەوە، کە تەنیا ترسی پژمینێك دەیکوژێت. لە دووفاقیی ئەو پۆلیسە دەدوێت، کە ناتوانێت کێشەیەکی یاسایی و ڕەوا بە لایەکدا بخات، چونکە لە لێپرسراوەکەی دەترسێت نەك لێی قبووڵ نەکات و لەسەر کارەکەی لایبەرێت. مەینەتی و کڵۆڵی ئەو ئەرەبانچییەمان بۆ باس دەکات، کە تاقە کوڕەکەی مردووە و کەسێکی دەست ناکەوێت گوێ لە سکاڵا و دەردی دڵی بگرێت، بۆیە بە ناچاری دەگەڕێتەوە بۆ خانەکە و تەواوی چیرۆکەکە بۆ ئەسپەکەی دەگێڕێتەوە. چیخۆف بە دوای ئەو نموونەوەیە، کە چینەکانی کۆمەڵگە پێك دێنن و تا سەر ئێسك ستەمدیدەن. لەوانە، توێژی مامۆستای گوند، کە هەموویان نەخۆشیی سیلیانە و بەدەم خوێنهەڵهێنانەوە وانە دەڵێنەوە تا دەمرن. ئەو پزیشکانەی خەڵکی چ ڕێزێکیان بۆ دانانێن و ئەو ژنانەی ڕۆڵی ڕاستەقینەی خۆیان نازانن. بە کورتی، لە ڕێی چیرۆکی چیخۆفەوە من شارەزای کۆمەڵگەی ڕووسیی ئەو سەردەمە و مێژوو و سروشت و تەنانەت پێکهاتە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانی بووم نەك لە ڕێی خوێندنەوەی مێژووەکەیەوە. لەبەر ئەوەیش کە ڕاستترین مێژووی وڵاتێك ئەدیبەکانی دەینووسن، توانیم لەوە بگەم کە دوورگەی سەخالین یانی چی، لە مۆسکۆدا چی دەگوزەرێت و ژیان لە پتروزبەرگدا چۆنە. بە کورتی، چیرۆکی چیخۆف واتا چیرۆکی -مرۆڤ- بە هەموو پێکهاتەکەیەوە. خۆی دەڵێت: (پیرۆزترین شت لای من مرۆڤە، ئەوەی مەبەستمە بۆی بێتە دی، هۆشیاری، تەندروستی، بەهرە، خۆشەویستی، ئازادی و ڕزگاربوونیەتی لە زوڵم و ستەم). حەز دەکەم ئەو ڕاستییەش بڵێم، کە من منداڵیەتیی خۆمم لە منداڵیەتی چیخۆفدا بینییەوە، ئەگینا پێشتر هەستم پێنەکردبوو:

"کوڕە بەندییەك کە لە دووکانی وردەفرۆشیی باوکیا کاری کردووە، هەمیشە بە ڕێگای کڵێسەوە بووە. سروودی ئایینیی وتووە و لە قوداسەکاندا ئامادە بووە، خزمەتی پەیکەرەکانی کردووە و زەنگی کڵێسەی لێداوە. بە پێی پەتی گەڕاوە. لە ناو دووڕوویی گەورەکاندا پێگەیشتووە. دەستی قەشەی ماچ کردووە و ئازاری گیاندارانی داوە. زۆرجار دارکاری کراوە، دووڕوویی بەرانبەر خوا و خەڵکی کردووە" وەك خۆیشی دەڵێت: "من هەرگیز منداڵیەتیم بە خۆمەوە نەدیووە".

من زۆر چیرۆکی چیخۆف کاریان لە هەستم کردووە، بەڵام هەرگیز لە نووسیندا لاساییم نەکردۆتەوە.

یەکێك لەو چیرۆکانەی (لە ڕێگادا)یە. هەر لەبەر ئەوەیش بوو کە لەگەڵ چەند چیرۆکێکی تردا ساڵی ١٩٨٠ وەرمگێڕا بۆ کوردی و ساڵی ١٩٨٤ لە کتێبێکدا بڵاو بووەوە بە ناوی (ئەنتۆن چیخۆف). ساڵی ١٩٨٧ کردم بە سیناریۆ و بۆ ماوەی نزیکەی مانگونیوێك تیپی پێشڕەوی شانۆی کوردی نمایشی کرد.

کاراکتەری سەرەکیی چیرۆکەکە (لیخاریف)ە. کە نموونەیەکی هەرە زیندووی مرۆڤی ڕووسیی ئەو سەردەمەیە. کەسێکە بەردەوام لە نێوان ڕاستی و گوماندا سەرەگێژەیەتی. نازانێت ڕێگای ڕاست بۆ بەسەربردنی ژیان لە کوێدایە. لە گومڕاییا یان لە بڕوابووندا. لە سلاڤیەستدا یان لە پووچەگەراییدا. لە ئۆکرانچیەتدا یان لە شوێنەوارناسیدا. ئیتر جارێك دەبێتە ڕێگر و لەگەڵ دز و جەردەدا دەژی. جارێك بە هەموو ڕووسیادا دەگەڕێ و لەپڕا بۆ ئەمریکا هەڵدێت. ژن دێنێت و ئەمەندە ئازاری دەدات تا دەیکوژێت. نازانێت منداڵەکانی چۆن پێدەگەن و گەورە دەبن و پێنج ساڵ لە زینداندا بەسەر دەبات. وەك خۆی دەڵێت: (حاڵم لە سەگێك دەچوو شەو لە کاروانەکەی دابڕابێت) من ئەم چیرۆکەم تەنیا بۆ خاتری ئەم کەسایەتییە خۆش ویست. کەسایەتییەك چ کۆمەڵگا و چ سیستمەکە ڕێگای خۆدۆزینەوەی پێنادات و تا ئێستایش کە هیچی بە دەستەوە نەماوە و دەیەوێت لە دوورترین شوێنی ناوچەکە لە کانەخەڵوزێکدا کرێکای بکات. هەر وێڵ و سەرگەردانە. من بێگومانم ئەم نموونانە لە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا زۆرن و چ تاوانێکیشیان نەکردووە لە سەری سزا بدرێن. چونکە دواجار تاقە پرسیارێك هەیە بیکەیت. ئەویش ئەوەیە ئاخۆ ئەمانە بە ویستی تەواوی خۆیان وا دەرچوون؟ ئایا خۆیان هیچ دەستێکیان لەم چارەنووسەدا هەیە یان بەرهەمی سیستمی کۆمەڵگایەکن. کە ئەمەی لە چارە نووسیون؟

لە ئەدەبی ڕووسیی سەدەی نۆزدەدا گەلێك لەم جۆرە کەسایەتییانە هەن. کە تا ڕادەیەك کەسایەتییەکی نێگەتیڤن. بەڵام وەك ئەنجام تۆ خۆت دەپرسیت بۆ؟ بۆ نموونە لای تۆرگنیف لە ڕۆمانی باوك و کوڕەکاندا و لای دۆستۆیڤسکی کەسایەتی (فیدکا) لە ڕۆمانی شەیتانەکان و (ڕاسکۆڵنیکۆف) لە ڕۆمانی تاوان و سزادا.



# له ڕێگادا

**ئەنتوان چیخۆف**
**له فارسییەوە: ڕەووف بێگەرد**

"پەڵەهەورێکی کەنار ئاڵتوونی، له ئامێزی تاشەبەردێکی گەورەدا شەوی بەسەر بردبوو"

"لیرمونتۆف"

له ژوورێکدا، که چایچی قازاخی "سیمون چیستو پلوئی" ناوی میوانخانەی لێنابوو -چونکە تەنیا ئەوێ تایبەتی ڕێبواران بوو- له کەنار مێزێکی لەداردروستکراوی گەورەی ڕەنگنەکراودا، پیاوێکی تەمەن چل ساڵی باڵابەرزی چوارشانه دانیشتبوو، ئانیشکی دادابووه سەر مێزەکه، سەری نابووه بان مەچەکی و خەوتبوو.
لەبەر تیشکی مۆمێکدا که له ناو قوتووی دەرمانا دەسووتا و ئەو ناوەی ڕووناك دەکردەوە، ڕوومەتی خۆر بردووی، برۆی



پڕ و ڕەشی کە بەسەر مژۆڵە لێکنراوەکانیدا هاتبوونە خوارێ، دەردەکەوتن. لووتی، ڕوومەتی، برۆی، یەکەیەکەی هێڵ و سیمای دەموچاوی، وەك مێز و زۆپای ناو میوانخانەکە درشت دەیاننواند، وەلێ بەسەر یەکەوە نەك تەنیا ڕێکوپێك، بەڵکو جوانیش بوون، ئەمەیش نموونەی تایبەتی سەروسیمای ڕووسییە، چەندە بە تەنیا درشت و ئەستوور بنوێنن، ئەوەندە بەسەر یەکەوە جوان و دڵگیرن.

کابرای خەوتوو چاکەتێکی جوان دووراو کە لێوارەکانی بە خوریی تازە چنرابوون، لەگەڵ هێلەکێکی قەیفەی لەبەردا بوو، شەرواڵە ڕەش و پانوپۆڕەکەی خستبووە ناو چەکمە درێژەکانییەوە.

کیژۆڵەیەکی هەشت ساڵانە، لەسەر سەکۆیەکی پاڵ دیواری ژوورەکە نووستبوو، کەوڵەڕێوییەکی لەژێردا بوو، کراسی بۆر و گۆرەوییەکانی درێژ و ڕەش بوون. پرچی خورمایی و دەموچاوی سپی دەینواند، ناو شانی تەنگ و لەشی لاواز بوو، لووتی وەك سێوی زل و ناقۆڵا لە لووتی کابرای دەکرد، کچۆڵە لە خەوێکی وا قورسا بوو، ئاگای لەوە نەبوو شانەکەی قژی کەوتبووە خوارێ و بە گۆنایا هەڵچەقیبوو.

میوانخانەکە بۆنی جەژنی لێدەهات، تازە دەرودیواری شۆرابوو، هیچ جلکەکۆنێك بەو تەنافە لارەوە نەبوو، کە بەمسەروئەوسەری ژوورەکەدا درێژ بووبووەوە. لە سووچی لای ڕاست و لە ڕووناکی چرای ڕۆن گەرچەکی بان مێزەکەوە شەوقێکی سوور لە پەیکەرەکەی ژورژی پیرۆزی دەدا. لەملاوئەولای پەیکەرەکەوە کۆمەڵێك وێنەی تر هەبوون بەپێی پلەوپایەیان ڕیز کرابوون، لە لاهووتیەکانەوە تا سروشتی و مادییەکانی تیابوو.

هەندێ شوێنی وێنەکان لەبەر کزەڕووناکیی مۆم و چراکەدا، پەڵەی ڕەشیان چووبووە سەر، کە (زۆپای دیواری) ئەبووە هاودەمی سروشت، گرپەگرپ باکەی لرف ئەدا و ئەو چڵە دارانەی ئەتوت تازە لە خەو ڕاست بوونەتەوە، کڵپەی ڕق و شێتگیریان بەرز ئەبووەوە، لەو کاتانەدا بەسەر دیوارەکانەوە پەڵەی سوور دەکەوتنە سەما، لە ژوورسەری پیاوە خەوتووەکەوە جارێك ئیسرافیل دەردەکەوت و تاوێك ناسرەدین شا، جارێکیش کوڕێکی منداڵی گۆشتن و

ناسك كە بە چاوە ئەبڵەقەكانییەوە دەمی بە گوێی كچۆڵەیەكی منداڵەوە ناوە و پچەپچی بۆ دەكات، كەچی لە ڕووی كچۆڵەكەدا ساردی و بێدەربەستییەكی گەلێك زۆر دیارە.

لە دەرەوە، لوورەی كڕێوە و زریان، ئەتوت دڕندەیەكی هار و سەرسەخت و دڵشكاوە و بە دەوری میوانخانەكەدا هەڵدەسووڕێت و پەلاماری ژووری دەدات، خۆی بە دەرگا و پەنجەرە و سەربانەدا دەكێشێت. جارێك بە هەڕەشە و ساتێك بە پاڕانەوە چنگ لە دەروديوار گیر دەكات، تاوێك بێدەنگ دەبوو، لەناكاو دەیكردەوە لوورە و وەك فێڵبازێكی سەركەوتوو، خۆی بە ناو زۆپاكەدا دەكردەوە، ئاگری بڕەداری ناوی زۆپاكەیش تا ئەهات، زیاتر زمانەی دەكێشا، وەك سەگی ڕقهەڵگرتووی پاسەوان پەلاماری دوژمن بدات، ئەبووە كێشمەكێش، پاشان گریان و ناڵە، هەراوزەنا و تووڕەبوون دەهاتنە گوێ، لە هەموو ئەمانەدا ڕقی ترسناكی یەكێكت هەست پێدەكرد، كە ژێر كەوتبێت پاش ئەوەی بە سەركەوتن ڕاهاتووە.

لەم مۆسیقای ترس و پڕ لە سامناكییەدا، واتدەزانی بۆ هەمیشە میوانخانەكە لاڵ و بێگیان وەستاوە. كەچی لەپڕا دەرگاكەی كەوتە چركەچرك، شاگرد چایچییەك كە كراسێكی خامی تازەی لەبەرا بوو، بە شەلەشەل هاتە ژوورەوە. بە چاوی خەواڵوویەوە مۆمەكەی هەڵگرت و كوژاندیەوە، چەند بڕەداریكی دی بە زۆپاكەوە نا و چووە دەرێ، لەو كاتەدا كەنیسەی "روگاچی" كە سێسەد هەنگاوێك لە میوانخانەكەوە دوور بوو، زەنگی نیوەشەی لێدا، وات هەست دەكرد با لەگەڵ كلووی بەفر و دەنگی زەنگەكەدا كەوتبووە یاریكردن، تا ماوەیەكی زۆر بە هەموو لایەكدا دەیسووڕاندن و ڕاپێچی دەكردن، هەندێك جار بە تەواوی دەنگی زەنگەكەی دەبڕی. جارێكی تر وەك شەپۆل بڵندی دەكرد و ئەنجا بەرەو ئاسۆی دووری دەكێشا و سەرنگومی دەكرد. یەكێك لە گرمەكانی پێچایە ناو ژوورەكە، ئەتوت ڕاستەوخۆ بەر ژێر پەنجەرەكە كەوتووە. كیژۆڵەی خەوتوو ترسا و سەری هەڵبڕی، بێئاگا ماوەیەك تەماشای ئەرخەوانی زۆپاكەی بەردەكەوت، پاشان بۆ لای پیاوە خەوتووكە ڕووی وەرگێڕا و وتی:

- "باوكە"

پیاوە نەجووڵا، كچە بە قینەوە قاچی لەژێریا گرمۆڵە كرد و خەوتەوە.

لە ناو چاخانەكەوە دەنگی باوێشكی یەكێك هات، دوای كەمێك



دەرگا کەوتە جیڕەجیڕ، دەنگەدەنگ پەیدا بوو، یەکێك هاتە ژووری، بەفری سەر جلەکانی تەکاند، جزمە تەڕەکانی بە پارچەدارێکدا کێشا. نووزەی ئافرەتێك بە ئاستەم بەرز بۆوە.

"چییە؟"

دەنگێکی قەبە وەڵامی دایەوە.

"خاتوو ئیلو وایسکی تەشریفیان بۆ ئێرە هێناوە".

دیسانەوە جیڕەجیڕەی دەرگا هاتەوە، دەنگی هێرشی با دەهاتە گوێ، یەکێك -ڕەنگە شاگردە شەلەکە بوبێت- لە دەرکی میوانخانە نزیك کەوتەوە، بەدەم هەوڵدانیەوە بۆ ڕێگاگرتن لە کۆکینەکەی، کێلونەکەی لادا، ژنێك بە دەنگێکی ناسکەوە وتی:

"خاتوون، فەرموو بۆ ژووری، خاتوون گیان، ئێرە پاکژە"

دەرگا کرایەوە، جووتیارێکی ڕیشن، کە جلی گالێسکەوانی لەبەردا بوو، دەرکەوت، جانتایەکی گەورەی بەشانەوە بوو، بەفر هەموو گیانی داپۆشیبوو، تارمایی ئافرەتێك لە دوایەوە هاتە ژووری، نیو ئەوەندەی پیاوەکە نەئەبوو، دەست و دەموچاوی بە دەرەوە نەبوون، کەم تا زۆر بە جلەکانیەوە لە تاباریکی پێچراوەی دەکرد، ئەویش هەموو لەشی بەفر بوو، سەرمایەکی وا لە گالێسکەوان و تابارە پێچراوەکەوە بەرەو کچۆڵە خەوتووەکە چوو، ئەتوت دەرگای سەردابێکت والا کردووە، گڕی چراکە پرتەپرتی پێکەوت، تابارەکە بە تووڕەییەوە وتی:

"چ گەمژەییەکە!... وا باشتر نەبوو بڕۆین! دوانزە سیانزە کیلۆمەتر زیاترمان نەماوە، ئەویش هەمووی لە ناوجەرگەی دارستاندایە، ترسی ڕێونکردنیشمان نەبوو..."

گالێسکەوان وتی:

"خانمەکە، ڕێگامان هەڵە نەدەکرد، بەڵام ئەسپەکان لەمە زیاتر ناتوانن بڕۆن، خوا ئاگادارە، لەبەر هیچی تر نەبوو".

"خوا خۆی ئەزانێت تۆ ئێمەت هێناوەتە کوێ،... باشە بێدەنگ بە... نووستون، بە ڕای من، ئێرە... تۆ بڕۆ ئیتر".

گالێسکەوان لەگەڵ دانانی جانتاکەدا، بەفری سەرشانی تەکاند، هەناسەیەکی سارد و قووڵی

هەڵکێشا و چووە دەرێ.
کیژۆڵە گچکەکە، دوو دەستی بچووکی بینی لە ناوەندی تابارەکەوە هاتنە دەرێ، بەرزبوونەوە حەوا، کەوتنە کردنەوەی شاڵ و لەچك و سەرپۆش، یەکەمجار شاڵێك کەوتە سەر زەوی، پاشان سەرپێچ و لەچکێکی سپی بەدەستچنراو.
کە سەروملی خانمی ڕێبوار ئازاد بوو، پاڵتۆ مشەماکەی داکەند، لەشی نیوەی جارانی لێهات، لە ژێرەوە پاڵتۆیەکی درێژ و تازەی ڕەنگ خۆڵەمێشی، بە قۆپچەی گەورە و گیرفانی دەم کراوەیەوە دەرکەوت، لە گیرفانێکیا دەستەیەك کاغەز و لەوی ترا دەستەیەك کلیلی بچووك و گەورەی دەرهێنا، ئەمەندە بێبایەخانە هەڵیدانە سەر مێزەکە، پیاوە خەوتووەکە ڕاپەڕی و چاوی کردەوە، تاوێك سەری ڕاوەشاند و هەستایە سەرپێ، چووە سووچێکی ژوورەکەوە و لێی دانیشت.
تازەهاتووەکە پاڵتاوەکەیشی داکەند، ئەوەندەی تر لەشی بچووك بووەوە، پێی لە چەکمە چەرمینەکە ڕزگار کرد و ئەویش لای خۆیەوە ڕۆنیشت. ئیتر لە تاباری نەدەکرد، کچێکی لەشبچووکی مووخورمایی، قەدی باریك، تەمەنی لە بیست ساڵی تێنەدەپەڕی، لە لاوازیدا لە توولەمار دەچوو، دەموچاوی سپی و درێژکۆلە، قژی چین چین، لووتی جوان و نووکتیژ بوو، سەری چەناگەی وەك لووتی تیژ بوو. بەم هەموو درێژیانەوە ڕووی وەك شتێکی نووکتیژ دەهاتە بەرچاو، کراسێکی ڕەشی بەدەن چەسپی لەبەرابوو، لامل و سەرقۆڵەکانی بە دانتێل نەخشابوون، ئانیشکی گۆشەدار و نینۆکی درێژ و سوور بوون، بەم دیمەنەوە مرۆڤ یادی ژنە ئینگلیزەکانی سەدەی ناوەڕاستی دەکردەوە.
ئەوەی زیاتر ئەم لێکچوونەی دەچەسپاند، خۆبەگرانگرتن و سەروسیمای بوو، کیژەخان بە ژوورەکەدا هەڵیڕوانی، بە گۆشەی چاو پیاو و کیژۆڵەکەی بینی. شانی هەڵتەکاند و لە بەردەم پەنجەرەیەکدا دانیشت، پەنجەرە تاریکەکان بەدەم بای نمداری ڕۆژاواوە هەڵدەلەرزین، کلووەبەفر، کە لەبەر سپییەتی خۆیان دەبریسکانەوە، بە شووشەکانەوە دەنووسان، وەلێ زۆر زوو با دەیفڕاندن و لە چاو ون دەبوون، ئاوازی مۆسیقا سامناکەکە تا ئەهات، بەرزتر ئەبوو.
پاش هێورییەکی درێژ، لەپڕ کیژۆڵە گچکەکە هەستایە سەرپێ، بە ڕقەوە هاواری کرد:



"خوا، خوا، من چەندە کڵۆڵم... زێدە لە هەموو کەس کڵۆڵتر".

پیاوەکە هەستا، وەك مرۆڤێك هەست بە تاوانباری بکات، بە هەنگاوی گورج، کە لەگەڵ بالآی بەرز و ڕیشی پانیا نەدەگونجا، بەرەو لای کچۆڵەکە چوو، بە دەنگێك کە داوای لێبووردنی پێوە دیار بوو، وتی:

"گچکەی خۆشەویستم، نەنووستوویت؟ چیت دەوێت؟".

"هیچم ناوێت، شانم دێشێت، تۆ باوکێکی خراپیت، خوا تۆڵەت لێدەکاتەوە، ئەی بینیت!".

"گیانەکەم، ئەزانم شانت دێشێت، بەڵام کچۆڵەی خۆشەویستم، من ئێستا چیم لە دەست دێت؟".

وەك نیوەسەرخۆشێك بیەوێت دڵی ژنە ڕەنجاوەکەی بداتەوە، پیاوە کەوتەوە دوان.

"ساشا گیان، لە ماندووبوونی ڕێگا شانت دێشێت، سبەی دەگەین، تۆیش دەحەسێیتەوە و ئازارت نامێنێت!".

"سبەی، سبەی... هەموو ڕۆژێك بڵێ سبەی... بە لایەنی کەمەوە ئەبێ بیست ڕۆژی دی بەڕێوە بین!".

"کیژۆڵەی نازدارم، پەیمانی باوکایەتیت دەدەمێ سبەی دەگەین، من هەرگیز درۆ ناکەم، ئەگەر باوبۆران ڕێگامان لێبگرێت، من چ تاوانێکم هەیە!"

"من لەمە زیاتر خۆم ناگرم، ئیتر ناتوانم! ناتوانم!"

ساشا پێی بە زەویدا کێشا و دەستی بە گریانێکی ناخۆش کرد، دەستی باوکە لە ناچاریا شۆڕ بوونەوە، بە دڵگیرییەوە تەماشای کچە گەنجەکەی دەکرد، ئەویش شانی هەڵتەکاند و بە نابەدڵی بۆ لای کچۆڵەکە چوو:

"گیانەکەم بۆ ئەگریت؟ ڕاستە شانئێشان خۆش نییە، بەڵام چار چییە؟"

پیاوە وەك پاکانە بۆ خۆی بکات، گورج وتی:

"خاتوون، ئەزانیت ئەمە دوو شەوە چاومان لێك نەناوە، نازانیت چ نەگبەتییەك ڕووی تێکردووین! هەقیەتی نەخۆش و کۆڵەوار بێت، وەرە حسابی ئەمە بکە، تووشی گالێسکەوانێکی سەرخۆش

بووین، جانتاکانمان تیا چوون، بە درێژایی ڕێگا گیرۆدەی بەفر و بۆران بووین، بۆیە دەگری، خانم منیش ئەوەندە بە دانیشتنەوە وەنەوزم داوە، نەخۆش کەوتووم، ئەڵێی سەرخۆشم، ساشا، بڕوات بێت، بێ لە گریانی تۆیش من هەر تەواو دڵم گیراوە".

کابرا سەری بە پشتا خست، وەك هێزی خۆڕاگرتنی نەبێت، لە شوێنی خۆیا دانیشت، کچە مووخورماییەکە وتی:

"نابێت بگریت، گریان بۆ منداڵی شیرەخۆرەیە گیانەکەم، ئەگەر نەخۆشیت، پێویستە جلەکانت دابکەنیت و بخەویت، با من جلەکانت بۆ دابکەنم".

پاش داکەندنی جلەکان، کیژۆڵەکە ئارام بوو، ژوورەکە بێدەنگیی بەسەرا کشا، کیژەخانیش کە لە بەردەم پەنجەرەکە دانیشتبوو، دیسان بە سەرگەرمی کەوتەوە پیاهەڵڕوانینی ژوورەکە، سەیری پەیکەر و زۆپاکەی کرد، دیار بوو ژوورەکەی سەیر دەهاتە پێشچاو، کچۆڵەیەکی لووتزل، کراسێکی کورتی کوڕانەی لەبەردایە، باوکی کچۆڵە لە سووچێکدا دانیشتووە، وەك سەرخۆش بەملاوئەولایدا دەڕوانێت و دەست بە سەروچاویا دێنێت. کابرایەکی سەیرە، خامۆشە و پرتەی چاوی دێت، شێوەی تاوانبارێکی هەیە. بەم دیمەنەوە هەرگیز بە بیرتا نەدەهات بەو زووانە دەمی بکرێتەوە، کەچی ئەو یەکەمجار هاتە قسە، دەستی لەسەر ئەژنۆی لادا، چەندجارێك کۆکی، زیرەکانە پێکەنی و وتی:

"باوەڕت بێت، پێکەنینی گەرەکە! من دەیبینم و بڕوا بە چاوی خۆم ناکەم، بۆ چارەنووسی نەعلەتی ئێمەی فڕێ داوەتە ئەم چایخانە نەگبەتەوە. مەبەستی چییە؟ ویستوویەتی چیمان دەستگیر بێت، جارجارە ژیان ڕووداوی وا ترسناکی تێدەکەوێت، مرۆڤ سەرسام دەکات... خاتوون، ئێوە بەرەو جێیەکی دوور دەچن؟".





"نەخێر، من لە ماڵی خۆمەوە کە چوار فرسەخ لێرەوە دوورە، بۆ مەزرەعەیەك دەچم، باوکم و کاکمی لێدەژین، ناوم ئیلووایسکییە، گوندەکەیشمان هەر بەم ناوەوەیە، دوو سێ فرسەخێك لێرەوە دوورە، ئاووهەوایەکی بێکەڵکە، لەمە خراپتر نابێت!" کوڕە منداڵکارەکە بە شەلەشەل هاتە ژوورێ، مۆمێکی تازەی خستە ناو قوتووەکە، کابرا پێی وت:

"کاکە گیان، خۆزگا سەماوەرت بۆ دەهێنایین."

کوڕە بە پێکەنینەوە وتی:

"کەس هەیە ئێستا چا بخواتەوە؟ چاخواردنەوە پێش سپێدەی بەیان





گوناهە".
"بیهێنە باوکە، خۆ تۆ لە ئاگری دۆزەخا ناسووتێیت"
هەردوو تازە ئاشنا بەدەم چاخواردنەوە کەوتنە قسەوباس، خاتوو ئیلووایسکی لەوە ئاگاداربوو کە ئەم پیاوە ناوی -گریگۆری لیخاریف-ە، برای مارشاڵێکی خانەدانە، کە خاوەنی ناوچەیەکی ئەو نزیکانەیە، لە پێشدا ناوچەکە موڵکی ئەم بووە، بە هۆی تێکشکان و قەرزارییەوە کەوتۆتە دەستی ئەو.
-لیخاریف-یش لەوە گەیشت، ئەم کچە ناوی -خاتوو ئیلوواسکی ماریا میخائیولنا-یە، باوکی خاوەن زەویوزارێکی فرەیە، تەنیا ئەم کچە بەڕێوەیان دەبات، چونکە باوك و براکەی گوێ بە ژیان نادەن و هەمیشە سەرگەرمی سەگ و ڕاون.
خاتوو ئیلوواسکی لەگەڵ پەنجە ڕاوەشاندندا (خووی بەوەوە گرتبوو لە نێوان قسەکانیا پەنجە بە ڕووی ئەوانەدا ڕاوەشێنێت، کە گوێی لێدەگرن، پاش هەر ڕستەیەکیش زمانە باریکەکەی بە لێویا دەهێنا) وا باسەکەی دەست پێکرد.
"باوك و براکەم لە مەزرەعەکەدا بە تەنیان، ئەمەندە تەمەڵن، ناتوانن هیچ بۆ خۆیان بکەن، باوکم هەر ڕۆژە لەسەر هەوەسێکە، براکەیشم شەو نییە خۆی لە پێ نەخات، نازانم لە کۆتایی ڕۆژی پێش جەژنی سەری ساڵدا، کێ خواردنیان بۆ دەکات؟ دایکم مردووە، نۆکەرەکان ئەگەر منیان بە سەرەوە نەبم، نازانن سفرەیەك دابخەن، ئێستا تێدەگەیت باوك و براکەم لە چ حاڵێکدان، بێشێو ماونەتەوە، منیش ئەمشەو ئەبێ لێرە بەسەر بەرم، سەیرە!"
خاتوو ئیلووایسکی شانی هەڵتەکاند، چەند قومێکی لە چایەکە دا و کەوتەوە دوان.
"هەندێك لە جەژنەکان بۆنی تایبەتی خۆیانیان هەیە، لە ڕۆژەکانی جەژنی پاك، جەژنی سیانە، جەژنی لەدایکبووندا هەوا بۆن و بەرامەی خۆی هەیە. تەنانەت مرۆڤی بێباوەڕیش خۆشی دەوێن، بۆ نموونە براکەی من، ئەو بڕوای بەوە نییە خوا هەبێت، کەچی لە ڕۆژەکانی جەژنی پاکدا پێش هەموو کەسێ دەکەوێتە شەونوێژ".
لیخاریف خۆشیی لە قسەکان دەهات، پێدەکەنی، نیگایەکی لە خاتوو ئیلووایسکی گرت، ئەویش

بە پێکەنینەوە بە دوای قسەکانیا ڕۆیشت:

"ئەڵێن خوا نییە، بەڵام پێم بڵێن بزانم بۆ، هەموو نووسەرانی ناودار، زانا و ڕووناکبیران، لە دوادوایی تەمەنیاندا ئیمان بە خوا پەیدا دەکەن؟"

"خاتوون، ئەوەی لە گەنجیدا بڕوای نەبێت، بە پیریش هەروا دەمێنێتەوە. خوای دەکرد ناودارترین نووسەری دنیا دەبوو".

کابرا، دوای کەمێك هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی:

"بە ڕای من، بڕوا سپاردەیەکی تایبەتییە، وەك زیرەکی لەگەڵ مرۆڤدا دێتە دنیاوە. تا ئەو شوێنەی لە خۆم و کەسانێك لە ژیاندا دیومن و ئەوەی بە دەوروبەرمدا تێپەڕیووە و ئەتوانم داوەری بکەم، ئەوەیە کە تا دواپلەی ئیمان لە ڕووسیدا هەیە. ئەتوانیت پیاڵەیەکی ترم بۆ تێبکەیت؟ ژیانی ڕووسی بریتییە لە زنجیرەیەك بڕوا و خواپەرستی. ڕووسییەکان هێشتا تامی بێبڕوایی و ئینکاریی خوایان نەچەشتووە. ئەگەر ڕووسییەکی وایش پەیا بێت کە بڕوای بە خوا نەبێت، بێگومان باوەڕی بە شتێکی تر هەیە".

لیخاریف پیاڵە چایەکی دیکەی لە دەست ئیلوایسکی وەرگرت و بە قومێك نیوەی خواردەوە. بەردەوام لەسەر قسەکانی ڕۆیشت:

"ئەوەی لە بارەی خۆمەوە ئەتوانم پێتانی بڵێم، ئەوەیە کە سروشت توانایەکی گەورەی بڕوابوونی لە گیانمدا دروست کردووە. من نیوێك لە ژیانم -ئەگەرچی لە شەودا باسکردنی چاك نییە- لە خوانەناس و بێبڕواکانەوەیە، بەڵام من لە ژیانما، سەعاتێکم بە بێبڕوایی بەسەر نەبردووە. هەموو توانایەك لە قۆناغی یەکەمی منداڵییەوە سەرهەڵدەدات. لای من ئامادەیی بڕوابوون لەو کاتەوە دەستی پێکرد، کە بە ژێر مێزەکاندا خولم دەخوارد. دایکم پێی خۆشبوو منداڵەکانی تێر بن، کە خواردنی بۆ دەهێنام، دەیوت: "بخۆ، ژیانی مرۆڤ بە شۆرباوە بەستراوە". من بڕوام پێدەکرد و ڕۆژ نەبوو دە جار شۆربا نەخۆم، وەك سەگی دەریا ئەمەندەم دەخوارد، تا نەخۆش دەکەوتم.

دایەنەکەم حیکایەتی دێو و درنجی بۆ دەگێڕامەوە. بڕوام بە مۆتەکە و جنۆکە و هەموو جادووگەرێك هەبوو. دەچووم گیراوەی



سولەیمانیم لە باوکم دەدزی و بەسەر پسکیتدا هەڵمدەساوی، ئەمبرد لە ژووری گەنجینە دامدەنا، تا جنۆکە و خێوەکان بیخۆن و بمرن. کە خوێندەواری فێر بووم و ئەوەی دەمخوێندەوە، لێی تێدەگەیشتم، ئیدی کارم باڵاتر بوو، ڕامکرد بۆ ئەمریکا، چوومە پاڵ چەتە و ڕێگرەکان، هەوڵم دا لە دێردا جێگام بکەنەوە، پارەم دەدایە منداڵان تا بۆ خۆشەویستی مەسیح لێم بدەن.
بڕوانە، بڕوای من هەمیشە بەهێز بووە، نەك قسەی پڕوپووچ بێت، کە بۆ ئەمریکا ڕام کرد، هیچ کاتێك بە تەنیا نەبووم، چەند گەوجێکی وەك خۆمم دەبرد، کە سەرما لە دەرەوەی شار هەڵیدەچۆقاندم، یان بە هۆی گەڕیدەییەوە تێهەڵدانم دەخوارد، شاد و دڵخۆش دەبووم، کاتێ دەچوومە لای ڕێگرەکان، بە سەروچاوی لەتلەتکراو و لەشی شکاوەوە دەگەڕامەوە، پێت بڵێم، منداڵییەکی پڕ لە کوێرەوەرییم هەبووە، کە چوومە قوتابخانە و سێڵاوی حەقیقەتم بەسەرا هات، وەك سووڕانی زەوی بە دەوری خۆردا، یان ڕەنگی سپی سپی نییە، بەڵکوو لە حەوت ڕەنگ پێك هاتووە، سەری بێچارە کەوتە گێژخواردن، هەموو شتێك لەبەرچاوما سەرەوژێربوو، لە "یوشەعەوە " کە خۆری ڕاوەستاند، تا دایکم کە بۆ ڕێزگرتنی ئیلیا بڕوای بە دۆزینەوەی هێزێك نەدەهێنا ڕێ لە هەورەبروسکە بگرێت، تا باوکیشم کە لە بیستنی ئەو حەقیقەتانەی فێری دەبووم، بە تاسەوە دەچوو. من تەنیا لەو شتانە ئیلهامم وەردەگرت، کە لام تازەبوون.
شێتانە بە ژوور و تەویلەدا دەگەڕام، ئەو حەقیقەتانەم دەگەیاند، کە پێیان گەیشتبووم، لە نەزانیی خەڵك هەراسان دەبووم، لە داخی ئەوانەی لە ڕەنگی سپیدا تەنیا سپیان دەبینی، خوێنی خۆمم دەخواردەوە، تازە ئەوانە هیچ نین، قسەی بێمانای منداڵین، خۆگرتنی من، یان بە جۆرێکی تری بڵێم، پیاوەتی و توانام لەو کاتەوە دەست پێدەکات، کە چوومە دانیشگا، تۆ خوێندنی دانیشگات تەواو کردووە؟"
"لە نووچرکاسك، پەیمانگای دن".
"کەواتە نەچوویتە دانشگا، نازانیت زانست یانی چی، هەرچی زانستی دنیایە، ئامانجی تایبەتیان هەیە، بێ ئەو ئامانجە ناتوانن بەرەو پێش بچن، ئەو ئامانجەیش گەڕانە بە دوای

حەقیقەتدا. هەموویان، تەنانەت دەرمانشناسی، ئامانجی سوودبەخشین و ئاسوودەیی ژیان نییە، بەڵکو تەنیا گەڕانە بە دوای حەقیقەتدا و هیچی تر، ئەمە جێگای تێڕامانە! هەر کەسێك بیەوێت فێری زانستێك بێت، دەنگی ئەو زانستە هەمیشە بۆ لای خۆی دەیکێشێت، بە ڕاستی هیچ شتێك بە ئەندازەی ئەو مەزنتر و کاریگەرتر نییە، دەنگی زانست بیر و مێشکت دەهەژێنێت، دەتبەستێتەوە، پاش پێنج شەش دەرسی بەرایی، هیواکانت بە بەرزییەوە دەدرەوشێنەوە، وا هەست دەکەیت حەقیقەت لە ناو مشتتایە، چۆن پیاوێك خۆی بۆ ژنە خۆشەویستەکەی تەرخان دەکات، منیش هەر بەو جۆرە خۆم بۆ زانست تەرخان کرد. بوومە دیلی زانست، نەمدەویست چاوم بە بچووکترین ڕووناکیی پشت زانست بکەوێت، بێ ئەوەی لە شوێنێکدا بجووڵێم، شەو و ڕۆژ تێدەکۆشام، بەسەر کتێبەوە شەکەت دەبووم، لە بینینی ئەوانەی زانست بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکار دەبەن، دەگریام. بەڵام ئەم سەودایەی من زۆری نەخایاند، هەر زانستێك بۆ خۆی ڕاستییەکە، سەرەتایەکی هەیە، وەلێ کۆتایی نییە، وەکوو کەرتە دەورییەکانی ماتماتیك وایە. گیانوەرشوناسی تا ئێستا سی و پێنج هەزار گیانداری ناسیووە، کیمیاش شەست تەنی سادە. هەر کاتێك بە مروری زەمان لە لای ڕاستی ئەم ژمارانەوە دەیان سفر زیادی کرد، تۆ هەر ناگەیتە کۆتایی، ئێستا چەند لە کیمیا و گیانەوەرشوناسی دووریت، ئەوسایش هەروا.

کاری زانستی ئەمڕۆ ڕاستەوخۆ بە زیادکردنی سفرەوەیە، کاتێك پەیم بەم یارییە برد، کە خۆم پاش سیوپێنج هەزارەکە یەکەمین جۆری تری گیاندارم دۆزییەوە، بێ ئەوەی لە خۆم ڕازی بم، بەڵام هەلی خەمخواردنیشم بۆ نەمایەوە، چونکە بڕوایەکی نوێ لە ئامێزی گرتم، پەیوەندیم بە گرۆی نەهلیستیەکانەوە کرد، بە هەموو پڕوپاگەندە و داواکاری و دابەشکردنی ڕەش و فێڵ و تەڵەکەیانەوە، چوومە ناو خەڵکەوە، لە کارگەکاندا دەستبەکار بووم، بوومە گریسمان، بوومە بورلاك، پاشان کە سەرانسەری وڵات گەڕام و توانیم بۆنی ژیانی خەڵکی بکەم و ببمە شەیدای ئەو ژیانە، ئەوەندەم ئەم میللەتە خۆش ویست، کە بووە مایەی دەردەسەریم، هەم ئەوم خۆش دەویست و هەم بڕوام بە خوا و زمان و داهێنانەکانی هێنا، بڕوام بە هەموو شتێکی هێنا. من لەو ڕۆژەدا بوومە "سلاڤیپەرست" بە نامەنووسین -ئاکساکوف-م هەراسان کرد، پاشان سەودای ئۆکرانچیەتی لێی دام، ماوەیەك بوومە شوێنەوارناس، دەمێکیش



نموونەی هونەری میللیم کۆ دەکردەوە. گیرۆدەی زۆر بیروڕا، پیاوانی ناودار، ڕووداو، شوێنی جۆربەجۆر بووم، هەردەمە هەوای شتێك لێی دەدام، تا پێنج ساڵ لەمەوبەر کە لە موڵکی خۆم دوور خرامەوە و هیچم پێنەبڕا. دواباوەڕی من ئارامگرتنە لەبەر هێزی شەڕدا .

ساشا چەندجارێك هەناسەی هەڵکێشا و لە جێگاکەی بزوا، لیخاریف هەستا و چووە سەری، بە دڵنەواییەوە پێی وت:

"کیژۆڵەی خۆشەویستم، چایەك ناخۆیتەوە؟"

کچۆڵە بە تووڕەییەوە وەڵامی دایەوە:

"خۆت بیخۆوە".

لیخاریف وەك تاوانێکی کردبێت، بە دڵگیرییەوە گەڕایەوە سەر مێزەکە. خاتوو ئیلووایسکی پێی وت:

"تێکڕا ژیانێکی شاد و خۆشت ڕابواردووە، یادگاریی چاکت لایە".

"بەڵێ ڕاستە، هەموو ئەمانە کاتێك شادیبەخشن، کە لەگەڵ هاوڕێیەکدا چا بخۆیتەوە و بە قسە بیگێڕیتەوە، حەز ئەکەم بپرسیت ئەم شادمانییەت چەند لەسەر کەوتووە، ئەم ژیانی جۆربەجۆرە چ بارێکی لەسەر شانم ناوە! خاتوون سەرنج بدە، من بڕوام هەبوو، بەڵام نەك وەك دکتۆرێکی فەلسەفەی ئەڵمانی، ئەو بڕوای بە (زیرلیخ مانریلیخ)ە، من هەرگیز بڕوام بە گۆشەگیری نەبووە، هەموو تاقیکردنەوەی باوەڕێکی تازە ئەیسویمەوە و گیانمی دەهێنایە سەر لێوم، تۆ خۆت لەمەدا داوەری بکە، منیش وەك براکانم دەوڵەمەند بووم، ئێستا نابووت کەوتووم، هەرچی پارەی زۆری خۆم و ژنەکەم بوو، لەم گەرداوەدا بەبا چوو، ئێستا تەمەنم چلودوو ساڵە، ڕۆژانی پیریم نزیکە، پەنایەکم نییە، حاڵم لە سەگێك دەچێت شەو لە کاروانەکەی دابڕابێت، لە هەموو ژیانما نەمزانیووە ئاسوودەیی چییە، هەمیشە لە چەرمەسەریدا بووم، تەنانەت ئاواتەکانیشم گیانیان ئازار داوم، خۆم بە کاری دژوار و ناڕێکەوە بەفیڕۆ دا، باری نەدارییم بە کۆڵ کێشا، پێنج جار خرامە بەندیخانەوە، لە ئارخانگلسکەوە تا تبلسك ڕایانکێشام و دووریان خستمەوە، یادکردنەوەی ئەمانە دەردە،

ئەژیام و کەچی لەم بگرەوبەردەیەدا هەستم بە گۆڕانی ژیان نەدەکرد، گێژ بووم، نازانم بڕوام پێدەکەیت کە هیچ بەهارێکم لە یاد نییە، نەمدەزانی ژنەکەم چەندی خۆش دەوێم، منداڵەکانم چۆن لەدایك دەبن، ئیتر چیتان بۆ بگێڕمەوە؟ بەدبەختیم بەسەر ئەوانەیشدا هێنا، کە خۆشیان دەویستم، پانزە ساڵە ژیانی دایکم بە هۆی منەوە لە دەست چووە، برا سەرچڵەکانم کە بۆ من ئازاریان بە گیان گەیشتبوو، بە هۆی منەوە سەرشۆڕ بوون و عەیبەیان بەسەرا هات، ماڵ و پارەیانم بەهەدەر دا، سەرئەنجام وایان لێهات وەك ژەهر لێم بێزار بن".

لیخاریف هەستا و پاشان دانیشتەوە، بێ ئەوەی لە خاتوو ئیلوواسکی بڕوانێت، کەوتەوە دوای قسەکانی.

"ئەگەر من تەنیا بەدبەخت بوومایە، هێشتا سوپاسی خوام دەکرد، لە کلۆڵیی خۆم ناخۆشتر یادی ئەو کارە ناهەموارانەیە، کە کردومن، بێویژدانی، نامەردی، زۆر و ستەم، دەستدرێژی، هەمووم کردوون، زۆرجار دڵم پڕ لە نەفرەت و ڕقی کەسانێك بوو، کە ئەبوو خۆشم بویستنایە، بە پێچەوانەیشەوە! هەزارجار فێڵم لە خەڵکی کردووە، ئەمڕۆ بڕوام بە خوا و هاوڕێکانم بووە و کڕنووشم بۆ بردوون، کەچی سبەینێ بێغیرەتانە ئینکارم کردوون و لێیان دوور کەوتوومەتەوە، بەدەم ڕێگاوە و بە بێدەنگی جوێنم داوە، تەنیا خوا دەزانێت چەندجار شەرمم بەخۆ هاتووە و زارزار گریاوم، گازم لە سەرینم گرتووە.

لە هەموو تەمەنما جارێك نەبووە لە هۆشیارییەوە درۆ یان کاری خراپم کردبێت، لەگەڵ ئەمەیشدا ویژدانم هێور نییە، خۆم بە تاوانبار دەزانم، ژنەکەم لە داخی کار و کردەوە ناڕەواکانم لەپێ کەوت و لەبەرچاوم گیانی دەرچوو، بەڵێ ژنەکەم، پیاو لەگەڵ ئافرەتدا دوو شێوە ڕەفتار دەنوێنێت، گوێت لێمە، هەندێکیان جومگەیان دەپێون تا بۆیان دەربخەن لە پیاو کەمترن، بە دوای خەوشیاندا دەگەڕێن، لە پێشچاویاندا خۆیان بە هۆشیار و زیرەك دادەنێن، لەم ڕێگایەوە کاری ئاژەڵییانەی خۆیانیان لەگەڵدا دەکەن، دەستەیەکی تری پیاوان هەوڵی ئەوەیانە ژنان بگەیەننە ئاستی خۆیان، یان با بڵێین: ئەو سیوپێنج هەزار مێرووەی خۆیان دەیناسن، بە زۆر ئەوانیش فێری بن، شارەزای ئەو نووسین و قسە بێکەڵك و گەمژانەیە بن کە خۆیان فێری بوون".

ڕووی لیخاریف گرژ بوو، لەگەڵ مستەکۆڵەیەکدا کە بەسەر مێزەکەیدا، کێشا بە دەنگی کرخەوە وتی:



"من پێتان دەڵێم پیاو هەمیشە گەورەی ژن بووە و هەروایش دەمێنێتەوە.
ژن مۆمی نەرم و ناسکە، پیاو چی بوێت، لێی دروست دەکات. هەی داد و بێداد، ژن بۆ ئەوینێکی نادروستی فلانە پیاو قژی خۆی دەبڕێت، ماڵ و منداڵی بەرەڵا دەکات، لە ئاوارەییا دەمرێت... بەڵام ئەو بیروباوەڕەی خۆی بۆ کردۆتە قوربانی، مرۆڤایەتی نییە، کۆیلەیەتییەکی بێسوودە. من جومگەم نەپێواوە، ئەمانە لە تاقیکردنەوەی سەخت و تاڵەوە دەڵێم. من هەر کاتێك توانیبێتم لەگەڵ سەرچڵترین و ئازادترین ئافرەتدا باسی باوەڕ و سروشتی خۆم بکەم، بێ چەندوچوون کەوتوونەتە دوام، چیم ویستبێت، بەجێیان هێناوە. من ئافرەتێکی راهیبەم کردە نەهلیستی، بە جۆرێك کە دوایی بیستم سەربازێکی دابووە بەر گوللە، بەم هەموو گۆڕانەی بەسەرما دەهات، ژنەکەم تاوێك دەستبەردارم نەدەبوو، کە من بیروڕام بەرانبەر شتێك دەگۆڕا، ئەویش وەك بانما زوو باوەڕی خۆی دەگۆڕی.
لیخاریف هەستا و بە سەروخواری ژوورەکەدا کەوتە هاتوچۆکردن، بە دڵی پڕەوە دەستەکانی هەڵدەگلۆفت.
"پەرستنێکی نەجیبانە و مەزن! تەنیا لەمەدا ژیانی پڕشکۆی ئافرەت دەردەکەوێت. ئای چ مانایەکی گەورەی هەیە! من بە درێژایی تەمەنم پەیوەندیم لەگەڵ ئافرەتدا هەبووە، لە کرۆکی ژیانی پڕمەترسی و ناهەمواردا، ئەوەی لە مێشکمدا ماوەتەوە، نە بیر، نە قسەی زل، نە فەلسەفەی ئافرەت نییە، بەڵکو ئەو ملکەچکردنە سەیرەیە، کە بۆ چارەنووس هەیانە، سۆزی گەورە و خۆشەویستیی بێوێنە..."
لیخاریف مشتە نووقاوەکانی زیاتر گوشی، چاوی لە بەرانبەری بڕی، وەك بیەوێت هەر وشەیەکی بچێژێت، دانی بەسەر یەکدا نا و بە پەرۆشەوە وتی:
"ئارامگرتنی جوامێرانە، پەیماننەشکاندن تا لێواری گۆڕ، دڵێکی پڕ شاعیری، بە ڕاستی ژیانی ئافرەت لە خۆبەختکردنیایەتی، لەو فرمێسکانەدایە، کە بەرد دەکاتە ئاو، لەو ئەوینە بێسنوورەدایە، کە لە هەموو شتێکی پێئەبوورێت، گەرمی و ڕووناکی ئەکاتە دیاری ژیان..."
خاتوو ئیلووایسکی لەسەرخۆ هەستا، هەنگاوی بۆ لای لیخاریف نا و چاوی تێبڕی، لە فرمێسکە

درەوشاوەکانی سەر مژۆڵی لیخاریف و دەنگی لەرزۆك و کاریگەری، ڕوومەتی سووردادگەڕاویدا تەنیا شتێك کە بۆ ئەم کچە ئاشکرا بووبێت، ئەوەیە کە ژنان لە ژیانی ئەم پیاوەدا تەنیا هاودەمێکی ڕێکەوت نەبوون، بەڵکو باسێکی سەوداسەرانەی تازە، یان وەك خۆی دەڵێت، بڕوایەکی نوێن. خاتوو ئیلووایسکی یەکەمجاری بوو لە ژیانیا ڕووبەڕووی پیاوێکی وا ژیان پڕ لە کارەسات و خاوەن بیروباوەڕ بێت، ڕەوشتی، پرشنگی چاوی، گفتوگۆی، بزاوتی سەراپای لەشی ئەمەندە ئەمانەی جوان لێدەهات، کچە بێ ئەوەی بە خۆی بزانێت، ڕووبەڕووی وشك وەستابوو، بە ئارەزووەوە تەماشای دەکرد.

لیخاریف دەستی درێژ کرد بۆلای، دەموچاوی پاڕانەوەی پێوە دیار بوو، پێی وت:

"بۆ نموونە دایکم بگرە، من ژیانیم ژەهراوی کرد، لەباتیی چاکە، ئابڕووی لیخاریفی مێردیم برد، زیاد لە دوژمنەکانی بوومە مایەی سەرئێشە بۆی، سەرەنجام کاری بە چی گەیشت؟ براکانم پارەیان ئەدایە تا بۆ خێر و خواپەرستی خەرجیان بکات، کەچی ئەو هەستی ئایینی ئەخستە ژێر پێی و پارەکانی کۆ دەکردەوە، پاشان بە نهێنی بۆ کوڕی لەڕێگادەرچووی -گریگۆری- دەنارد، ئەم شتە بچووکە، پێش هەموو تیۆر و قسەی زل و ناسینی سیوپێنج جۆر مێروو، مەزنی بە گیانی مرۆڤ دەبەخشێت: من ئەتوانم هەزار نموونەی دیکەتان بۆ بهێنمەوە. بەڵام واز لە هەمووی دێنم و خودی تۆ ئەکەمە نموونە، دەرەوە تاریکە و بەفر و زریانە، تۆ کەوتوویتە سەروسۆراغی باوك و برات، بۆ ئەوەی لەم ڕۆژی جەژنەدا دڵیان خۆش بکەیت، لەوانەیە ئێستا ئەوان نە بیر لە تۆ بکەنەوە و نە لە یادیاندا بیت، بڕوانە، تۆ کە یەکێکت ویست، تا قوتبی سەروو دوای دەکەویت... ئایا ناکەویتە دوای؟".

"بەڵێ، ئەگەر... کەسێکم خۆش بوێت".

لیخاریف ئەمەندەی لا خۆشبوو، لەتاوا هەردوو پێی بە زەویدا کێشا:

"ئەبینیت، بە ڕاستی بە ئاشنایەتیتان شادمانم، لێرەدا بەختم یار بوو: هەمیشە ڕێکەوتی مرۆی چاکم کردووە، ڕۆژ نییە تووشی پێشهاتێکی وا نەبم کە ئامادەم ژیانمی بۆ بەخت بکەم، ئەوەندە مرۆڤی چاك لەم جیهانەدا هەیە، مرۆڤی خراپ نییە، تەماشاکە، ئێمە بە ڕاستگۆی و دڵفراوانییەوە لەگەڵ یەکدا دواین، ئەڵێی سەدەیەکە یەکتر دەناسین، ڕێ دەکەوێت مرۆڤێك دەساڵی ڕەبەق تەریك و



بێدەنگە، وانییە؟ مرۆڤ خۆی لە ژن و دۆستەکانی دەشارێتەوە، کەچی ڕێکەوت لە شەمەندەفەرا دەیکاتە هاوڕێی ڕوناکبیرێك دەرگای ڕازی دڵی خۆی بۆ دەکاتەوە، بە شانازییەوە یەکەمجارە ئێوە بناسم، بەڵام بە جۆرێك دەردی دڵم لا باس کردن، لەمەوپێش هەرگیز نەمکردووە، ئەمە بۆ وایە؟"

لیخاریف بەدەم دەستهەڵگلۆفتن و زەردەخەنەی شادمانییەوە، لە ژوورەکەدا کەوتەوە هاتوچۆ و پاشان هاتەوە سەر باسی ئافرەت، لەو کاتەدا زەنگی جەژن بەرز بۆوە، دیسان ساشا کەوتەوە گریان:

"خوا! چەندی وت، نەیهێشت بخەوم!"

لیخاریف لە جێگای خۆیدا وەستا:

"ئاخ، بەسەرچاو، کچۆڵەی نازدارم، سووچی منە، بخەوە، بخەوە".

لەسەرخۆیش وتی: "بێجگە لەم، دوو کوڕی ترم هەیە، خاتوون، لەماڵی مامیان دەژین، تەنیا ئەمیان ناتوانێت ڕۆژێك بێ من بەسەر بەرێت، داماوە، لەژێرەوە بۆڵەبۆڵ دەکات، بەڵام وەك مێشێك بە هەنگوینەوە نووسابێت، دەست لە باوکی هەڵناگرێت، خانم من زۆربڵێیم کرد، چاکترە بحەسێیتەوە، ڕێگام دەدەیت جێگای نووستنت بۆ چاك بکەم؟"

بێئەوەی چاوەڕێی وەڵام بێت، پاڵتۆ تەڕەکەی خاتوو ئیلووایسکی لە زەوی هەڵگرت، تەکاندی، وای لەسەر سەکۆکە داخست، کە خورییەکەی کەوتە سەرەوە، لەچك و شاڵە کەوتووەکانی کۆ کردەوە، بە پاڵتۆکەیەوە پێچا و کردنییە سەرین، بە ڕێز و بێدەنگییەوە ئەم کارانەی بە ئەنجام گەیاند، ئەتوت نەك بۆ بەرگی ژنانە، بەڵکە دەست بۆ پارچەدەفرێکی پیرۆز دەکێشێت، وا دەردەکەوت شتێکی بەلاوە ستەمە و شەرمی لێدەکات، وەك ئەوەی بەم سەروسیما و قەڵافەتەوە لە بەردەم یەکێکی وای بێتوانادایە.

کە خاتوو ئیلووایسکی درێژ بوو، ئەویش فووی لە مۆمەکە کرد و لەسەر کورسییەکی پاڵ زۆپاکە دانیشت، جگەرەیەکی داگیرساند، دووکەڵەکەی بەرەو زۆپاکە ڕادا، لەسەرخۆ وتی:

"خانم، وەك پێم وتیت، سروشت لەم میللەتەدا گیانی وردبوونەوە و بیرکردنەوە و باوەڕی پتەوی دروست کردووە، بەڵام هەموو ئەمانە لە بەردەم ڕاڕایی و تەمەڵی، خەیاڵپەرستی و

مێشکپووچیا، ئەبنە هیچ، بەڵێ... خانم..."

خاتوو ئیلووایسکی بە سەرسامییەوە چاوی لە تاریکیدا کردەوە، بێجگە لە پەڵەی سووری سەر پەیکەر و ڕووناکی گڕی زۆپا، کە لە سەروسیمای لیخاریفی دەدا، هیچی نەبینی.

تاریکایی، ئاوازی زەنگ، گرمەی باوبۆران، کوڕی شەل، ساشای نووزەدرێژ، لیخاریفی کلۆڵ و قسەکانی هەموو تێکەڵ بەیەك دەبوون، هەستێکی مەزنیان دروست دەکرد، لەبەرچاویا جیهان دەبووە ئەفسانەی پڕ لە شتی سەرسامکەر، هێزی سیحر و جادوو، ئەوەی بیستبووی لە گوێیا دەزرنگایەوە. لەبەرچاویا ژیانی مرۆڤ دەبووە چیرۆکێکی جوانی شاعیرانە کە هەرگیز کۆتایی نەدەهات.

ئەو هەستە بەهێزە گەورە بوو، گەورەتر، گەیشتە دڵ و ویژدانی، خستییە خەوێکی خۆش و قووڵەوە، خاتوو ئیلووایسکی نووستبوو، لە خەویا چرای کز و لووتی زلی لیخاریفی دەبینی، کە ڕووناکییەکی سوور بە سەرییەوە سەمای دەکرد.

دیسان دەنگی گریانی هاتەوە گوێ، دەنگی پاڕانەوەی منداڵێك:

"باوکە گیان، با بگەڕێینەوە ماڵی مامم، لەوێ درەختی جەژنی لەدایکبوون هەیە، براکانیشم ئەستیوپا و کولیا لەوێن"

دەنگێکی گەورە بە دڵدانەوەوە پێی وت:

"کچۆڵەی خۆشەویستم ئێستا من چی بکەم؟ تۆ ڕاست دەکەیت، بزانە چی دەڵێم، تێبگە گیانەکەم"

دەنگی گریانی کابرا تێکەڵ بە گریانی کچۆڵە بوو، ئەم ناڵەی دەردی مرۆڤە، کە لەناو گرم و هوڕی زریانەوە بەرز دەبووەوە، ئەوەندە بە گوێی کچەکە خۆش و ئینسانی بوو، لەوە زیاتر خۆی بۆ نەگیرا و ئەویش دەستی بە گریان کرد. هەستی کرد سێبەرێکی گەورەی لێ نزیك کەوتەوە، ئەو شاڵەی لە سەروو ڕوویەوە بۆ سەر زەوی خزابوو، هەڵیگرت و دای بەسەر پێیدا.

دەنگەدەنگێکی سامناك ئیلووایسکی لە خەو ڕاپەڕاند، هەستا، بە سەرسووڕمانەوە لە دەوروبەری خۆی ڕوانی، لە پەنجەرەیەکەوە کە تا کەمەرەی لە بەفرا بوو، سپێدەی بەیان دەهاتە ناو ژوورەکەوە. لە نێوان ڕووناکییەکی ڕەنگ خۆڵەمێشییەوە، زۆپا، کچۆڵەی خەوتوو، ناسرەدین شا دەردەکەوتن، زۆپا و چراکە کوژابوونەوە.

لە دەرەوە هۆڵی چایخانە و سەکۆی نان لەسەر خواردن و چەند





مێزێك دیار بوون، کابرایەك کە لە قەرەجێکی گەمژەی دەکرد، بە دوو چاوی پڕ لە سەرسامییەوە لە ناوەڕاستی هۆڵەکەدا وەستابوو، ئەو بەفرەی لە خۆی تەکاندبوو، بە دەوری قاچیدا توابووەوە، ئەستێرەیەکی گەورەی سوور بە سەری داردەستەکەیەوە بوو، کۆمەڵێك منداڵ بێ جووڵە، وەك پەیکەری بەفرین دەوریان دابوو، ڕووناکی ئەستێرەکە، لە پشت کاغەزە سوورەکەوە دەردەکەوت، دەموچاوی تەڕیانی ئەرخەوانی دەکرد، بە کۆمەڵ، بەڵام بە ئاوازی بێسەرەوبەرە، شیعریان دەخوێندەوە. خاتوو ئیلووایسکی تەنیا لەم کۆپلەیەیان دەگەیشت.

"دەیسا، کوڕە بچکۆلەکە
چەقۆیەکی تیژ هەڵبگرە
با بڕۆین بۆ جوولەکەکوشتن
ئەو کوڕە بەدکارە بکوژین"

لیخاریف لە نزیك سەکۆکە وەستابوو، بە دڵسۆزییەوە لە سروودخوێنەکانی دەڕوانی، لەگەڵ ئاوازەکەیاندا پێی دەجووڵاند، کە چاوی بە خاتوو ئیلووایسکی کەوت، وەك گوڵ گەشایەوە و بۆ لای چوو، ئەویش زەردەخەنە گرتی:

"خانم جەژنتان پیرۆز بێت، چاوم لێت بوو چاك نووستبوویت" ئیلووایسکی تەماشای کرد و دیسان زەردەخەنەیەکی تر گرتی.

پاش قسەوباسی دوێ شەو ئیتر لیخاریف لەبەرچاوی کچە ئەوەندە باڵابەرز و چوارشانە بوو، وەك چۆن گەورەترین کەشتی کە ئەزانین لە ئۆقیانووس تێپەڕیوون، لەبەرچاومان بچووك دەنوێنن، کچە وتی:

"چاکە، ئەبێ من بڕۆم، جلەکانم لەبەر بکەم، پێم بڵێ ئێستا تۆ بۆ کوێ دەچیت؟"

"ئەچم بۆ ئیستگەی کلیونشکی لەوێوە بۆ (سەرگیەڤو)، لەوێوە بە هەشت فرسەخ دەگەمە کانەکانی خەڵووزی بەرد، کە ژەنراڵی گەلحۆ چاشکوسکی خاوەنیانە، براکانم لەوێ کاریان بۆ پەیدا کردووم، ئەچم خەڵووز دەردێنم".

"من ئەو کانانە شارەزام، ڕێگام بدە، چاشکوسکییەی ناوت هێنا، مامەمە - بە سەرسووڕمانەوە

تەماشای لیخاریفی کرد - بە چ ناوێك بۆ ئەوێ دەچیت؟"

"وەك چاودێری کان"

کچە شانی هەڵتەکاند:

"سەر لەمە دەرناکەم، ئەو کانانە لە بیابانێکی چۆڵ و وشك و برینگدان، ئەمەندە چەپەکە، مرۆڤ زارەترەك دەبێت، تۆ تاقەڕۆژێك ناتوانیت لەوێ بژیت، خەڵووزەکەی زۆر بێکەڵکە، کەس نایکڕێت، مام کابرایەکی فێڵباز و گەلێك زۆردارە، لاتیشە، تەنانەت هیچ بە تۆیش نادات"

لیخاریف بێبایەخانە وتی:

"قەیدی نییە، لەبەر خاتری کانەکان، چۆنن با وابن"

خاتوو ئیلووایسکی شانی هەڵتەکاند، بە بێزارییەوە کەوتە پیاسە بە ناو ژوورەکەدا، پەنجەکانی لە بەردەم دەموچاویا ڕاوەشاند و وتی:

"من تێناگەم، سەر لەمە دەرناکەم، عەقڵ ڕێی پێنابات، ئەوە بزانە ئەوێ لە شوێنی دوورخراوەکان بێکەڵکترە. بۆ مرۆڤی زیندوو گۆڕستانە"

لە لیخاریف نزیك کەوتەوە، دیسان پەنجەکانی لە بەرانبەر دەموچاویا ڕاوەشاند، بە تووڕەییەوە وتی:

"ئەمە چ کارێکە؟"

لێوی کەوتبووە لەرزین، ڕەنگ لە ڕووە سەرنجڕاکێشەرەکەی بڕابوو، "ئاخر بیهێنە بەرچاوت، بیابانێکی وشك و گەرم، تەنیایی!"... یەك کەس لەوێ نییە قسەی لەگەڵدا بکەیت، هەروەها... ژنێك لەگەڵیا بژیت! تەنیا کان و ژنە کارگەرەکان".

لەپڕا خاتوو ئیلووایسکی لەو هەڵچوونەی بەخۆیەوە گرتبوو، پەشیمان بووەوە، لە لیخاریف دوور کەوتەوە. چووە نزیك پەنجەرەکە، پەنجەی بە شووشەکاندا هێنا و وتی:

"نەء... نەء، ئەوێ جێی تۆ نییە!"

ئەو نەك تەنیا بە گیانی، بەڵکو لە لەشیا هەستی بەوە دەکرد کە لە پشت سەریەوە، پیاوێکی بەدبەخت، داماو، وێڵ وەستاوە. ئەڵێی هەست بەم بەدبەختیەی خۆی ناکات، دوێنێ شەو دەگریا و ئێستا



بە شادییەوە بە ڕوویەوە پێدەکەنێت، بەڵام گریانەکەی باشتر بوو.
کچە بە دڵی هەراسانەوە لە ژوورەکەدا کەوتە هاتوچۆ، پاشان وەستا و بیری کردەوە، لیخاریف لەبەر خۆیەوە شتێکی دەوت و کچە نەیدەبیست، پاشان پشتی تێکرد، بیستوپێنج ڕۆبڵی لە کیسەکەی دەرهێنا، ماوەیەك لە قولی مستیا گرمۆڵەی کرد، سوور داگەڕابوو، پاشان ڕووی لە لیخاریف کرد و پارەکەی خستەوە گیرفانی.
لە دەرەوە دەنگی گالێسکەوانەکە هات، خاتوو ئیلووایسکی کە بێدەنگ لە بیرکردنەوەدا بوو، کەوتە خۆکۆکردنەوە، لیخاریف پاڵتۆ کەوڵییەکەی بۆ دەگرت و لەبەری دەکرد، بە شادییەوە دەئاخاوت، بەڵام هەموو وشەیەکی بووبووە بارێکی گران بەسەر دڵی کچەوە، گوێگرتن لە قسەی مرۆڤی بێچارە و کەسانێك لە گیانەڵادان، دڵخۆشکەر نییە.
کە خۆگۆڕین لەشولاری مرۆڤێکی زیندووی وەك تابار لێکرد، خاتوو ئیلووایسکی بۆ دواجار چاوی بە میوانخانەکەدا گێڕا، کەمێك خامۆش بوو، پاشان چووە دەرێ، لیخاریف ڕەوانەی کرد.
لە دەرەوە، لە خواوە هێشتا زریان دەستبەردار نەبوو، هەوری بەفرە درشت و قورسەکانی بەسەر زەویدا دەچەرخان وناڵەیان دەهات، نەیاندەزانی لە کوێدا جێ دەگرن، ئەسپەکان، گالێسکە، درەخت، گایەك کە بە کۆڵەکەیەکەوە بەسترابووەوە، گشتیان سپی بووبوون، لەبەر چاوتا وەك خوری نەرم و ناسك دەیاننواند.
لیخاریف خاتوو ئیلووایسکی نیشاندە ناو گالێسکەکە، لەسەرخۆ وتی:
"خواتان لەگەڵ، هیوادارم بەدگومان نەبووبن لێمان..."
کچە بێدەنگ بوو، کە گالێسکە کەوتە ڕێ و تۆپەڵە بەفری بەملاولای خۆیدا فڕێ دا، کچە لە لیخاریفی ڕوانی، واتدەزانی ئەیەوێت شتێکی پێبڵێت، لیخاریف بە گورجی گەیشتە لای، بەڵام ئەو هیچی نەوت، تەنیا لە نێوان مژۆڵەکانییەوە کە کلووەبەفر پێیانەوە نیشتبووەوە، نیگای لیخاریفی کرد.
ئایا گیانی پڕ لە هەستی لیخاریف توانی هیچ لەو نیگایە بخوێنێتەوە یان تەفرەی خەیاڵی

خۆی خوارد؟ بەهەرحاڵ، لەناکاودا وای بە بیردا هات، ئەگەر دوو سێ قسەی سەرنجڕاکێش و دڵگیرتری بۆ بکردایە، لەوانە بوو کچی جوان چاو لە بەدبەختی و کڵۆڵی و بەرەوپیری چوونی بپۆشایە و بێ چەندوچوون بکەوتایەتە دوای. واتدەزانی بە زەویەکەدا چەقیووە. ماوەیەکی زۆر چاوی لە شوێن چەرخەی گالێسکەکە بڕی، کە بەسەر بەفرەکەوە مابووەوە. کلووی بەفر زۆر زوو بەسەر قژ و ڕیش و شانیدا نیشتەوە. شوێنەواری گالێسکەکە دیار نەما، ئەویش کە تا دەهات زیاتر بەفری لەسەر کەڵەکە دەبوو، لە تاشەبەردی سپی دەکرد. لە نێوان ئەو بەفرە زۆرەوە کە دەنیشتە سەر زەوی، هێشتا چاوەکانی بە دوای شتێکدا وێڵ بوون.

١٨٨٧



# تیشکاندن و تێکشکاندن

لە حەکایەتی قوڕ بە قەڵەمی خەونووسی
دلاوەر رەحیمی

ئەحمەدی مەلا

**دەسپێک**

خودی شاعیر لە لاپەڕەی نێوان ناونیشان و دەقە شیعرییەکاندا، ڕوونکردنەوەیەکمان دەداتێ، کە ئەمەی لای خوارەوەیە: " تیشکاندن یا خۆ تیشکەشیعر، غروری زمانە لە بەرانبەر هەرچی زیاتری کاڵبوونەوەی نهێنی و ئەفسوون. زۆرانبازییەکە زمان پاڵەوانەکەیەتی." ( لە حەکایەتی قوڕ...ل ٩٤)

ئەم دەقە شیعرییە لە بیستوپێنج کورتە شیعری سێدێڕی و چواردێڕی و پێنجدێڕی و شەشدێڕی پێك هاتووە. هەندێك لە دێڕەکان یەك وشە و هەندێکی دیکەشیان دوو وشە تا سێ وشەن و درێژترینیان چوار وشەن. واتە لە بیستوپێنج وێنەشیعری کورت پێك هاتوون. وەکو لە ڕوونکردنەوەکەش هاتووە، ئەم وێنانە تیشکەشیعرن. جۆرە شەڕێکە لە نێوان زمان و بوون. ئێمە بەشێکی زۆری ئەو وێنانە بەسەر دەکەینەوە.

سەرەتا ئەم وێنە کورتانە هەوڵی تێکشکاندنی ڕێزمانی زمانیان داوە. چ لە ڕووی ڕستەسازییەوە، چ لە بەکارهێنانی ئامرازەکانی پەیوەندییەوە، چ لە ئەنجامدانی پرۆسەی "ئێلپس" یا "ئیزمار" یا "قرتاندن". هونەری شیعریی بوارمان دەداتێ گەمە بە زمان بکەین، بوارمان دەداتێ بەرامبەر بە دەسەڵاتی زمانی دایك یاخی بین و بواریشمان دەداتێ، بە شێوەیەکی تایبەت و شەخسی جارێکی دیکە بەکاری بهێنینەوە. بەڵام ئەم گەمە و یاریکردنە تا چ سنوورێك بوارمان دەداتێ و ئەم تێکشکاندنە لە پێناو زیندووکردنەوە و تەقاندنەوەی زمانە، یا تەنها تۆڵەیەکە لە مێژووی دەکەینەوە؟ هەوڵ دەدەین لەم چەند لاپەڕەیەدا وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەینەوە، یا بە لایەنی کەم ڕەگەزی وەڵامەکان ئامادە بکەین.

وێنەکان:

هەڵتۆقیوە
مێژوویەکی درێژ
بە نێوچاوانی شاخەوە

لەم وێنەیەدا، شاعیر بە فرمان دەستی پێکردووە، لەجیاتیی ئەوەی فرمان وەکو ڕێزمان پێمان دەڵێ، دەبێ لە کۆتایی ڕستەوە بێ،





ئەو لە سەرەتا دایناوە. ئەم جێگۆڕکێپێکردنەی وشەیە لەپێناو ئەوەیە، کە واقیع بە هەموو دژوارییەکانییەوە بخاتە ڕوو. لێرە سێ ڕەگەز هەن: هەڵتۆقین، مێژوو، شاخ. بەڵام لێرە فرمانی "هەڵتۆقین" ناکۆك لە گەڵ مێژوو دەوەستێت، چونکە هەڵتۆقین بە واتای هەڵپەڵمان، هەڵپەڵماندن، هەڵتۆقینی زیپکەیەك، هەڵتۆقینی دومەڵان و کارگ گونجاوتر دێتە بەر گوێی و دیدی خوێنەر، وەك لە "هەڵتۆقینی مێژوو". مێژوویەکی درێژیش ئاماژە بۆ کات دەکات، بۆ ماوەیەکی درێژ دەکات، کەچی هەڵتۆقین لە شوێن و پنتێکی دیاریکراو ئەنجام دەدرێت، نەك لە پانتاییەکی کاتدا. بۆیە لێرە ناکۆکییەك لە نێوان فرمان و ئەوە ناوەی کە فرمانەکەی لەسەر ئەمجام دراوە، دەردەکەوێت. ئەگەر شاخ گوزارشت لە فەزای شۆڕش بکات وەکو ئەوەی لە شیعری هاوچەرخی کوردی بەرچاومان دەکەوێت، ئەو مێژوو لەم وێنە شیعرییەدا، وەکو پەرچەکردارێکی نارێك، ناجۆر، تەنانەت ناشرینیش سەیری کراوە. مێژوو چڕ دەبێتەوە و لە پنتێکی دیاریکراو، ئەویش ناوچەوانە، وەکو زیپکەیەك هەڵدەتوقێ. سەرەتا، هەموو شتێکمان لە یاد دەچێتەوە و سەرنجمان بۆ کردارێك ڕادەکێشێ، پاشان پێمان دەڵێ ئەم کردارە چ کردارێك بووە و لە کوێ ئەم کردەیە ئەنجام دراوە. نابێ ئەوەمان لە بیر بچێت کە مێژوو کاتێکی کاریگەرە، تەنانەت ئەگەر بە شێوەیەکی نهێنیش بێت، چالاکیی خۆی دەردەپەڕێنێ، بەڵام هەڵتۆقان شتێکی کاتییە. لێرەش ئەم دژایەتییە کۆ دەبێتەوە لەپێناو سڕینەوەی مێژوو.

قەرەباڵغی ئینسان
نۆتێکە
تەنهایی ژەنیارەکەیەتی

لەم وێنەیەش دیسانەوە گەمەیەك لە نێوان "قەرەباڵغی"و "تەنهایی" کراوە. ئینسان وەکو بکەر ڕێ چۆڵ دەکات بۆ ئەوەی "تەنهایی" وەکو ناوێکی موجەڕەد، کە لە ئاوەڵناوی "تەنها"وە هەڵهێنجراوە، بێتە نێو ئەم وێنەیەوە. واتە،ئینسان وەکو کائینێك نابێتە بکەر، بەڵکو هەستێك:" تەنهایی" ڕۆڵی

بکەر دەبینێ، ئەو، ئەو ڕۆڵە دەبینێ.

ئەوەی جێی سەرنجە، ئەم قەرەباڵغییە وەکو تەنها نۆتێکی لێدێت، نەك کۆنسێرتێك، یا سەمفۆنییایەك، یا هەر ئاوازێکی دیاریکراو، لێرەش دیسانەوە لە نێوان قەرەباڵغی کە ئاماژە بۆ جەنجاڵی دەکات، لە پنتێکدا کۆ دەبێتەوە و دەبێتە "نۆتەیەك."

تەنهایی چی دەژەنێت، تەنها نۆتەیەك کە دووبارە و سێبارەکردنەوەی دەبێتە مایەی جاڕسی و بێزاری. لەم وێنەیەش دیاردەکان لە پنتێك کۆ دەبنەوە و ئەوانیش وەکو وێنەکەی پێشوو هەڵدەتۆقن.

ئەوەی خۆم بە خۆمی

دەکەم

تۆش پێمناکەی

لەم وێنەیە دوو ئەکتەر هەن: من و تۆ. ئەمەش مەرجی هەموو دیالۆگێکە، چونکە "من" بەبێ "تۆ"، "ئێمە" بەبێ "تۆ"، یا بەبێ "ئێوە" دیالۆگ دروست نابێت. تەنانەت دیالۆگ تووش پچڕان دەبێ. ئەم پچڕانە لەوێوە سەرچاوە دەگرێت، کە خود دەبێتە بار بەسەر خودەوە، خود ئازاری خود بە شێوەیەك دەدا، کە ئەویدی بوونی دەکەوێتە لاسەنگییەوە لەم ئازاردانە. ئازاردان کاتێك لە "تۆ"وە دێتە بەرهەم، بێگومان لە ئازار گەورەترە، کە لە "ئەو"ی غایبی شیعری کلاسیکییەوە بەرپا بووبێت. چونکە ئازاری وجوودی لە ئازاری موجەڕەد و زیهنی زیاترە. ئازار کاتێك لە یەکێکی دیاریکراوەوە دێت، زۆر بەهێزترە لەو ئازارەی کە لە "ئەوێك"ەوە دێت، کە ڕەنگە گەمە شیعرییەکان دروستکەری بووبێت!

لێرە دووفاقیی خۆم و خۆم بەرۆکی شاعیر دەگرێ. خۆمێك بەسەر خۆمێکی دیکەدا زاڵ دەبێ، ئازاری دەدا، تووشی شەونخوونی دەکات، تووشی ئێشك و خەوزڕانی دەکا. ئەم دوو بوونەوەرە یەکێکیان بکەری شیعرە و ئەوی دی بوونەوەرە کۆمەڵایەتییەکەیە. شاعیر تەنهایەکی ئەبەدییە.




درەختەکان





زمانەکانی زەوین

ساراکان

ماناکانی دەریا

کۆکردنەوەی زەوی/دەریا و  درەخت ببێتە زمانی زەوی و سارا ببێتە ماناکانی دەریا، گەڕانێکە بە دوای یەکێتیی گەردوون. دژایەتییەکان لە ڕواڵەتیان بەتاڵ دەکرێت و مانای نوێیان بە بەردا دەکرێ. سارا و درەخت دوو دیوی یەك شتن. جەنگەڵەکانی دوێنێ سارای ئیمڕۆن.

دیاردە سروشتییەکان گوزارشت لە زەمین دەکەن و شیکڵە سەرەتاییەکانیان دەسڕێنەوە و ناوەڕۆك قسە دەکات. وەکو ئەوەی شەو تەنها ڕۆژ بتوانێ راڤەی بکات. چونکە ئەگەر گریمانی ئەوە بکەین کە تەنها هەر ڕۆژ هەبوایە و شەو نەبوایە، ئەوە ئەو کات هەرگیز ڕۆژ ئەو ڕۆژە نەدەبوو کە ڕۆژی ئیمڕۆ تیایدا دەژین.

ئەم ڕۆچوونە بە نێو شتەکاندا شیعرییەتی هونەری هاوچەرخیشە، کە تەنها بە شیکڵە ڕواڵەتییەکان دڵی ئاو ناخواتەوە، بەڵکو دەیەوێ زمانی شاراوەی شتەکان دەسگیر بکات. شیعرنووسین تەنها بە سەیری گوڵ و باخچە و ئەستێرە مەیسەر نابێت، بەڵکو لەو پەیوەندییە سەیر و شاراوەیە ڕادەمێنێ، کە هەر شاعیرە و بە شێوەیەکی تایبەت دەیخوێنێتەوە و تۆماری دەکات. ئەمە یەکێکە لەو هۆکارانەی کە خوێنەری شیعری نوێ لە دەقی نوێ دەڕەوێنێتەوە، چونکە هەمیشە دونیایەکی دیکە وێنا دەکات، کە لە پێشچاوی ئێمەدا نییە.

ڕێگە

حکایەتی زۆری نەگێڕاوەتەوە

خۆیان

لە نەگەڕانەوەت حەشارداوە

لەم وێنەیەدا قرتاندنێك بەدی دەکەرێت ؛ "خۆیان" ئاماژە بۆ چەند کەسێك دەکات کە نازانرێت

کێن. لێرە ئەوەی ونە، خودی ڕێگەیە و هەر ئەویشە حەکایەت دەگێڕێتەوە. ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی "خۆیان" کەسانێك خۆیان بشارنەوە. کەس وەك بکەر خۆی لە دەست دەدات و ڕۆڵێکی پاسیف دەگێڕێت لە کاتێکدا ڕێگا دەبێتە بکەر و ئەو حەکایەت دەگێڕێتەوە. ڕێگا و ڕەگ دوو دەستەواژەن، کە مێژووی ئینسانمان بۆ بەسەر دەکەنەوە. ڕێگا و حەکایەت تێکهەڵکێشی یەکترن، لە هەموو حەکایەتە کوردییەکاندا ڕێگایەك هەیە. ڕێگا لە زیهنییەتی گوندا ئاشنایەتییەکە بەرە و نادیار و نەناسراو دەچێت. هەموو ڕێگایەك ڕێگایەکی دیکەی لێ جودا دەبێتەوە و کەسایەتی نوێ و ڕووداوی نوێی لێوە پەیدا دەبێ. ڕەچەڵەکی ئینسانی هاوچەرخ وەکو ڕەچەڵەکی قەرەجەکانە، کە تەنها ڕێگاکان دەتوانن پێناسەی بکەن، بە پێچەوانەی ڕەچەڵەکی ئینسانی تەقلیدی و سوننەتی، کە ڕەگ و شوێنەکانن. درەخت، سەرچاوەی ئاو، خانوو، کێڵگە، وەرز کە بە ڕێگاکان کۆتایی دێت.

ڕۆیشتنت
دەستدرێژی دەکاتە سەر خەیاڵم
منیش نیگەران نیم

شاعیر هاوچەرخانە دەیەوێ زمان بەکار بهێنێ، ئەم بەکارهێنانە هاوچەرخانە تەنها لە تێکشکاندن و چەماندنەوەی سانتاکس و گەمەکردن بە وشە و دەستەواژە ئەنجام نادرێت، بەڵکو دەبێ جیهانبینییەك لە گۆڕێدا بێ. زمان و جیهانبینی وەکو جەستە و جلوبەرگ وان، وەکو وجوود و مانا، وەکو شت و سێبەرەکەی تێکهەڵکێشی یەکتر نەبن، دروست نابن. ڕەنگە لێرە پرسیاری "مۆدەرنیتێ" بورووژێندرێ، چونکە دەقی نوێ، تەنها بە گەمە شیکڵییەکان مەیسەر نابێ، بەڵکو گەمەکان دەبێ گشتگیر و یەکدیگر بن. وەکو قوڕەسوورەیەك بشێلدرێن و پەیکەر و شیکڵی نوێی لێ دروست کرێت. هەندێ خۆڵی سوور و هەندێ ئاو و شێلانێکی زۆر. ئەگەر بە شێوەیەکی مێتافۆر خۆڵ شیکڵ بێت و ئاویش موفرەدەکان بن.

شیعری دوای ڕاپەرین هەندێجار بە تەواویی ئەم ئاوێتە بوون و ئەلشیمییەی ئەنجام نەداوە، وەکو ئەوەی هەندێجار خۆڵەکە لە ئاوەکە زیاتر بووبێ و هەندێجاری دیکەش بە پێچەوانەوە و







ئەگەریش هاوسەنگییەك لەئارادا بووبێ، ئەوە ڕەنگە شێلانەکەی بە پێی پێویست نەبووبێ.

بۆیە، جیهانبینی زمانی نوێ دادەهێنێ و زمانی نوێش گوزارشت لەو جیهانبینییە دەکات.

لە وێنەکەی سەرەوە جارێکی دیکە دیالۆگ لە ڕێگای "من" و "تۆ" پەیدا بووەتەوە. دیالۆگی عاشقانەیە، بەڵام بە کەرەسەی نوێ. هەموو دەستەواژەکانی "فیراق" و "ویساڵ" لە شیعری حەجرەی کوردی شارەزاین، کە گەمەکردن بەم دوو چەمکە گەیشتۆتە دواسنوورەکانی.

لە غەزەلییاتی شیعری کوردی و لە شیعری سۆفیگەریی ئەم دوو دەستەواژەیە بە زۆری و هەندێجاریش بە زیادەڕەوییەوە لە لایەن لاساییکەرانی شیعری حوجرەوە بەکار هاتووە.

کاتێك دلاوەر تێرمی "دەستدرێژی" بەکار دەهێنێت، وەکو ئەنجامی دوورکەوتنەوەی یار، ئەو کات خەیاڵ دەبێتە قوربانی، ئەنجامی قوربانییەکەش "نیگەراننەبوونە" تەواو لێرەدا هاوکێشە تەقلیدییەکە تێك دەچێت و ئاسۆیەکی دیکەمان لە بەردەم دەکرێتەوە.

تەعبیرکردن لە
تۆ
تەعبیرکردنە لە
بوون

لای شاعیر لە ئاستی جیاواز و لە ئاراستەی جیاوازیشدا دیالۆگی شیعریی لە نێوان "منی شاعیر" و "تۆ" ساز دەبێ. لەم وێنەیەی سەرەوە ڕاناوی "تۆ" لێواولێو دەبێ، هەموو ماناکانی بوون دەقۆزێتەوە. "تۆ' لە بووندا دەتوێتەوە، تەنانەت هەموو شتێك دەبێتە "تۆ" و "تۆ"ش دەبێتە بوون. واتە شاعیر ئەویش لە نێو ئەو بوونە دەتوێتەوە. پاشماوەی شیعری سۆفیگەریی لێرە سەرهەڵدەداتەوە.

ئاسمان

چنگ چنگ

دەپێوم

تۆ

لە هیچ چنگێك گیر نابیت

ڕاستە چنگ لە یەكێك گیر دەبێ وەكو لە چەندین دەستەواژەی كوردیدا چاومان پێی دەكەوێ، گوێمان لێی دەبێ. بەڵام "چنگلێگیربوون" ئیدیۆماتیكێكە، كە وشەبەوشە ئەو مانایە ناگرێتەوە، كە گوزارشتی لێدەكات، بەڵام میتافۆرێكە كە زیاتر دەسەڵات و سەروەریی یەكێك بەسەر یەكێكی دیكە ساغ دەكاتەوە. دایك بە منداڵەكەی دەڵێ :" ئای، ئەگەر دەستم لێت گیر دەبووا!" بە واتایەكی دی، لەم وێنە گوزارشت لە دەستبەسەرگرتنی و تەنانەت لە مانای خاوەندارێتیش نزیك دەبێتەوە. بەڵام "چنگ" پێوەرێك نییە بۆ ئەوەی پانتایی بپێوێ، بەڵكو دەوترێ "چنگێ گەنم" یا "چنگێ خۆڵ" دوو واتای جیاوازی چنگ.

شاعیر لەو وێنەیەدا چنگی لەجیاتیی "بست" داناوە. كورد دەڵێ ئەم خاكە بستبەبست دەپێوم، بەڵام ناڵێ "چنگبەچنگ دەپێوم". بست هێزی تێدا نییە، كردەیەكی پاسیڤە، كەچی چنگ لە كردەیەكی ئەكتیڤ و چالاك پێك دێت. بەم "چنگلێگیركردنە" شاعیر دەكەوێتە شەڕ لەگەڵ ئاسمان، وەكو پەرچەكردارێك كە شاعیر لە توانایدا نییە، خاوەندارێتی خۆی بەسەر ئەو "كەس"ەدا ساغ بكاتەوە كە موخاتەبەی دەكات. شەڕێكی دۆڕاو وێنەیەكی جوان.

هیچ

هەواڵێكی گرنگ هەڵینەكردووە

ئەوە تەنیا

هارەی دڵی منە

لەم وێنەیەشدا، شاعیر هەمان گەمە لە نێوان فرمان و بەركار دەكات ؛ بەڵام لە سێ ئاست ئەم گەمەیە دەكات. لە نێوان "هەواڵ" و "هەڵكردن" و "هارە"دا. خوێنەر دەتوانێ ئەم سێ ئاستە بەسەر بكاتەوە و لەم تێكشكاندنە تیشك بقۆزێتەوە. ئەوەی من لێرە






دەیکەم، تەنها خوێندنەوەیەکی خۆمە و گومانم لەوەدا نییە کە خوێنەری بە سەلیقە دەتوانێت دەلالاتی دیکە هەڵهێنجێنێ. بۆ نموونە وشەی "دڵ" لە کۆتایی، یا لە وشەی پێش کۆتایی داندراوە، بەڵام هەموو ڕچەکان دەچنەوە سەر ئەو. وەکو ئەوەی دەوترێت هەموو ڕێگاکان دەچنەوە بانە.

کە جاری جاران بووم
مەستی مەست پەروانە
لاسایی دەکردمەوە

لێرە پرۆسەی قرتاندن بە دی دەکرێ، چونکە "کە جاری جاران بووم" شتێکی نوقسانە. لە دوای "جاری جاران" بە پێی ڕێزمانی عەرەبی بە "موبتەدا" بخوێندرێتەوە، پێویستی بە "خەبەرێك" دەبێ. جارای جاران نانم دەخوارد، جاری جاران لاسایی پەروانەم دەکردەوە هتد. بەڵام لێرە دەبێ لە پشتەوەی ئەو قرتاندە گەمەیەك هەبێ. دەبێ ئەو گەمەیە چی بێت و لە پێناو چیدا بێت؟
ئەوەی لێرە قرتاوە خودی "مەستبوونە"، مەستبوونێك تەنانەت پەروانە لاسایی دەکردەوە. هەموو پەیوەندییە ڕۆژهەڵاتی و سۆفیگەرییەکەی نێوان "شەم" و "پەروانە" دەزانین. هەر مەستییە کە پەلکێشی پەروانە دەکات تاکو خۆی بە ئاگری عیشق بسووتێنێ و بە یەکجارەکی بچێتە دونیای نەمانەوە بۆ ئەوەی سەر لەنوێ لەدایك بێتەوە و لە هەرماندا بژێ.

ئەوەی با بردی
نانووسرێتەوە
ئەوەی دەبێتە یادەوەری
ناگێڕدرێتەوە
دەمێکە حیکمەت تێکەڵی شیعر بووە. حیکمەت چەندین جۆری هەیە: لە پاڵ حیکمەتی ئاینی، حیکمەتی قسەی نەستەقیشمان هەیە، هەروەها حیکمەتی بەها گەردوونییەکان کە تێکهەڵکێشکردنیان لە

گەڵ شیعری  هاوچەرخدا ڕەنگە بارستاییەکی نەشیاو، بارستاییەکی وا بدەنە دەق لە جیاتی ئەوەی سوکەڵەی بکات، بیدات بە عەرزا. بەڵام ئەم حیکمەتەی شاعیر لێرە دەیەوێ بیترنجێنێتە نێو دەقەکانییەوە، لە هەناوی ئەزموونەوە لەدایك بووە. ئەمەش قووڵایی ئەزموونگەرایی دەبەخشێتە دەق. زیندووکردنەوەی یادەوەریی هەمیشە دووفاقەیە، چونکە زاکیرە هەموو شتەکان تۆمار ناکات، یا میکانیسمی تۆمارکردنەوە هەندێجار لەژێر دەستی ئێمەدا نییە. دەوترێت "زاکیرە"ی دەستبژێر، واتە تەنها ئەو شتانە تۆمار دەکات، کە لە پێناو ئیدامەپێدان و مانەوەی کەسدایە. گومان لەوەدا نییە کە ئەوەی دەگێڕدرێتەوە بەشێکە، تەنها بەشێکی هەموو بەسەرهات و ڕووداوەکانە.

شاعیر
تەڵە
بۆ بوون
دەنێتەوە
لە دارستانی
زمان

شەڕی نێوان شاعیر و زمان دەمێکە لە ئارادایە. ئەم شەڕە هەڵگەڕانەوەیەکە دژ بە زمانی باو، زمانی کۆمەڵایەتی، تەنانەت زمانی دایك. عاسیترین دیاردە زمانە، گیرترین ڕەهەندی مرۆڤە. ئەمە یەکێکە لەو هۆکارانەی کە شاعیر لە زەمانی ئەفلاتوونەوە بە چاوێکی پڕ لە گومانەوە سەیری دەکرێ، دەمێك لەبەر ئەوەی خەیاڵاوی و ناواقیعانەیە، دەمێکی دیکە بە درۆزن و دەمێکیش بە نەرجسی لە قەڵەم دراوە. بێگومان گشت ئەم تاوانانە ڕاستن، چونکە شاعیر لە دەرەوەی شار و لە ناوەوەی شار ئیش دەکات، لە دوورەوە دەڕوانێتە کۆمەڵگە و لە ناویدا دەژی، ئیلتیزامەکانی ئەوە بە ئاسانی ناخوێندرێنەوە.

زمانی شیعر لە دێرزەمانەوە تێکەڵی سیحر و جادوو بووە، لەگەڵ لەرانەوەی گژوگیا و لەرینەوەی پەڵەهەور و گڤەی با و ڕەشەبای دۆڵەکان و بێدەنگیی تاشەبەردەکاندا هەڵیکردووە. ئەم ئەرکانە



تاکو ئێستا بە شێوەی جیاواز ماونەتەوە، بەڵام لە دید و بۆچوون و تێگەیشتنی نوێدا.
شیعری هاوچەرخ بانگەشە بۆ یەکێتیی گەردوون دەکات بە هێزێکی دەرەکی، تاقە هێز هێزی زمانە، کە شاعیر دەیتەقێنێتەوە و ڕەهەندە شاراوەکانی کەشف دەکات.
دلاوەر دەیەوێ بوون بخاتە ژێر تاقیکردنەوەی زمان بۆ ئەوەی لە پەنهان و ڕازە شاراوەکانی تێبگات.

شیعر
خۆڵەمێشی
کڵپەی
زمانە

بەردوام لەسەر ئەم چەمکەی سەرەوە (پەیوەندیی نێوان شیعر و زمان) ئەم وێنەی سەرەوە ئافرێندراوە. لە نیوان "خۆڵەمێش" و "کڵپە" جەمسەرە دژوارەکان کۆ دەکرێنەوە. ئەم پرۆسە ڕەوانبێژییە زۆر کۆنە، کە لە ڕەوانبێژیی عەرەبی بە "جمع الاضداد" دەناسرێتەوە. ڕەنگە شیعر گونجاوترین شوێن بێ بۆ کۆکردنەوەی دژوارەکان. ئەم کۆکردنەوەیە سوریالییەکان زۆریان بەکار هێنا و لەم لێکدانە چاوەڕوانی تیشکیان دەکرد. خۆڵەمێش ئاماژە بۆ دامرکاندنەوە و مردن و خامۆشبوون دەکات بە پێچەوانەی "کڵپە"، کە ئاماژە بۆ چالاکیی و وزە و هەڵچوون دەکات. ئەم دامرکاندنەوە خاڵی پێگەیشتنە، خاڵی کۆتایی کردەیەکە، لێرە کۆتایی شیعر وەکو ئۆرگازم سەیر دەکرێت و لە خاڵێکی ورووژانەوە بۆ حەوانەوە و ڕەحەتبوون وەردەچەرخێ.

چاو
ئەو هەمووو تاریکییە نابینێ
شیعر نەبێ

ڕەنگە ئەم وێنە شیعرییەی سەرەوە چڕکردنەوەی پرۆژە شیعرییەکەی شاعیر بێت! ڕەنگە خوێن پرسیاری ئەوە بکات، چۆن تاقە وێنەیەك ئاماژە یا خەستکرنەوەی پرۆژەیەکی شیعرییە؟ لە نێوان

شیعری کلاسیکی یا شیعری حوجرەی کوردی و شیعری  هاوچەرخ چوار وەرچەرخان بەدی دەکەین. ئەگەر هەندێ دەقە شیعر لێرەوە لەوێ وەلاوە خەین، شیعری کلاسیکی شیعری چاو نییە، بەڵکو شیعری زەینە، وێناکردنێکی زەینییە و شاعیر سەیری جیهانی دەرەوە ناکات، ئەوەی زیاتر بیر لە سەنعەتی شیعریی دەکاتەوە، وێنە دێرینەکان سەرلەنوێ هەر شاعیر و پشتبەستن بە سەلیقەی خۆی پەرەمووچ دەگرێتە دەست. گۆران وەرچەرخانی یەکەمە کە سیمای ئینتیباعی دەبەخشێتە شیعر، کە چاو وەکو بەهێزترین ئۆرگانی هەست دەکەوێتە گەڕ، بچووکترین و شاراوەترین بزووتن، وردترین دیمەن دەقۆزێتەوە و دەیخاتە سەر لاپەڕە. گۆران مەزنترین فۆتۆگرافەری شیعری کوردییە. لە جادەیەکی چۆڵ و هۆڵەوە بۆ پەڵەهەوری ئاسمانەکان، لە ڕچەیەکی هەورامانەوە بۆ قژزەردێکی جوان بە شیعر دەگوازێتەوە. زمان پاراویی گۆران لەم سەرچاوەیەوە هەڵدەقووڵێ. فۆتۆ تا پاك و بێگەردتر بێ، هەندە لە توانایدا دەبێ وردەکارییەکان بگوازێتەوە.

وەرچەرخانی دووەم، شیعرێکی گشتگیرە بە کێشە سیاسی و کۆمەڵایەتی و نەتەوەیی و تەنانەت ئایدیۆلۆژییەکانەوە. چاو تەنها ئەو ڕۆڵە دەبینێ بۆ ئەوەی شتێك بگوازێتەوە و دواجار بە فلتەرێکی دیاریکراودا تێپەڕی کات، لە فلتەردان یەکێکە لە خەسڵەتی ئەو وەرچەرخانە. وەرچەرخانی سێیەم لە هەشتاکانەوە دەیەوێ ڕچەی خۆی بکاتەوە، شیعری تاکە، ئازادە و بارستاییە ئایدیۆلۆژی و نەتەوایەتییەکانی وەلاوە خستووە. وەرچەخانی چوارەمیش لە دوای ڕاپەڕینەوە بە دەنگ و ڕەنگی جیاوازەوە تاکو ئێستا بەردەوامە.

"چاو" لە لای دلاوەر لە توانایدا نییە وردکارییەکان ببینێ، بەڵکو ئەمە کاری شیعرە، بە شیعر دەکرێ شتە پەنهان و ڕازەکان بنووسرێتەوە. زمانی شیعریی پێش بینین دەکەوێت، واتە ئەوەی بە شیعر دەگوازترێتەوە، بە چاوی ڕووت نابینرێت، بەڵکو پەیوەندییەکی نوێ لە بوارەدا سەرهەڵدەدا...

دڵم
بەرگەی
نەهاتنێکی دیکە
ناگرێ







"هاتن" و "نەهاتن" دوو چاوگن کە تەنها لە واتادا دژ بە یەك ناوەستن، بۆ نموونە وەکو "هاتنەژوورەوە" و "چوونەدەرەوە" نییە. هاتنەژوورەوە و چوونەدەرەوە لە دوو ساتەوەخت پێك دێن، کە کردارەکەیان تیا ڕوو دەدات. لە لەحزەیەکدا "دێینە ژوورەوە" و لە لەحزەیەکی دیکەشدا "دەچینە دەرەوە"، بەڵام ئەم بەراوردە بۆ "هاتن" و "نەهاتن" مومکین نییە. ڕاستە لە ساتەوەختێکی دیاریکراودا کردەی "هاتن" ڕوو دەدات. بۆ نموونە دەوترێت: دوێنێ براکەم سەعات دوو هات بۆ ماڵمان. کردەکە لە کاتێکی دیاریکرای کتوپڕدا ڕوو دەدات، کەچی ناتوانین بڵێن: دوێنێ براکەم سەعات دوو نەهات بۆ ماڵمان، ئەگەر پێشوەخت چاوەڕوانیی لەئارادا نەبووبێت.

گەمەی شاعیر لە نێوان ئەم دوو ئاستەدا بەرپا بووە. ئەگەر هاتن ئانوساتی خۆی هەبێ، کەواتە نەهاتن بێ ئانوساتە، لە پشتی ئەم سڕینەوەی کاتەدا، بۆشاییەك دروست دەبێت و تەنها بە "چاوەڕوانی" پڕ دەبێتەوە.

بە ڕای من، جوانترین شیعر ئەو دەقەیە باسی شتێك دەکات و شتێکی دیکەمان پێدەڵێ. ئەم گەمەیە بە چاو نابینرێت، بەڵکو درکی پێدەکرێت، لە نێو لۆچەکانی دەق خۆی دەشارێتەوە. لەم ڕووەوە دەتوانین بڵێن شیعری دلاوەر ڕەحیمی بەم ئاڕاستەیە ئیش دەکات. دلاوەر لە ڕێگای ئەم گەمانەوە دەیەوێ تیشکی نوێمان بۆ بقەپێنێ و پێشکەشی خوێنەری شیعری بکات...